ناوی کتێب: هونەری ئەوروپی سەدەکانی ناوەڕاست و ریٚنیسانس
ناوی نووسەر: وەهبی رەسولٚ
بابەت: هونەری شێوەکاری
مۆنتاژ: سەیران عەبدولڕەحمان
هەڵەچن: نیشتمان محەمەد فاضل
تیراژ: ٣٥٠ دانە
ژمارەی سپاردن :١٦٠ی ٢٠٠٢

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (٢٠٠)
www.sardam.net

**بە**

**کەژاڵی خۆشەویست و هاوسەرم**

**پێشکەشە**

**کە وێڕای ئەرك و ماندبوونی،**

**بەشێکی زۆری بەم هەوڵە لە کاتی خۆی لە ژیانی مندا.**

**بە**

**هێمای ئەمەك و وەفاو پێزانین**

**عەدالەت ڕەزا، کامەران ئیبراهیم، شاهۆ عبدالرحمن**

**بەرهەم طیب، ئاشنا عبدالله، ساکار فاروق**

**بەهجەت جەعفەر (مەرگی جوانیی)**

**پێشکەشە**

**کە بە ڕێبوواریی قوتابێتی بە ژیانی مامۆستایی مندا ڕاگوزەر بوون.**

**وەهبی ڕەسوڵ**

**گەلاوێژی ٢٧٠٢**

## سەرەتا :

سەرەتای خواستی بەدیهێنانی سەرچاوەیەکی وەها دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی قوتابێتی لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا، ئەو دەمەی ئاشنای زۆرێك لە سەرچاوە هونەرییە مێژووییەکان بووم، کە هەر جۆرێکیان لە دیدنیگایەك و لە بابەتێکی جیاوازەوە لە ئەزمونی هونەری ئەوروپی دەدوان، هەر لە نواڵەکانی شارستانی گریکەوە تا کۆتایی سایە دورە دەستەکانی مۆدێرنیزم. هەر ئەو ڕۆژانە خولیای بەدیهێنانی سەرچاوەیەك شلوێ کردم کە تەنها گێڕانەوەیەکی چیرۆك ئامێزی ژیانی هونەرمەندەکان و تۆمارکردنی ژمارەی تابلۆو ساڵی ئەنجامدانی پێشانگەو کارە هونەرییەکان نەبێت. بەڵکو پەیجوریەك بێت کارا، دەروازەی تان و پۆی گشت ڕەهەندەکان هێندەی بتوانێت والآکات.

هەڵبەت ئەم هەوڵە بە هەنجەتی ئەرێتی بەخشین نیە بە ئاراستەو بزاڤی هونەری ڕۆژئاوا لە دوتوێ بێئۆرت خەملاندنی هونەر لە ڕۆژهەلآت (بە دوور و نزیکی زەمەنیەوە). بەڵکو ڕووانینە بۆ هونەری ئەوروپی وەك ئەزمونێکی خاوەن ئەرێتی تایبەت بە خۆی و جێ ئاماژە (بە تایبەت ئەو گۆڕانکاریە یەکلاکەرەوانەی سەدەی شانزە "ڕێنیسانسی زێڕین" لە خۆی گرتووە لە میانی ئازادی و بەهاو کەسایەتی بەخشین بە هونەرمەند وەك تاکێکی مرۆڤ، تا دەگاتە بژوانی سەربەخۆیی تابلۆو بۆیەی زەیتی و ڕابوونی ڕۆحانی هونەر لە ساوێری ئاین و ئەفرانی بلیمەتەکان و هاتنەکایەی هەڤۆت و تیۆریەکان وەك گوردێری پراکتیزەکردن و ڕەنگ ڕشتن بۆ ویستگەکانی ڕەخنەو ڕۆچونی ڕۆمەت و بەهەند وەرگرتنی هونەر بەنێو زۆربەی توێژەکانی کۆمەڵدا). لە لایەك و لە لایەکی تر وەك ئاشنابوون بە زێدو سەرەتاگە بەراییەکانی هونەری ئەکادیمی، هونەری ئەکادیمی وەك (پەیرەو، ڤۆناغ، توێژینەوە، ڕێچکە، شێواز). کە تا ئێستا ڕابەستەبوونی کارایە لەسەر ئەکادیمیا و پەیمانگەکانی ئێمە. ئەمە بێ لە سەنگینی پێگەو بینگەی ئیستاتیکی هەردوو هونەری ڕۆمانسك و غووتی (تەنانەت لای هربرت رید) لەسەر پانتاییە بەیارەکانی مۆدێرنیزم.

لەپێناو هەرچی زیاتر کامڵبوونیپێودانگکردنی داڤنشیو پێکانی گشت هەوێڵەکانی ژیانو کەسایەتیو کارکردنی ئەو بلیمەتە، بینگەو لێکدانەوەی فرۆید بە پێویست زانی، تاگشت زانیاریەکان ساتە وەختی یەکتر یەکانگیربن لەزەینی خوێنەردا. چون لێکدانەوەکانی فرۆید

هەڵگری گرنگی و شارەزاییەکی بەرفراوانە سەرباری شیکاریە دەرونیەکەی کەسەرکەتووترین توێژینەوەکان و پراکتیزەکردنی تیۆریەکانی هەژماردەکرێت.

لە پێناو بەرهەڤ بوونی ئەم هەوڵە نکوڵی ناکرێت لە ڕۆڵی ئەزمونی سێ ساڵەم لە میانی وتنەوەی مێژووی هونەری ئەم سەردەمانە (لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان- سلێمانی) و نەبوون و کەموکورتی ئەو سەرچاوانەی بە زوبانی کوردین بۆ زۆرێك لە خوێندکارانمان کە جگە لە زوبانی دایك بە زوبانێکی تر ئاشنایەتییان نییە. هەرچەندە ئەم هەوڵە وەك شەقڵە گشتگیریەکەی و تاوتوێ کردنی وەك سەرچاوەیەك جیاو سەربەخۆیە بەڵام ئەم سیمایەی ڕێگر نییە لە بەردەم بە بەرنامەکردنیدا بۆ ئەکادیمیاو پەیمانگەکان بە هەردوو ئاستی مامۆستاو قوتابی. هەرچۆن دەبوو ڕووبەری ئەم بەرگە بزاڤی مانێریزمی لەخۆبگرتایە بەڵام هۆکاری نەمانی کات و بارودۆخی تایبەت دەرفەت بەخش نەبوو.

بنەمای خواست و نەخشەی سەرەتایی ئەم هەوڵە لێرەدا کۆتا پێ نەدەهات بەڵکو ویستی سەراپاگیری کردنی هونەری ئەورووپی بوو هەر لە بەرەبەیانی شارستانی گریکەوە تا دامێنی مۆدێرنیزم (گەر لە چەند بەرگێکیشدا بووایە) بەڵام باری تایبەتی ژیان و هەلومەرجی خەمخۆری زوو بە چاپ گەیاندنی، جارێکی تر داواکاری ئەو دەرفەتەی بەخشیەوە بە یەزدانی ڕووناکی و جوانی.

**وەهبی ڕەسوڵ**
**٢٠٠٢/٨/٢٧**




نەخشەی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاست

# هونەری ڕۆمانسك
# (١٠٠٠-١١٥٠ز)

هونـەری ڕۆمانسـکی ئـەو هونەرەیـە کـە لـە دوا هونــەری بـێزەنتی ئــەورووپای کاسـۆلیکی سەراپاگیر دەکات، ئەم هونەرە گوزارشتێکە لە تێرکردنی لایەنی هونەری ئایینی کە ئەو لایەنــە بەو گورە بە پێزەوە نەیتوانی لە سەردەمی هونەری بێزەنتیدا ئامادەیی خۆی هەبێت.

زێدی ئەم هونەرە هـەرێمی لۆمبارديـای ئیتاڵییـە، هـەر لەوێشـەوە سـەرچاوەی گـرت بـەرەو ئەورووپا بە گشتی و فەرەنسا و ئیسپانیاو ئەڵمانیا و بەریتانیا بە تایبەتی.

یەکێك لە بەهرەمەندەکانی هونەر بە ناوی گریڤل لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا ئـەم نـاوەی (واتـە نـاوی ڕۆمانسـك)ی بـڕی بەسـەر ئـەم مـاوە هونەرییـەدا. ئەمـەش بـە هەنجـەتی ئـەو کاریگەرییەی هونەری ڕۆمانی لەسـەر ئـەم هونـەرەی بـەجێ هێشـتبوو، لـە بـەکارهێنانی هێڵی کەوانەیی و پایەو دالآنی تایبەت بە هونەری ڕۆمانی کۆن.

کاریگەریی ئەم هونەرە لەسەر ئەورووپای کاسۆلیکی دەق لە کاریگـەری ئـەو زمانانـە دەچـوو کە پێی دەوترا (Romanes) و بەشێك بوو لە زمانی لاتینی کە باڵی بەسەر هەمان ئەو وڵاتانەدا کێشابوو وەك فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و ڕۆمانیا و تا ڕاددەیـەکیش بـەریتانیا، ئـەم نـاوەش کە دابڕا بەسەر ئەم تەرزە هونەرەدا، مێژوونووسەکانی هونەر بەکاریان هێناو بە بـەکارهێنانی جـەختیان لەسـەر کـردەوە تـەنیا لەبـەر جیاکردنـەوەی بـوو (بـە تایبـەت لــە میـانی هونــەری بیناسازی کەنیسەکاندا) لە تەرزی هونەری غووتی کە پاش خۆی ئەورووپای گرتەوەو دامەزرا.

هونـەری ڕۆمانسکی لە کۆتاییەکانی سەدەی دەیـەمدا بـژوا، لـە سـەدەی یـازدەدا زبـر و سـادە بوو، دواتر بە خێرایی پێشکەوت و بە چەندین شێوازی جیـاواز لـە سـەدەی دوازدەدا بڵاوبـۆوە، چون ئەم تەرزە بە پێی هەر وڵاتێك تایبەتمەندی خۆی هەبوو، هەر ئەم گۆڕانکاری و هەوڵانـە بوو کە بیناسازە ڕۆمانسکییەکان دایان، بووە مایەی ئەفراندنی هونەری غووتی لە دواتردا.

هونـەری ڕۆمانسـك لـە سـاڵی (١١٢٠)دا گەیشـتە چڵەپۆپـەی لـە گشـت وڵاتـەکاندا بـە پێـی جیـاوازی شـێواز و بینینیـان بـۆ ئـەم هونـەرە تەنانـەت لـە تـەنیا وڵاتێکدا لــە شـارو هەرێمـە جیاجیاکانیدا چەندان سیمای جیاوازی وەردەگرت و ئەم جیاییە تەنیا بیناسازی نەدەگرتەوە و

بەس، بەڵكو خۆی دەگەیاندە پەیکەرسازی و دیواربەند و ئایکۆنیات و دەستنووسەکان و بە پێی ئەوەش کاریگەری ئاراستەی وڵاتانی دراوسێی لە هەمان ئەو بوارانەدا دەکرد.

وەك پێشتر ئاماژەی پێ درا بواری سەرەکی بۆ ئەم تەرزە هونەرییە بیناسازی کەنیسەکان بوو، کەنیسە گەورەکانیش لەم سەردەمەدا بەشێك و سەر بە دێرەکانی بندیکتین[١] بوون، بە تایبەتیش دێری کلۆنی کە ناوو ناوبانگێکی بێ سنووری هەبوو بە دەوڵەمەندی و کەشخەیی و زیرەکی و وریایی قەشەکانی و ساغی و ڕێکوپێکی ئارەزوویان بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە لە هەموو شارەکانی فەرەنسا خانووبەرە گەلێکی وەها دەبینین کە گەواهی ئەو ڕەخاوەتەن دێرەکانی کلۆنی، تێیدا ژیاون و هەرچۆن ئاماژەیەکە بە ئاستی ڕۆشنبیری قەشەکانی.

دەسەڵاتی ئایینی هێندە کاریگەر بوو کە جیاواز نەبوو لە دەسەڵاتی دنیایی، پاشاو مەلیکەکان لە کەنیسەکاندا بە خەڵکی کۆدەبوونەوە و فەرمانڕەوایی خۆیان بەجێ دەهێنا، هەرچەندە ئەو دوو دەسەڵاتە بە ڕووکەش جیاواز بوون، بەڵام لە ناوەڕۆکدا دەسەڵاتی ئایینی هیچی لە دەسەڵاتی دەوڵەتی کەمتر نەبوو.

ڕاستە گۆڕەپانی سەرەکی بۆ هونەری ئەو سەردەمە هونەری بیناسازی کەنیسەکان بوو، بەڵام هونەری پەیکەرسازی وەك تەواوکەرێك و ڕازێندرەوەیەکی هونەری بیناسازی هەڵدەسووڕا. هەرچۆن بوونی هونەرەکانی تری وەك پیشەسازی عاجی و کانزاگەری و هونەری نیگارکێشان (کە هونەری دیواربەند و دەستنووسەکان بوو) بەدەر نەبوون لە خزمەت کردنی مەبەستە ئایینییەکان، بەڵام بە تەرزێ کاریان تێدا دەکرا جیاواز لە تەرزی مەسیحی پێشتر.

## بیناسازی

### شێوەو پێکهاتەکان:

بە توخمی سەرەکی دادەنرێت لە بیناسازی کەنیسەی ڕۆمانسکیدا، بە شێوەیەکی سادە بنیات دەنرا لە چاو ئەو ڕێگەیەی لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا پەیڕەو دەکرا، چون ئەم شتێك لە نەرمی تێدا بەدی دەکرا، بە بەردی پێکەوە پەیوەست کراو بونیات دەنرا کە ئەو پەیوەستەی نێوانیان پتەو و ئەستوور بووە، پایەکانیشی چوار لایەو بە کۆڵەکە دەورە دراوە یاخود هەندێ شان کە شێوە کۆڵەکەیەك لە سەری ڕادەگیرا، ئەم جۆرە چارەسەرە زیاد و لاوەکییانەش لە پێناو ئەوەدا بوو ئەو قورساییەی لەسەر پایەکانە دابەش ببێت.

زۆرترینی ئەم پایانەی کە بەکاردەهات لە بیناسازی ڕۆمانسکیدا ئەوانە بوون کە لەسەر شێوەی خاچی گریکی[٢] بوون.

## کۆڵەکە:

کۆڵەکەی بیناسازی ڕۆمانسکی خاوەنی تـاجی جۆراوجـۆرە کـە هەمـە شـێوەن، سادەترینیان تاجێکـە لەسـەر شـێوەی سـەبەتە لـە شـەش پاڵوویـەك پێکهاتووە و گۆشـەکانی لای خـوارەوەی شێوەیەکی لاریان هەیە. تاجی کۆرنثی کلاسـیکی و تـاجی بـێزەنتی سروشـی چـەندان شـێوەیان دەدا لە نێوان لاسایيەکی پـەیت و گۆڕانکـاری و داهێنـاندا کـە تێیـدا شـێوەکانی گـەڵای ڕووەکـی (ئاکانت) هاوئاهـەنگ بـوو لەگـەڵ هـەندێ شـێوەی گیـانداری بچـووك لـە نێوەنديـدا. هـەرچۆن هونەرمەندان لەم سەردەمەدا ئارەزوويەکی زۆری پەیکەرتاشینی هەندێ گیانداریـان دەکـرد بـە شێوەیەکی سادە کراوە لەسەر تاجی کۆڵەکەکان بە تایبەت لە ڕوويەکی بەرامبەرەوە دروسـتیان دەکـردن. ئـەم بابەتانـەش لەسـەر قومـاش یـاخود ئـەو سـندووقانەوە وەردەگـیران کـە لــە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتییەوە مابۆوە یاخود لە وڵاتی فارسەوە دەهێنرا.

هـەندێ لـە هونەرمـەندانیش تـاجی مێژووییـان بـەکاردەهێنا بـە پەیکـەری ڕیلیـف دەیـان نەخشاند کە هەندێ بابەتی مێژوويی و ئەفسانەیی دەنواند.

## تاوەر:

تاوەر بە شـێوەیەکی سـەرەکی و لـە سـەرەتادا لەسـەر خـاڵی یـەکگرتنی یـاخود لـە یـەکدانی دووباڵی خاچی نەخشەی کەنیسەکان بنیات دەنرا، دواتر تاوەرەکان زۆرتـر بـوون و هـەندێکیان لەسەر دەروازەکانی ڕووی کەنیسەکانیشدا بنیات دەنران. زۆری تاوەر بە تایبەتی لە قوتابخانەی ڕووباری ڕاین-دا بەدی دەکـەین کـە لـە کـاتیدراڵی تۆرنیـە یـاخود تۆرنـای نزیکـەی پێنـج تـاوەر دەبینین، هەرچۆن زۆربەی کەنیسە گەورەکان لە دوو تاوەر کەمتری تێدا نییە. ئەم تاوەرانـەش دەکرێنە دوو جۆر:جۆری یەکەم پێی دەوترێت (Tours- Ianterne) کە لـە بنەچـەدا فەرەنسـییە و بە تایبەت لە قوتابخانەکانی ڕوون و هەرێمی نۆرماندی و لانجدۆك بڵاوە.

جۆری دووەمیش تاوەرێکە زەنگۆڵەی پێوەیە پێی دەوترێت (Clocher)، ئەم جۆرە تاوەرانـە هەمیشە لە نێوانی گومەزی کەنیسەکە و قوربانگەکە دادەنرێت، لەتی چوارگۆشە یاخود هەشت گۆشەیە جاری زۆر دەگمەنیش هەیە کە خڕە.

ئەمانـە بـە شـێوەیەکی سـەرەکی پێکهاتـەو شـێوەی بیناسـازی ڕۆمانسـکی بـوون، سـەرباری بەکارهێنانی هاوبەشی وڵاتانی کاسۆلیکی بۆ ئـەم پێکهاتانـە لـە کەنیسـەکانیاندا، بـەڵام تێبینـی ئـەوە دەکـەین مامەڵەی هـەر یـەکێکیان بەرامبـەر بـەم پێکهاتانـە یـەکانگیرە لەگـەڵ چـەند ڕێسایەکی ناوخۆی جیاجیا بەخۆیان.

کەنیسەی ڕۆمانسکی بە شێوەیەکی گشتی وەها دەناسرێت کە خاوەن بنیاتنانێکی بەهێز و پتەوە، ئەمەش خۆی لە حۆیدا کاریگەریی پیاوانی ئایینی دەردەخات لەسەر هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمە، تا لە ڕێی پتەوی و بەهێزی شکۆمەندی ئەم بینایانەوە لە پتەوی و خۆڕاگری بیروباوەڕی مەسیحی گوزارشت بکەن، کە سەرکەوتن و دەسەڵاتی ئەم بیروباوەڕە سەراپای وڵاتانی ئەوروپای تازە بە تازە گرتبۆوە.

ئەگەر لە پێکهاتەکانی بیناسازی کەنیسەی ڕۆمانسکی بترازێین و بچینە سەر نەخشە و هێڵکاری سەرەکی کەنیسەی ڕۆمانسکی، ئەوا ئەم هێڵکارییە پشت بەستە بە دیزاینێك لەسەر شێوەی خاچ(٢)، کە باڵە درێژەکەی تێیدا بە نوێژگەیەکی نیوە بازنەیی کۆتایی دێت، هەمیشە خاڵی لێکدانی دووباڵی خاچەکەش بە تاوەرێکی باڵابەرز دەکرێتەوە.

ڕووی کەنیسەی ڕۆمانسکی بە ژمارەیەك دالانی کەوانەیی دەڕازێنرێتەوە و دەنەخشێنرێت کە لە ناوەڕاستیاندا دالانێکی چوونە ژوورەوەی گەورەی تێدایە بە پێوانە لەوانی تر گەورەترە. ئەم هاتنە ژوورگەیە دەمانخاتە سەر دالانێکی سەرەکی کە بە هەردوو دیویدا پایە و دالانی ئەستوور هەیە، ئەم کۆڵەکە و پایە ئەستوورانە قورسایی لەسەر دالانە لاوەکییەکان کەم دەکەنەوە کە بە تەنیشتی دالانە سەرەکییەکەدا لە هەردوولاوە درێژبوونەتەوە، بەڵام لە دالانە سەرەکییەکە لە بنمیچدا نزمترن.

پایەو کۆڵەکە کەوانەییەکان لەنێو دالانە سەرەکییەکەدا هەتا بنمیچ هەڵکشاون هەر لە هاتنە ژوورگەکەوە تا نوێژگەکە، ئەم دووبارە بوونەوە ڕێکە کاریگەرییەکی دەروونی لەسەر ئەو کەسانە دادەنێت کە دەچنە ژوورەوە، بارستایی ئەو بنمیچە کەوانەییانە دەکەوێتە سەر پایەو کۆڵەکەی لاتەنیشتەکان، لەبەر ئەستووری دیواری دەرەوەی بیناکان دەروازە و پەنجەرەی زۆری تێدا نییە، ئەمەش بووەتە هۆی کەمی ڕووناکی لە کەنیسەی ڕۆمانسکیدا.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، تەرزی هونەری ڕۆمانسك تەرزێکی ئیتاڵییە، بەڵام لە وڵاتە جیاجیاکانی ئەوروپا تێکەڵی شێوازی جیاجیای ناوخۆیی بوو، یەکێ لەو وڵاتانەش فەرەنسا بوو کە چەندان تەرزی ناوخۆیی جیاوازی بۆ ئەم هونەرە تێدا بەرهەم هات.

## بیناسازی ڕۆمانسکی لە فەرەنسادا

### کەنیسەی سان سرنان لە شاری تۆلۆز:

ئەم کەنیسەیە لە کۆتاییەکانی سەدەی یازدەدا لە نێوان ساڵانی (١٠٨٠-١٠٩٦) بنیات نراوە، دیزاینی گشتی لەسەر شێوەی خاچی لاتینییە، حەوشەی کەنیسەکە (مەبەست پانتایی ناوەوەی کەنیسەکەیە) لە دوازدە بەش پێکهاتووە لە هەردوو لای حەوشە سەرەکییەکەوە دوو داڵانی یەکانگیر هەیە، کە سەقفەکانیان لارە، هەرچۆن قوربانگەی کەنیسەکە کەمێ بەلای سەرووداڕدرێژ دەبێتەوە.

ئەم کەنیسەیە بە جوانترین کەنیسەکانی فەرەنسا لە تەرزی ڕۆمانسکدا دادەنرێت. درێژییەکەی سەد و پازدە مەترو پانییەکەی سی و دوو مەترەیە، ئەو پانتاییەی ناوەڕاستی کەنیسەکەی بە سەقفێکی کەوانەیی داپۆشراوە (واتە سەری گیراوە) لەسەر تەنیشتەکانیشی بەرهەیوانی سەر بە گومەزی نیو بازنەیی هەیە کە بووەتە یارمەتی دەر لە هەڵگرتنی سەقفە گەورە سەرەکییەکەدا. مێژووی بنیاتنانی تاوەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی غووتی کە لەسەر خاڵی یەکتر بڕینی هەردوو باڵی خاچەکە دروست کراوە، هەشت لایە لە شێوەیداو تیرێك بە سەرەکەوەیەتی.

### کەنیسەی سان فرۆن لە پریجو:

ئەم کەنیسەیە ساڵی (١٠٢٠) دروست کراوە، دیزاینی سەرەکی لە شێوەی خاچی گریکی دایە، بە تاقە نموونە دادەنرێت لە بیناسازی مەسیحیدا لە ڕۆژئاوای ئەورووپا کە لەسەر ئەم تەرزە دروست کرابێت. کاریگەری دیزاینی کەنیسەی (سان مارك)ی ڤینیسیای ئیتاڵی لە سەرە، سەری کەنیسەکە بە گومەزی شێوە تۆپی گیراوە یاخود داپۆشراوە کە تۆزێك درێژکۆلەن لەسەری تۆپەکەیاندا ئەمەش دیاردەیەکە کەوتنە ژێر کاریگەریی هونەری بێزەنتی دەنوێنێت، بە هۆی ئەو هێڵە بازرگانییە توند و تۆڵەی نێوان خوارووی فەرەنسا لەگەڵ شارەکانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت قوستەنتەنیە.

### کاتیدراڵی ئەنجولیم:

دیزاینی ئەم کەنیسەیە کە لە ساڵی (١٠٨٠)دا دەست کراوە بە بنیاتنانی لەسەر شێوەی خاچی لاتینییە، تەنیشتەکانی بۆ نەکراوەو یاخود بێ تەنیشتە، بەڵام (ترانسپت)[٤]ی هەیە و چوار هەیکەلی ئەم لاولا کە بە گومەز دابەش کراوە، نێوەندیان جووتەیە لەسەر شان هەڵگیراوە، کەنیسەکە شازدە دەروازەی تێدایە.

## کەنیسەی نۆتردام لە شاری پواتیە:

ئەم کەنیسەیە لە سەدەی یازدەدا دروست کراوە، ڕوویەکی سەیر و ڕێك و جوانی هەیە. هەرچۆن گومەزێکی قوچەکی شێوەی هەیە لەسەر یەکتر بڕینی نێوان ترانسێپت و حەوشی کەنیسەکە ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە بیناکە سەری گیراوە بە گومەزی کەوانەیی. لە سەرووی فەرەنسا لە شاری کان دوو نموونە لە جوانترین کەنیسەکانی ڕۆمانسکی فەرەنسی هەیە کە بە تەرزەکەیان دەوترێت تەرزی ڕۆمانسکی نۆرمەندی، ئەو دووانەش:

## کەنیسەی دێری پیاوان

ساڵی (١٠٦٦) (ولیەم)ی فاتح دەستی کردووە بە بنیاتنانی، هەرچۆن ناوزەد دەکرێت بە کەنیسەی سان ئاستفان ئایتن، لەسەر تەرزی بازیلیکی(*) بنیات نراوە، یەکێکە لە کەنیسەکانی هەرێمی نۆرماندیا کە خاوەنی چەندان کەنیسەی جوانە، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر مەزنی و زەنگینی ئەم هەرێمە هونەرییە لەژێر دەسەڵاتی دیوکی نۆرمەندیدا.

گومەزێکی کەوانەیی ئەم کەنیسەیەی داپۆشیوە، لە ڕووی خۆرئاوایەوە دوو تاوەری شێوە چوارگۆشە لەسەر هەردوو لاکەیەتی، تیری هەشت لا ئاراستەی کردوون، بە ڕوونترین نموونە لە بەکارهێنانی تیردا لە هونەری بیناسازیدا دادەنرێت، چون لە نۆ تیر کەمتر لەخۆ ناگرێ کەوا دەکات هەست بە ئاراستەی ستوونی بکرێت کە ئاراستەیەکی تایبەتە لە هونەری بیناسازی ڕۆمانسکدا.

## کەنیسەی دێری ژنان:

ئەمیش هەر لە شاری کان دروست کراوە، نازناوی کەنیسەی سێ لانەشی هەیە، ساڵی (١٠٦٢) خاتو (ماتێڵدا) ژنی (ولیەم)ی فاتح دروستی کردووە. ڕووی خۆرئاوای خاوەن تایبەتمەندێتییەکی ناوازەیەو دوو تاوەری لەخۆ گرتووە کە شێوە چوارگۆشەن، چەند نهۆمێکی خاوەن تاقی کەوانەی تێدایە. دیوارەکانی ئەستوورن و دیواری پاڵپشتی کەمێ دەرپەڕیو یارمەتی دەریەتی، تاوەرێکی شێوە چوارگۆشە بە ئاسماندا چووە لە خاڵی لێکدانی حەوشی کەنیسەکە و ترانسێپت-دا.

## بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئیتاڵیادا

بە بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئیتاڵیا دەوترا بیناسازی لۆمباردی، ئەمەش زیاتر بە بۆنەی ئەوەوە بوو سەرەتا ئەم جۆرە بیناسازییە لە هەرێمی لۆمباردیاوە سەرچاوەی گرت، بە شێوەیەکی تایبەت ئەم هەرێمە لە بیناسازییاندا لەژێر کاریگەریی قوتابخانەی ڕووباری ڕاین دا بوو لەگەڵ هەندێ کاریگەریی هونەری بێزەنتی، دیزاینی سەرەکی ئەم بینایانە زۆربەی کات لەسەر تەرزی بازیلیکی بوو.

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی لە جۆرەکانی یاخود شێوازەکانی بیناسازی کەنیسەی ڕۆمانسکی لە ئیتاڵیادا بدوێین، دەکرێن بە سێ شێوازەوە:

١-شێوازی لۆمباردی لە سەرووی ئیتاڵیا لە میلانۆ.

٢-شێوازی تۆسکانی لە نێوەندی ئیتاڵیا.

٣-شێوازی سقلّی لە خواروی ئیتاڵیا.

بەدەر لە شێوازەکان و لە خودی کەنیسەکان ئیتاڵییەکان تایبەتمەنێتییەکیان لە دروست کردنی بینایەکی تایبەت بە شۆردنگە واتە (تەعمید) هێنابوو. کە ئەمەش بینایەکی سەربەخۆیە لە بەردەم کەنیسەدا دروست دەکرێت. زۆربەی جار لەسەر شێوەی هەشت لایە یاخود کەوانەیی دەبێت، هەمیشە بەناوی یوحەنانای مەعمەدانەوە ناوزەد دەکرێت. ئەگەر لە شۆردنگە بترازێین لە تاوەر دەدوێین کە بە پێچەوانەی پەیڕەوی فەرەنسا و بەریتانیاو ئەڵمانیا مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، هەمیشە تاك و تەنیا دروست کراوە و هەندێ جاریش لە ڕێگەی دێرێکی بچووکەوە پەیوەست بە کەنیسە دەبۆوە، شێوەی ئاسایی ئەم تاوەرانە چوارگۆشەو خاوەن دیزاینێکی سادە بووە.

کۆمەڵەی بینای شاری بیزا بێگومان لە بەناوبانگترین کۆمەڵە بینای ڕۆمانسکییە لە ئیتاڵیا کە پێك هاتووە لە کاتیدراڵ و شۆردنگەو تاوەر و مەرقەد.

پێش ئەوەی بچینە سەر خودی هەر کامێك لەو بینایانە وەك تێبینییەکی خێرا دەبێت ئاماژە بەدەرکەوتنی ناوی هونەرمەند یاخود دیزاینەکان بکەین لە ئیتاڵیادا کە ئەمە بەو شێوەیە لە وڵاتانی تردا بەدەرناکەوێت.

### کاتیدراڵی بیزا:

ساڵی (١٠٦٣) دروست کراوە، لە جوانترین کەنیسەکانی ئەم سەردەمەیە، وەك هەموو کەنیسەکانی تر لە دیزاینی گشتیدا، کۆڵەکەی پەیوەستی بە تاقی کەوانەیی تێدایە کە

داڵانەکان پێک دەهێنێت. پانتایی ناوەڕاستی سەری گیراوە بە بنمیچێکی تەختەیی ئاسایی لاتەنیشتی دووانەیی هەیە. ڕووەکەی بە چوارچێوەیەکی مەرمەڕی سوور و سپی ڕووپۆش کراوە. بەهای ئەم کەنیسەیە وەك ئاسەوارێکی هونەریی بە تایبەت لە ڕێژە گشتییەکەیداو لە بۆشناخی و نەخشە هەڵکەنراوەکانییەتی.

## تاوەری بیزا:

کە ئێستا پێی دەوترێت بورجی بیزای لار ساڵی (١١٧٤) دروست کراوە. شێوە کەوانەییەو هەشت نهۆمە، لە هەموو نهۆمەکاندا بە تاق دەوردراوە، ئەم تاوەرە لارە لە جیهاندا ناسراوە و بە سەیرترین پێکهاتەی ئەم کۆمەڵە بیناجوانە دادەنرێت، لارێتییەکەی گفتوگۆ و دەمەتەقێی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام ئێستا دەرکەوتووە ئەم لارییە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەیەك لە بنەواچەدا، بەشە بەرزەکەی ئەم تاوەرە کە بەرزییەکەی دەگاتە (٥٥) مەتر لە بەشە نزمەکەی چوار مەتر و نیو بەرزترە، هەر ئەمەشە وای لێ کردووە بێ هاوسەنگییەك بە ڕووکەشی دەرەوەیدا دیاربێت.

## بینای شۆردنگەکە:

ساڵی (١١٥٣) بەردی بناغەی بۆ دانراوە، ئەم بینایە بە پێی دیزاینی بیناساز (دیۆتۆسالڤی) نەخشەی بۆ کێشراوە کە دیزاینێکی کەوانەیی هەیە. حەوشی یاخود پانتایی ناوەوەی تیرەکەی (٢٠) مەتر دەبێت، ئەم پانتاییەی ناوەوەی چوار شان و هەشت کۆڵەکە لە بەشی دەرەکی جیادەکاتەوە، بەشە دەرەکییەکەی تیرەکەی (٤٠) مەتر دەبێت و لە دوو نهۆم پێکهاتووە، نهۆمی زەمینیەکەی لە دەرەوە بە چەندین کۆڵەکەی پابەند بە یەکترەوە بە تاقی نیوە بازنەیی ڕازێنراوەتەوە.

هەروەها لەو کەنیسە شەنگانەی لە نێوەندی ئیتاڵیادا بەرچاومان دەکەوێت کەنیسەی سان منیاتۆیە لە شاری فلۆرەنسا، لە دەرەوە و ناوەوەیدا چێوەی مەرمەڕی ڕەنگاوڕەنگ بەکارهاتووە، ئەم ڕێگایە لە بەکارهێنانی مەرمەڕ تا سەردەمی غووتی بەردەوام بوو.

هەرچی شاری ڕۆماشە لە دوو دێر بەولاوە نموونەی ڕۆمانسکی تێدا بەدی ناکرێ، ئەوانیش دێری سان جیوڤانی لە لاتێرانۆ و دێری سان پاولۆیە لە دەرەوەی شورای شارەکە.

لە ئیتاڵیای سەرووش لە شاری ڤیرۆنا چاومان بە نموونەیەکی جوانی بیناسازی ڕۆمانسکی دەکەوێت بە ناوی (سان زینۆ ماچیۆری) کە ساڵی (١١٣٨) بنیات نراوە، ڕوویەکی ساکاری شەنگی هەیە، تاوەری ئەم کەنیسەیە جیایە لە بینا سەرەکییەکە هەروەك پەیڕەوکراوە لە ئیتاڵیا.

## بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئیسپانیادا

لە بەشی ژووروو خۆرئاوای نەبێت ئاسەواری ڕۆمانسکی لـە ئیسـپانیادا نییـە، ئەمـەش ئـەو هەرێمانە بوون کە پێش سەدەی سێزدە مەسیحی بوون، بیناکان لەژێر کاریگـەری ڕاسـتەوخۆی فەرەنسـیدان، بـە تایبـەت هـەرێمی لانجـدۆك و گەسـكۆنیا، چـون قەشـەكانی دێـری کلۆنـی کاریگەریی قووڵیان لەسەر ئیسپانیای مەسیحی هەردوو سەدەی یازدە و دوازدە هەبوو، تەنانەت وای لێ کردبـوون قەشـە ئیسـپانیەکان فەرەنسـی بـەکاربێنن لـە نووسـینیاندا. لـە نێـوان ئـەو کەنیسانەدا کەنیسەی (سان ئایزیدۆر)ە لە شاری لیۆن ساڵی (١٠٦٣). زۆرێك لە بەشەكانی لەسەر کەنیسەی (سان بنـوا)ی فەرەنسـی دروسـت کـراوە. نموونـەی تـریش زۆرن، بـەڵام لـە جوانـترین ئەفرێنـراوەکانی مێژووی ئەو دەمەی ئیسپانیا کەنیسەی (سـان جـاك دی کومبوسـتیل)ە کـە بـە لووتکەی هونەری ڕۆمانسـکی دەژمـێردرێت. لـە نێـوان سـاڵانی (١٠٧٨-١١٢٨)دا کـاری تێـدا کـراوە. ڕووە سەرەکییەکەی ئەندازیار ماثیو نەخشەی کێشاوە و هەر خۆیشی ئەو چوونـە ژوورگەیـەی کە بەناوبانگە بـە "دەروازەی سـەروەری" سـاڵی (١١٨٨) بنیـات نـاوە. دیزاینـە گشتییەکەشـی بـە هەموو بەشەکانییەوە لە کەنیسەی (سان سرنان)ی تۆلۆزی وەرگیراوە.

## بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئینگلتەرادا

بە بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئینگلتـەرا دەوتـرا بیناسـازی (ئـەنجلۆ نۆرمـاندی)، ئـەم بینایانـە لەوێ گەورە و شكۆمەندە، بەڵام دروسـت کـراون وەك بیناکـانی هـەرێمی نۆرمانـدیا، بـۆ یەکـەم جار (ئەدواردی کۆنفیسۆر) ئەم تەرزەی گواستەوە بەریتانیا دوای ئەو ولیەم فاتح. لە نموونەی بیناسـازی ڕۆمانسـك لـە لـەندەن کەنیسـەی بورجـی لەندەنـە، نموونـە لـەم وڵاتـەدا زۆرن، لـە دیاریـترینیان کاتیدراڵی (دورهام)ە ساڵی (١٠٩٣) دروست کـراوە، بـە هـەمان ڕێسای لـەوەو پێشی ڕۆمانسکییە لە حەوش و ترانسپت-دا، بەڵام تەنیشتی تاکی هەیـەو بورجـی سـەر یـەکتر بڕینـی قوڵەکان لە سەردەمی غووتیدا کراوە.

## بیناسازی ڕۆمانسکی لە ئەڵمانیادا

لـە دوای مردنـی شـارلمان سـاڵی (٨١٤) دابـەش کردنـی ئیمپراتۆریەتەکـەی لـە نێوەنـدی ئەورووپادا، ئیمپراتۆریەتێك دروست بوو کە بـە (ڕۆمـانی جێرمـەنی) نـاوزەد دەکـرا. ئـەڵمانیای ئـەمڕۆ و بـەلجیکا و هۆڵنـدە و سـەرووی ئیتاڵیـای دەگرتـەوە، لـە دیـارترین سـەرکردەکانیان

(ئاتۆ)ی مەزن بوو کە لەسەر دەستی ئەودا ساڵی (٩١٦) لە شاری ڕۆما ئیمپراتۆریەتەکەی گەشەی سەند و بەهاو گرنگییەکی تایبەتی دا بە هونەری ڕۆمانسکی لە ئەڵمانیادا. بیناسازی ڕۆمانسکی کە بە شێوەیەکی تایبەت لە هەردوو هەرێمی (ڕاین و ساکسۆنیا) بەرەوی سەند لە دیزایندا خاوەنی دوو هەیکەلی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی بوو، ئەوی بەشی خۆرئاوای هەروا دەزانرێت کە لە شۆڕدنگەی کەنیسەوە بەهەرەی وەرگیرابێت کە پێشتر لەو لایەوە بەجیا لە کەنیسەکە دروست دەکرا.

لە نموونەی جوانی کەنیسەی ڕۆمانسکی ئەڵمانی، کەنیسەی پەیامبەرانە لە شاری کۆڵۆنیا لە ساڵانی (١٠٣٥-١٢٢٠) کاری تێدا کراوە، سێ هەیکەلی بەناویەکداچووی لەخۆگرتووە لە بەشی خۆرهەڵاتییەوە و دەروازەی لە ڕووی سەرووەوە، ڕووی خۆرئاوای دەرگای تێدا نییە وەك تەرزی فەرەنسی، بەڵکو تەنیا دوو تاوەری لەخۆ گرتووە. کاتیدراڵی ڤۆرمس کە ساڵی (١١١٠) دروست کراوە لە کەنیسە دیارەکانی تری ئەڵمانیایەو بە هەمان ڕێسای باوی ئەوێ بونیات نراوە، هەر هێندە هەیە لە تەنیشت هەردوو هەیکەلەکەیدا دوو بورجی کەوانەیی هەیە، لە پێکگەیشتنی حەوش و ترانسپت-دا بورجێکی هەشت لا هەڵچووە.

## پەیکەرسازی

ئەو شکست و لاوازییەی تووشی هونەری پەیکەرسازی هات، لە سەرەتای ئەم سەردەمەدا بە تایبەتی پێشینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هونەری بێزەنتی، ئەو دەمەی خێزانی (ئیزۆری)(**)یەکان "لە بەشی یەکەمی ئەو سەردەمەدا کە فەرمانڕەواییان کردووە" لە ساڵی (٧١٧)ی زاینیدا هاتنە سەر تەخت بە پێشەوایەتی سەرکردەیەکی جەنگی بە توانا کە ناوی (لیو) بوو، لە ساڵی (٧٢٦)دا بڕیاری قەدەغەکردنی وێنەی ئایینی دەرکرد و شکاندنی هەر وێنەیەکیش کە هەیە.

ئەو بڕیارەی ئەو سەردەمە دەرکرا لە ترسی بەرگرتن لە خەڵکی بۆ نەگەڕانەوەیان بەرەو پەرستن و بە پیرۆز ڕاگرتنی خودی وێنە ئایینی و پەیکەرە بچووکە ئایینییەکان (ئایکۆنیات) نەك گرنگی دانیان بە لایەنی ڕۆحانی ئەم وێنانە.

کاریگەریی ئەو سەردەمە تا سەرەتاکانی سەردەمی ڕۆمانسکی بە تایبەتی و سەراپای سەردەمی ڕۆمانسکی بە گشتی پەل دەهاوێژێت، هەر بۆیە دەبینین هونەری پەیکەرسازی ئەم سەردەمە لە هونەرەکانی بیناسازی و نیگارکێشان (مۆزائیك، فسیفساء، دەستنووسەکان و تەنانەت هەندێ نیگاری بچووکی زەیتی دەگرێتەوە) دواکەوت لە ڕازاندنەوەی و بەکارهێنانی لەنێو کەنیسەکاندا و مۆڵەتی دەرنگتر بۆ هەڵکەوت تا بوونی خۆی و کاریگەریی و بەهای خۆی

بسەلمێنێت، بۆیە دەبینین ئاسەواری پەیکەرسازی لە چاو ئەو هونەرانەی پێشتر ئاماژەمان پێدا لە جێی نەبوونە هەر لە سەردەمەکانی پێش ئەم سەردەمەشەوە لە جیهانی مەسیحییەتدا.

کزبوون و بەرەو لەناوچوونی پەیکەرسازی لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپای خۆرئاوادا دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار، هۆکاری یەکەم جێنشین بوونی گەلانی سەرووی ئەورووپای خۆرئاوایە کە لەژێر قەڵەمڕەوی شارستانیەتی ڕۆمادا بوون، ئەم گەلانەش نەزان و بێئاگا بوون لە هونەرەکانی بیناسازی و پەیکەرسازی، ڤینیان لەوە دەبۆوە خودا لە شێوەی پەیکەردا بنوێنرێت.

هۆکاری دووەمیش ئەو هەست کردنەی ئەکلیرۆسی مەسیحی بوو لە بارەی هونەرێك کە ماوەیەکی درێژ تەنیاو تەنیا لە خزمەتی ئایینە نائاسمانییەکاندا بووە، لەم ڕووەشەوە سەرکەوتنێکی باشیان بەدەست هێنا.

ئەگەر لە فەرەنسا بدوێین ئەوا سەرەتای دەرکەوتنی ئەم هونەرە لەوێ دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی دەیەم، ئاسەوارەکانی لە شێوەیەکدا دەرکەوت کە لەمانادا قووڵ بوون و لە کارگە سەرەتاییەکاندا هەوڵ و تەقەللایەکی درێژ درا تا کۆتایی هات بە گوزارشت کردن لەو بیرۆکانەی سروشی ئاسەوارێکی گرنگی گەورەیان دەدا.

لە سەدەکانی نێوەندا هونەرمەندەکان ڕێنومایییان لە قەشەکان وەردەگرت بۆ وەرگرتن و دانانی بابەتە هونەرییەکانیان لە کتێبە پیرۆزەکان و بەسەرهاتی پیرۆزمەندەکان.

ئەرکی پەیکەرساز گوزارشت کردن بوو لە ڕێی بەردەوە لەوەی پیاوێکی ئایینی وەك ڕێسایەکی ئایینی کار بۆ بڵاوکردنەوە دەکات، ئەم ئەرکەی خۆی دەبوایە لە ڕێی وێنەو شێوەوە وەربگێڕایە کە پەیوەستییەکی توند و تۆڵی بە بیناسازییەوە هەبوو یەکانگیر بوو لەگەڵیدا. ئەو هونەرمەندانە نە پیاوی ئایینی بوون نە زانای ئەو بوارە، بەڵکو بۆ زمانێك دەگەڕان تا لە ڕێیەوە لەم بیروباوەڕە نوێیە گوزارشت بکەن، هەڵبەتە دەبوو ئەمەش زۆر بە پتەوی بونیات بنێن، بۆ ئەم مەبەستە وردە وردە دەستیان کردە خۆ بەستنەوە بە سروشت و ژیانەوە، ئەمەش هەروا لە ساناو لە زوویی بەرەنجام نەهات و کاری یەك دوو ڕۆژێ نەبوو، هەرچەندە هەوڵەکانی سەرەتا ئاڵۆز و قورس بوون، بەڵام بە شێوەیەکی هەست پێکراو دەرکەوت ئەم هونەرەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەوە ئامانجیەتی هاوڕێکی بکات لە نێوانی نەخشسازی مێژوویی و شێوەکانی بیناسازیدا، سەرەتاکانی خۆی زیندوێتییەکی بێ هاوتای لە خۆیدا هەڵگرتووە کە دواتر پەرەسەندنێکی پڕ لە بەهای بەخۆوە دی.

بەمەش شتێکی نوێ لە هونەری پەیکەرسازی مەسیحیدا سەرەتا گەلێکی وەرگرت کە بە ڕێبازێکی هونەریی نوێ دانانرێت یاخود ناتوانین بڵێین ڕێبازێکە نوێ، بەڵکو هونەرمەندەکان دەستیان کردە زیندووکردنەوە و نوێکردنەوەی هونەرە ون بووەکان، لەژێر کاریگەریی ئەم بارەدا چەندان فێرگەو پیشەگە بەدەرکەوتن کە هەریەکێکیان خاوەن کۆمەڵێ نموونە بوون. ئەم نموونانە کە کاریان لەسەر دەکراو بە شێوەی جیاواز نوێ دەکرانەوە لەبن دەستی پیاوانی ئایینییەوە دەخرانە ڕوو، هەر ئەوانیش دەستنیشانی پەیڕەو و پرۆگرامی کارکردنەکانیان دەکرد بۆ بەدی هێنانی بەرنامەیەکی بەرجەستەیی ئایکۆنۆگرافی پشت بەو گەنجینە هونەرییە دێرینانەی لە دێرەکاندا هەبوون. ئەم گەنجینانە کە موڵکی کەنیسەکان بوون گەلێ جۆری هونەری لەخۆ گرتبوو وەك دەستنووسەکان، بەرهەمی چنراو، کاری سەر عاج و چەندان پارچەی پەیکەری ڕۆمانی. هەر ئەم سوود لێوەرگرتنە هونەرییە جیاجیایە بووە مایەی جیاوازی لە شێوازی کارکردنی هونەری ئەو سەردەمەدا، هەر قوتابخانە و فێرگەیەك بە پێی ئەو نموونانەی لەبەردەستیاندا بوو، مامەڵە و ئەنجام دانی هونەریان دەکرد، ئەمەش وای کرد بەرەنجامەکان لە یەکتر نەچن و لێك جیاواز بن هەر لە شێوازی بینینی گشتییەوە تا جۆری مامەڵەوبەرجەستەکردنی تایبەتی جل و بەرگ و زوڵف و لەشی مرۆڤ و تا دەگاتە بەرجەستەکردن و نەکردنی سیماو حاڵەتە دەروونییەکان.

ئەم جۆراوجۆری مامەڵەکردنە بووە هۆی پەیدابوونی چەندان شێوازی کارکردن لەم بوارەدا، پێگەیشتن و پەرەسەندنیان لە سەدەی دوازدەیەمدا، ئەمەش بەرەنجامی سوودوەرگرتن بوو لەو نموونە سەرەتاییانە. بێگومان لەگەڵ ئەم پێکهاتن و کامڵ بوونە هونەرییەدا هاوکات هونەری بیناسازی لە گەشەسەندندا بوو، هەرچۆن دەست و پەنجەی پەیکەرسازەکانیش کارامەیی و پێشکەوتنی بەخۆوە دەدی، وا دەخوازرا هونەری پەیکەرسازی هاوشانی ئەو چوونە پێشەوەیەی بیناسازی بێت و بەشداربێت لە بنیاتنانی کەنیسە و دێرو کاتیدراڵەکاندا. بۆ ئەم مەبەستەش دەبوایە گۆڕانکاری لە پێوانەی بەرجەستە کردنەکەدا بکرایە، ئەمەش وای کرد پەیکەری گەورەو مەزن دروست بکرێت تا هاوشان بێت لەگەڵ دیوار و پایەو کۆڵەکە و تاقی کەنیسەکان تا لەم ڕێگەیەوە هونەری پەیکەرسازی بگاتەوە بە هونەری بیناسازیدا.

هەڵبەتە ئەم خواستە نوێیە ماددەی کارکردنەکانیشی گۆڕی. هونەرمەندەکان هیچ گرنگییەکیان نەدا بە تەواوی ڕێژەیی لەشی فیگەرەکان و ڕێسا سروشتییەکان و پابەندبوون بە توێکاری (التشريح) لەشی مرۆڤەکان، بەڵکو تەنیا مەبەستیان ئەوەبوو لەشی مرۆڤ وا لێ بکەن گونجاو بێت لەگەڵ دیزاینە نەخشسازییە بیناسازییەکاندا، ئەگەر حاڵەتەکە وەها داوا بکات

ڕێژەی لەشەکە بشێوێنن. ئەمەش لەگەڵ لێکدانەوەیەکی تردا جیاوازە و یەك ناگرێتەوە کە ئەو لێکدانەوەیە بەرجەستە کردنی لایەنە رۆحانیەکە دەکاتە پاڵنەرێك بۆ ئەم دەست تێوەردانە فۆرمییە (ئەگەر بتوانین وەها بڵێین) ئەگەر لە ڕوانگەی دووەمەوە بڕوانین ئەوا دەبینین هونەری پەیکەرسازی ڕۆمانسکی خاوەنی چەند سیماو جیاکەرەوەیەکی خۆیەتی ئەوانیش ئەگەر بکرێ ڕیزبەندیان بکەین لەم چەند خاڵەدا کۆدەبنەوە:

أ-خاوەن هێڵی ئاڵۆزە لە دیزایندا.

ب-شێوەکانی ئەبستراکتێکی سادەکراوەیە.

جـ-زێدەڕۆییەك لە پێوانەو ڕێژەدا کراوە لە پێناو هەرچی زیاتر ڕوون و ئاشکرانواندنی هەڵچوونەکاندا.

د-گرنگی دان بە هەست کردن و دەربڕینی لایەنی ڕۆحی فیگەری مرۆڤەکان نەك لایەنی فۆرمی فیگەرەکان. هەر ئەم خاڵەشە بووەتە هۆی دروست بوونی خاڵی (هـ).

هـ-دیارنەبوون و نەنووسرانی ناوی هونەرمەندەکان لەسەر کارە هونەرییەکانیان ئەویش بەو هەنجەتەی ئەو کارە هونەرییانە فۆرمێك نین و بەس، بەڵکو هێما و نوێنەری ڕۆحانی ئەو کەسایەتییە پیرۆزمەندانەن.

د-بەرجەستەکردنی بوونەوەری سەیر و نامۆ لە شێوەو سیمایاندا، کە ئەو دیاردەیە لە هونەرەکانی پاش ڕۆمانسکدا بەم ڕێژەیە بەرچاو ناکەوێت. نموونەیەکی خێرا بۆ ئەم خاڵە ڕیلیفی ئەو بوونەوەرە سەیرانەیە کە هەستانەوە و ڕۆژی دوایین دەنوێنن لەسەر مردوویەك لە کەنیسەی ئاتون لە فەرەنسا.

گرنگی چوار خاڵی یەکەمە وای کردووە رەخنەگری جیهانی (هربرت ڕید) هونەری ڕۆمانسکی بە تایبەت دەستنیشان بکات لە میانی هونەری سەرەتای مەسیحییەتدا بە یەکێك لە حەوت شێوازە سەیرەکەی هونەری پەیکەرسازی مۆدێرنیزم پشتی پێ دەبەستێ و سروشی لێ وەردەگرێت. ئەو دەرباری ئەم هونەرە وەها دەدوێت:

ساتێ دەڕوانینە هونەری شارستانیەتی سەرەتای مەسیحییەت یا هونەری ڕۆمانسکی و غووتی (کە ئەم هونەرانە کاریگەریی جەوهەریی کردۆتە سەر کارە هونەرییەکانی پیکاسۆ و هنری. مۆر)، خۆمان لە بەردەم چەندان تایبەتمەندی ڕۆحانی وەهادا دەبینین کە گرنگی و بەهای میتافیزیکی تەواو جیاوازی هەیە.

هەڵبەتە نکۆڵی لە هۆکارەکانی لێکدانەوەی ڕوانگەی یەکەم ناکرێت لە بە گەیشتنی بەو بەرەنجامە ئیستێتیکییانە، بەڵام تۆمارنەکردن و دیارنەبوونی ناوی هونەرمەندەکان لەسەر

بەرهەمـە پەیکەرییـەکان بـە پێزییـەکی هـەرچی بـاڵاتر دەبەخشـێتە ڕوانگـەی دووەم. لــە بەرەنجامدا دەکرێت بڵێین هەردوو هۆکارەکە ڕەنگە ڕۆڵی خۆیـان دیبێـت هەریـەك بـە جیـا لـە ئاست خۆیان و لە بەدی هێنانی ئەو ئامانجە ئیستێتیکییە نوێیەدا.

## قوتابخانەکانی هونەری پەیکەرسازی لە فەرەنسا

### قوتابخانەی هەرێمی لانجدۆك:

شاری تۆلۆز لە سەدەی یازدەدا بە سەنتەرێکی بە پیتی هونەر و ئەدەب دادەنرێت، هـەردوو کەنیسـەی سـان سـرنان و کەنیسـەی سـانت ئـاتین لـەخۆ دەگرێـت، بــە هــەموو ئــەو ئاســەوارە هونەرییـە ناوازانـەوە کـە لـە دووتوێـی خـۆی گرتـووە تـا ئێسـتاش زۆرێکیـان هـەر مــاون و لــە مۆزەخانـەی ئـەو شـارەدا پـارێزراون. لـە بـەناوبانگترین کەنیســەکانی تــەرزی ڕۆمانسـکی ئــەم هەرێمە کە پەیکەری ڕۆمانسکی لـەخۆ گرتبێـت کەنیسـەی (سـان پـیر)ە لـە شـاری مواسـاك، بـە تایبەت ئەو دەروازە بەناوبانگەی کە یەکێ لە قەشەنگترین پەیکەری ڕۆمانسکی لەخۆ گرتـووە دەربـاری ڕۆژی دوایـین و هەسـتانەوەیە، مەسـیح لـە ناوەڕاسـتداو بـە پێوانەیـەکی گـەورەتر لـە هەموویان لەسەر عەرش دانیشتووە لـە نێـوان چـەندان فریشـتەی شـێوە لـەش لاکێشـەییدا. لە دەوری ئەوانیش هێمای شێوەیی هەیە بۆ پەیامبەرو نێردراوەکان. لاکانی دەروازەکە بـە شـەش شـێری بەرامبـەر بـە یـەك ڕازێنراوەتـەوە، هـەردووانیان ڕوویـان لـە یـەکترە. ئـەم دەروازەیـە دیمەنێك نەخشەسازیی بێ وێنە لـە هونـەری پەیکەرسـازی ڕۆمانسـکی بـەدی دێنێـت. ڕێژەکـان گرنگییەکی تایبەتیان پێ دراوە و بە شێوەیەکی تایبەتیش بایەخ پێـدان ئاراسـتەی بەدیـهێنانی کۆمەڵێکی نەخشەسازی گونجاو لەم دەرگایەدا کراوە کـە دواتـر کاریگـەری پۆزەتیڤـی ئاراسـتەی کـارکردنی پەیکەرسـازی لـە کەنیسـەکانی تـردا کـردووە لـە هەرێمـەکانی لیمــۆزان و خــوارووی ڕۆژئاواو هەرێمەکانی ئیسپانیا بە تایبەتی کاتیدراڵی سان جاك دی کۆمبۆستیل.

### قوتابخانەی هەرێمی ئۆڤێرنی:

زیاتر ئەم قوتابخانەیە لەژێر ڕێسا پەیرەوکراوەکانی رۆمانیدا گرنگی بە تـاج داوە، ئەمـەش بە زیاتر لە کەنیسەکانی (نۆتردام دوپۆی) و کەنیسەی (سان جولیای دی بریود)دا دەبینین کە پارێزگـاری لـە شـێوەی تـاجی کۆرنثـی و هیڵـەکانی کـردووە، تـەنیا گۆڕانکـاری لەپێکهاتــەکانیدا کردووە بە پێکهاتەی زیندوو.

هونەری پەیکـەری بیناسـازی لـە هـەرێمی ئۆڤـیرنیدا لـە چـەند پارچەیـەکی بچووك زیـاتر دەرنەکـەوت، دەروازەی کەنیسـەکانی بـێ پەیکـەرن و بـە شـێوەیەکی گشـتی پەیکـەری سـەر

دیوارەکانیشی لاوازن لە وەیدامە هونەرییەکەیدا. لەسەر تاجی کەنیسەی (سانت فوادی کونـك) نـەبێت هـەندێ ئاسـەواری پەیکەرسـازی دەبینـین یـاخود لەسـەر دەروازە گەورەکـەی پەیکـەری ڕۆژی دوایـین کـە لـە تـەرزێکی بـاڵای پەیکەرسـازی ئـەنجامی داوە، خـاوەن کەسـایەتییەکی سەربەخۆو واقیعی پتەوە.

## قوتابخانەی هەرێمی بۆرجۆنیاو دۆڵی ڕووباری ڕۆن:

هاوکات ئەم هەرێمە لەگەڵ هەرێمی لانجدۆکدا هونەری پەیکەرسازی تێدا بەدەرکەوت لـە هەندێ دەرگاو تاجی کۆڵەکەدا کە سـەرەتایی خـاوەن تـەرزێکی خـەیاڵی بـوون، بـەڵام لـە سـاڵی (١٠٢٥) بـەدواوە هونـەرێکی هـەرچی زیـاتر بـە پـێزو بـاڵا سـەری هـەڵدا، هونەرمـەند تیـایدا توانایـەکی زیـاتری خستەگەڕ بـۆ ئامادەکردنـەوەی ڕابـردووی هونـەریی لـە دوو توێـی بابـەتی نوێـدا. لـە کاتیدراڵـەکانی ئۆتـان و دێرەکـانی کلۆنـی و ڤیزیلییـە چـەندان پێگـەی هونـەری پەیکەرسازی دامەزران، پەیڕەوی تەرزێکی تایبەت بە هەرێمی (بۆرجۆنیا) یان دەکرد کە لێوان لێوی ژیان و شۆخ و شەنگی بوو.

ئەمـەش لە هـەندێ دەروازەدا دەبینـین کە وێنەیەکـە لـە ڕۆژی هەسـتانەوە، لـە نموونـە جوانەکانی پەیکەری (حەوا)یە کە یەکێ لە دەروازەی دەرگاکانی تەنیشتی ڕازاندۆتـەوە، ئەمـە جگە لە کۆمەڵێ کاری هونەریی لەسـەر هەشت کۆڵەکە ڕووداوەکـانی ژیـانی حـەزرەتی عیسای لەسەر هەڵکۆڵراوە، بەڵام لە تەختی دەرگا گەورەکەی کەنیسەی ڤیزلیە دیزاینێکی گەورە هەیـە لـە هونـەرێکی بـەرزو لـە بیرۆکەیـەکی ئـایینی تیـایدا گوزارشـت لـە گیـانی قـدس کـراوە کـە دابەزیوەتـە نێـو نێردراوەکـان دەستنیشـانی ئـەو دەوڵەتانـەیان بـۆ دەکـات کـە پێویسـتە تیـایدا ئایینی مەسیحی بڵاوکەنەوە.

لە باری کەنیسەی (لیون)ی مەزن کە ساڵی (١٠٨٨) بنیات نراوە تەنیا هەشت تـاج لـە تـاجی کۆڵەکـەکانی هەیکەلەکـەی ماوەتـەوە، ئەمانـەش بـە ئاسـەوارێك نـاوزەد دەکرێـن بـێ وێنـە لـە بەرزی و شۆخیاندا بە باڵاترین کاری پەیکەرسازی مەزندە دەکرێت لە هەرێمی بۆرجۆنیا ئـەم هەشت کۆڵەکەیە هێمای هەشت پلەی ئاوازەکـانی مۆسـیقای جریجۆریانییـە و چـوار وەرزەکـە و چاکێتی و کێلانی زەوی و هونەرەکان.

## قوتابخانەی خوارووی ڕۆژئاوا:

هەتا ئەمڕۆش خوارووی خۆرئاوای فەرەنسا ژمارەیەکی زۆر لە کەنیسەی لەخۆ گرتـووە کـە تیایدا هونــەری پەیکەرسازی سـەردەمی ڕۆمانسکی چووەتـە ئاسـتێکی بـەرز و پەرەسـەندنێکی گەورەوە ئەم قوتابخانەیە بە جوانی شێوەو مەزنی هەستی ئایینی جیادەکرێتەوە، ئەمانە گشت

لەژێر کاریگەریی ئوستاد و قەشەکاندا بابەتەکانیان بە مۆرکێکی هێماگەری ئایینی بەڕێوە دەچوو. دەروازەی ئەم کەنیسانە خاوەن تەخت نەبوو، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە زنجیری کەوانەیی لەخۆ گرتووە کە بە نەخشەسازییەکی گوڵ و درەخت ڕازێنراوەتەوە، هەرچۆن چەندان شێوەی لەشی مرۆڤی لەخۆ گرتووە بە لاوازی و لاکێشەیی بە دوای هێڵی زنجیرەکاندا کشاون. بە هاورێکی ڕووەو کلیلی تاقەکان ئەم شێوانە درێژبوونەتەوە. ڕووی کاتیدراڵی (نوتردام دی لاگراند) لە شاری پواتیە بە ئاسەوارێکی تاشراو والایە، بەشێکی ئەم ڕووە بابەتێکی ئایینی بەرجەستە کردووە کە ئازاری پەیامبەرەکانی پێ دەوترێت.

## هونەری پەیکەرسازی ڕۆمانسکی لە ئیتاڵیادا

### قوتابخانەی هەرێمی لۆمبارديا:

لە سەدەی دوازدەدا لە سەرووی ئیتاڵیا قوتابخانەیەکی پەیکەرسازی سەری هەڵدا بە پێز لە بەخشینیدا خاوەن ئاسەوارێکی ناوازە، هەردوو پەیکەرساز نیکۆلاس و غلیوم نەخشەسازی کەنیسەکانی ڤیرۆناو کریمۆنا و مۆدنای کردووە. ئەم ئاسەوارانە لە دیمەنێك پێکهاتبوون خاوەن شێوەی جۆراوجۆر و کەسایەتی بەرجەستەکراو بە پێوانەی گەورە دروست کراو بە پەیکەری ڕیلیفی بەرز دیزاینی ئەم ئاسەوارە نەخشەسازییانە لە دەروازەی هەموو کەنیسەکاندا بە شێوازێکی سادەو ڕێکخراو بە دەردەکەوێت، لە حاڵەتێکی هێمندا لەشی کەسایەتییەکان پڕاوپڕن لە گورجوگۆڵی، هەست کردنێك بە ویقاری ئایینی لە ڕوویاندا دیارە. ئەم کارانە بە نزیکی ساڵی (١١٢٥) جێبەجێ کراون. لە نیوەی سەدەی دوازدەیەمەوە ساتەوەختی دەرکەوتنی هونەرمەندێکی بلیمەت بوو کە بینتدتۆ ئەنتێلانی ناوبوو، ئەم هونەرمەندە کارکردنی لەژێر کاریگەریی هونەری پەیکەرسازی فەرەنسیدا بوو، یەکەمین کاری ئەو کە تیایدا پارێزگاری و پەیڕەو لە ڕێسا سەرەتاییەکان کراوە بینای کاتیدراڵی پارما بوو کە لە ساڵی (١١٧٨)دا جێبەجێی کردووە، ئەمێستا شتێك لەو ئاسەوارە بەنرخە نەماوەتەوە تەنیا تاجێك و پارچە پەیکەرێکی ڕیلیفی نەبێت کە تیایدا هاتنە خوارەوەی مەسیح لەسەر خاچەکەوە بەرجەستە کراوە، لە وردەکاری کارکردنیدا لە گشت بەشەکانی ئەم پەیکەرەدا لە کاری زەرەنگەری دەکات. هەروەها ساڵی (١١٩٦) ئەنتێلانی بونیاتنانی شۆردنگەی بەردەم کاتیدراڵەکەی کرد و لەسەر ڕووی دیوارەکانی ئاسەوارێکی بۆ جێ هێشتووین لە پەیکەری ڕیلیفی ناوازە، کە تیایدا هەمان ڕێگەی نەخشەسازی گرتۆتە بەر کە لە جێبەجێ کردنی کاتیدراڵی (بۆرجۆسان دۆنینۆ)دا گرتبوویە بەر لە نزیك شاری مۆدینا. پەیکەرێ لەسەر دەرگا

سەرەکییە گەورەکەیەو هەندێ پەیکەری فریشتەو ڕووداوی هەڵبژاردە لە ڕووداوی ژیانی مەسیح لە تەکیدا بەرجەستە کراوە. لەسەر هەردوو شانی دەرگاکە دوو پەیکەری گەورە بۆ پەیامبەران داود و حزقیال دانراوە. لەسەر قەراغی سەروو ئەمانەش بەسەرهاتی پیرۆزمەند (دۆمنیۆس) شەهیدی کەنیسەکە. لە شاری ڤینیسیاش هەندێ جێدەستی هونەری ڕۆمانسکی بەدی دەکرێت لە کاتیدراڵی (سان مارك)ی بێزەنتی.

### قوتابخانەکانی خوارووی ئیتاڵیاو سقلیە:

هونەرمەندانی خوارووی ئیتاڵیا بیریان لە ڕازاندنەوەی پێداویستی و شتومەکی نێو کەنیسەکان کردەوە، بە تایبەت پێگەی بانگدان و کورسی قەشەکان بە نەخشەکاری مەڕمەڕی، بۆ ئەم مەبەستەش سوودیان لە تەرزی نەخشەسازی ڕۆژهەڵاتی وەرگرت لە سەدەی دوازدەوە ئالوودەی هەڵکۆڵینی ئەم نەخشەسازییە بوون. ئەو دەمەی دوورگەی سقلیە کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی نۆرمەندییەکان لە سەدەی دوازدەدا، بووە پێگەیەك فراوانتر لە گشت جێیەك بۆ خەملاندنی هونەرێکی پتەو، کارێکی سەرکەوتوو ڕەچاو دەکەین کە نەخشەسازو هونەرمەندە بێزەنتی و عەرەبە موسڵمانەکان هاوشانی یەك ئەنجامیان داوە.

لە تەك هونەرمەندانێك کە لە پێگەی جیاوازی ئیتاڵیاو فەرەنساوە هاتبوونە ئەوێ. مەلیك غلیومی دووەم ساڵی (١١٨٢) کاتیدراڵی مونریالی دروست کرد کە دواتر دێرێکی بۆ قەشەکان خستە سەر، تاق و کۆڵەکەکانی هەندێ بە مۆزائیك ڕووپۆش کراون و هەندێکی تر وێنەی زۆر ورد و بە سەلیقەی لەسەر کێشراوە، تاجەکانی بە باڵندەو گیانەوەری سەیرو نامۆ ڕازێنراوەتەوە، ئەمە جگە لە وێنەی وەرگیراو لە ئینجیل. لەسەر یەکێ لەم تاجانە مەلیك غلیوم خۆی دەبینێ کە ئەم کەنیسەیە پێشکەش بە مریەمی پاکیزە دەکات، ئەم کۆمەڵەش تاقە ئاسەواری ساغە کە مابێتەوە لە بارێکی باشدا هەتا ئێستا و بە جوانترین ئاسەواری هونەری ڕۆمانسکی لە ئیتاڵیادا دادەنرێت.

## هونەری نیگارکێشان و وێنەی دەسنووسە مینیاتۆرییەکان

هونەری نیگارکێشانی سەردەمی ڕۆمانسکی بۆ دوو جۆر دابەش دەبێت:

جۆری یەکەمیان خاوەن پشتینەیەکی (باك گراوند) تاریکن و جۆرەکەی تر پشتینەکەیان ڕووناك و کراوەیە، لە جوانترین کاری دیواربەندی فریسکۆیی ئەو کارانەن کە دیواری کەنیسەکانی سان ساڤان و لیجیت و مۆنتواری گرتۆتەوە. هەندێ کاریگەری بێزەنتی تێدا بەدی دەکرێت، هەر ئەم کاریگەرییە ڕۆژهەڵاتییە لە هەندێ دیواربەندی فریسکۆیی هەرێمی

کەتالۆنیا بەدی دەکەین لەسەر دیوارەکانی کەنیسەی نۆتردام دی بوهی، تەنانەت هەندێ دەقی بە پیتی یۆنانی نووسراو بەرچاو دەکەوێت.

لە ئیتاڵیاو لە هەرێمی لۆمباردیا هەندێ فریسکۆی ڕۆمانسکی پارێزگاری کراوە، بە تایبەت لە کەنیسەی سان فنشنزود دی جالینۆ، بەڵام لە شاری ڤینیسیا زۆربەی نیگارەکان دیواربەندی مۆزائیکییە، شاری ڕۆماش بەو فریسکۆیانە دەناسرێت کە کەنیسەی سان کلمنتی ڕازاندۆتەوە.

کاریگەریی بێزەنتی لە ڕێی هاتوچۆی گەورە قەشەکانەوە خۆی گەیاندە خوارووی ئیتاڵیا کە ئەم هاتوچۆیانە بە مەبەستی هێنانی هونەرمەندان بوو بۆ نەخشەسازی کردن لە دێرو کەنیسەکاندا، هەرچۆن زۆر پارچەی ئاسەواری هونەریان هەر لەوێ دەکڕی.

لە ئەڵمانیاش بە تایبەت هونەری مینیاتۆری لەسەر دەستی ئیمپراتۆر ئۆتۆنی دووەمدا پەرەی سەند و چەندان فێرگەی بۆ کرایەوە لەوانە قوتابخانەی ڕیچناو، قوتابخانەی ڕاتسبون و هی تریش. لە جوانترینی ئەم دەستنووسانە ئەو یەکەیانە کە ناسراوە بە ڕیجستروم گریگۆری کە قەشە ئیگبیر بەخشییە کاتیدراڵی تریڤز، لەم دەستنووسە بەناوبانگە تەنیا دوو کاری مینیاتۆری لێ ماوەتەوە کە یەکەمیان وێنەی پیرۆزمەند گریگۆرە لە کتێبخانەی تریڤزدایە ئێستا. دووەمیان ئیمپراتۆر ئۆتۆنی دووەمە لەسەر تەختی دەسەڵاتەکەی دانیشتووە کە ئەویش ئێستا لە مۆزەخانەی کۆندییە نزیك پاریس.

لە بەناوبانگترین قوتابخانەکانی هونەری دەستنووسەکانی فەرەنسا ئەو قوتابخانەیەیە کە لە بەشی خوارووی فەرەنسادایەو کاریگەریی ئیسپانی لە سەرەو پابەندییەتی لە بەنرخترین بەرهەمیان بەناو (سان سیفیر)ە کە لە کتێبخانەی ئەهلییە لە پاریس.

لە سەدەی ناوەڕاستدا ساتێ نیگارکێش و پەیکەرسازەکان بابەتە پیرۆز و کەسایەتییە ئایینییەکانیان بەرجەستە دەکرد، لەسەر ڕێسا و ڕێڕەوێك دەڕۆیشتن لە لایەن پیاوانی ئایینییەوە بۆیان دەستنیشان دەکرا، ئەم ڕێسا ئایکۆنۆگرافیانە ڕێزی تایبەتی لێدەگیراو دەبوایە هونەرمەندەکان پەیڕەوییان بکردایە بەبێ گۆڕان و دەسکاری، ئەمەش وەنەبێت تەنیا لە شوێنێك یا وڵاتێکدا وا بووبێت، بەڵکو سەرانسەری ئەورووپا وەها مامەڵەی ئەو ڕێسا بنچینەییانەیان دەکرد. بەشێکی باشی ئەو ڕێسا هونەرییانە لە هونەری بێزەنتییەوە مابۆوە بۆ ئەو وڵاتانەی ئەورووپا، هەندێکی کەمیشی ئەفرێنراوی ئەورووپا خۆیان بوو. لە نموونەی ئەو ڕێسا هونەرییانە ئە و ڕووناکییە کەوانەییەیە (الهالة) کە لە دەوری سەری کەسایەتییەکان دادەنرا، ئەمەش هێمایەك بوو بۆ پیرۆزی، بۆیە دەبینین هەموو پیرۆزمەندەکان بەبێ ئەو کەوانە ڕووناکییە دەرنەکەوتن. ئەو کەوانە ڕووناکییە خاچی لەنێودا بێت بۆ حەزرەتی عیسا

تەرخان کراوە، پێی رووتیش لە سیمای یەزدان و حەزرەتی عیسا و فریشتە و پاکیزەیە، بەڵام لەو وێنانەدا کە پشت (بە ئینجیل) دەبەسترا بۆ وەرگرتنی، پێگەو دانانی کەسایەتییەکانیش بە پێی بنەمایەك بوو کە جێگیر بوو، لەو دیمەنانەدا کە دوا شێوی دەنواند بۆ نموونە دەبوایە عیسا و نێردراوەکانی لە لایەك دەرکەوتنایەو یەهوزا لە لاکەی تر، لە دیمەنی لە خاچدانی مەسیحدا هەمیشە مریەمی پاکیزە لەلای راستی بوەستێ و پیرۆزمەند یوحەننا لەلای چەپی. هەندێ لەم رێسایانە کە نەوەکانی مەسیحییەت پشتاوپشت بۆیان مابۆوە سەرەتای سەرهەڵدانیان دەگەڕێتەوە هونەری قیبتی نموونەی ئەمە ئەو شێوانەن کە بوونەتە هێما(***) بۆ پیرۆزمەندان یوحەننا و مەتی و لۆقاو مەرقەس کە چوار دانەری (ئینجیل)ن، ئەم شێوە هێماییانە بڵاو و پەخش بوون بەسەر هەموو بەرهەم هێنراوێکی هونەریدا، بە تایبەت لەسەر دەرگای کەنیسەکانی رۆمانسکی و غووتی، ئەگەر لە بنەچەی ئەم هێمایانەش بکۆڵینەوە هەر دەچێتەوە سەر هونەری قیبتی کە لە دیمەنێکدا دەبینین مریەم شیر بە مەسیح دەدات لە پەیکەری ریلیفی فیرعەونی وەرگیراوە (بە زۆری بۆچوونەکان) ساتێ زۆر لە شێوەکان دەبینین خواوەندی ئیزیس دەنوێنێت شیر بە کوڕەکەی (هورس) دەدات.

هەرچۆنێك بێ هونەری قیبتی کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر دەستنووسە ئیرلەندییەکان داناوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قەشە میسرییانەی ئایینی مەسیحیان لە ئیرلەندە بڵاوکردەوە.

## پەراوێزەکان:

١-ئەمەش بە ناوی پیرۆزمەند بندکت (سان بنوا)، دامەزرێنەری قەشەگەرێتی بندیکتی.

٢-خاچی گریکی ئەو جۆرە خاچەیە باڵە درێژ و پانەکەی یەکسانە.

٣-مەبەست لەم خاچە خاچی لاتینییە کە باڵە درێژەکەی بەناو باڵە کورتەکەیدا گوزەر دەکات و درێژترە.

٤-ترانسیت (Transept): ئەو رێڕەوەیە بە پانایی حەوشی کەنیسەکە دەبڕێت لە هەردوو لاوە لێی دەردەچێت، باڵە کورتەکەی خاچەکە دەنوێنێت، یاخود بریتییە لە باڵە کورتەکەی خاچەکە.

*تەرزی بازیلیکی لە شێوەی لاکێشیدایە، هۆڵێکی گەورە پێك دەهێنێت گومەزێ سەری گرتووە، پەنجەرەکانی لە بن بنمیچدایە، بۆ کۆبوونەوەی گشتی خەڵکی ئەو هۆڵە گەورەیە بەکارهاتووە. لە نموونەکانی ئەم کەنیسەیە: کەنیسەی (قدیس بطرس)ی کۆن لە رۆما، کەنیسەی سان صوفیا لە ئەستەنبوڵ کە ئێستا مزگەوتە.

**ئـەم ناولێنانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ نیشـتمانی بنـەڕەتییان لـە هـەرێمی ئیزۆریـا لـە ئاسـیای بچووك، فەرمانڕەوایی ئەم خێزانە تا ساڵی (٨٤٣) زاینی خایاند.

***شێوە هێماییەکان ئەمانەن: هەڵۆ هێمایە بۆ یوحـەننا، فریشـتە بـۆ مـەتی، گـا بـۆ لۆقـا، شێر بۆ مەرقەس.

## سەرچاوەکان:


١-محيط الفنـون: مجموعـة مـن الاسـاتذة/ الفـن الرمانسـكي، الاسـتاذ حنـا سميكـة، درالمعـارف بمصر، التأريخ بلا.

٢-معنـى الفـن: هربـرت ريـد، ترجمـة سـامي خشـبة، دار الشـئوون الثقافيـة العامـة، الطبعـة الثانية، ١٩٨٦، بغداد.

٣-فنون الغرب: في العصور الوسطى و النهضة و البـاروك، نعمـت اسمـاعيل عـلام، دار المعـارف بمصر ١٩٧٦.

٤-الفنون القديمة: موسوعة تأريخ الفن و العمارة، الدكتـور عفيـف البهنسـي، المجلد الأول، دار الرائد العربي، دار الرائد اللبناني، الطبعة الأولى ١٩٨٢.

٥-النحت الحديث: هربرت ريد، ترجمة فخري خليل، مراجعة جبرا إبراهيم جبرا، دار المأمون بغداد ١٩٩٤.

# هونەری غووتی
# (١١٥٠-١٤٠٠)

## پێشەکی:

یەکەمین جار کە وشەی غووتی یاخود گووثی (Goth) بەکارهات لە سەردەمی ڕێنیسانس-دا بوو لەسەر دەستی هونەرمەند و مێژوونووس "ڤازاری" کە لە نووسین و دانراوەکانیدا ئەم وشەیەی بەکارهێناوە و هونەری ئەو ماوە مێژووییەی بێ ناوزەد کردووە، ئەم ناولێنانەش لە شتێك بە کەم زانینەوە هاتووە، چونکە هونەرمەندانی ڕێنیسانس بە چاوێکی سووك و بێ بایەخەوە دەیان ڕوانییە ئەم هونەرە، هەر لەبەر ئەمەشە گەر بۆ مانای بنەڕەتی وشەکە بگەڕێین واتە وشەی گووتی دەبینین بە مانای هەمەجی دێت، هەر بۆیە وەهاشیان ناو لێ ناوە، چونکە ئەم هونەرە بە دوور بووە لە بنەما کلاسیکییەکانی یۆنان و ڕۆمان لە هونەردا هەرچۆن هەندێ لە مێژوونووسانی هونەر ناویان لێناوە هونەری فەرەنسی، چۆن زێدی یەکەمی ئەم هونەرە فەرەنسا بووە لە سەدەی دوازدەیەمدا. هەر لەو مێژووەشەوە لەم هونەرە هەموو ئەورووپای ژێر دەسەلاتی ڕۆمای گرتەوە تا سەدەی شازدە.

هونەری غووتی هونەرێکی بیناسازی و ئایینیە و هەموو هونەرەکانی تری وەك پەیکەرسازی و نیگارکێشان و نەخشەسازی خستۆتە ژێر باڵ و خزمەتی خۆیەوە تا لە پێداویستییە بنیات نەرەکانی کەنیسەدا بەکاریان بهێنێ. ڕاستە هونەری غووتی دوو جۆری جیاوازی لە یەکتر هەبووە، بەلاّم زۆرێك لە سەرچاوەکان تەنیا لە بارەی هونەری غووتی ئایینی دەدوێن، تەنیا ڕەخنەگری جیهانی "هربەرت ڕید" نەبێت کە ئاماژە بە هونەری غوتی میللی دەکات لە پاڵ هونەری غووتی ئایینیدا.

گەر لەم شارەزاییە بترازێ کە ئاسەوارێکی ئەوتۆی لە جۆرە ئایینیەکە نەماوە و لە بارەی جۆرە میللییەکەشی ئەوا دەڵێت هیچ ئاسەوارێکی نەماوە، ئەوا دەتوانین لەسەر هەردوو هونەری ڕۆمانسك و غووتی بدوێین کە یەك بە دوای یەکدا لەچاو هونەری بێزەنتیدا هەنگاوانی هەرچی زیاترە بەرەو بە واقیعی بوون بە تایبەت هونەری غووتی لە ڕۆمانسك زیاتر لە واقیع نزیك دەبێتەوە و لە بەرجەستەکردنی لایەنە ڕوحانییەکە دوورتر

دەکەوێتەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە هربەرت ڕید بە دەست خستنە سەر و جەخت کردنێکی زۆرەوە دەستنیشانی هونەری ڕۆمانسك دەکات لەنێو هونەری سەردەمی مەسیحیی سەرەتادا بۆ پشت پێبەستنی کاروانی هونەری نوێ لەو حەوت شێوازە هونەرییە نامۆو سەیرانەی کە وەك بنەمایەك بۆ ئەو کاروانە ئاماژەی بۆ کردون.

لە دوا وتەی ئەم پێشەکییەدا ئەوە ماوە بوترێت هونەری غووتی گەیشتنە بە لوتکەی هونەری ئایینی، هونەرێکی ئایینی کە تەبا بێت لەگەڵ بەدنیایی کردنی ئاییندا، چون ئیتر لە دوا ئەم هونەرەو ئەم سەردەمە هونەر هەنگاوی خێراو گەورە دەنێت بەرەو دنیای بوون.

ئەمە دوا سەردەمێکی هونەرە کە تێیدا هونەر بە یەکپارچەیی و شێوەیەکی ڕەها تەرخان بێت بۆ ئایین. چون لە دوای ئەم ماوەیە سپێدەکان بەرەو بەیانی ڕێنیسانس لە ئەوروپا بەدەردەکەون.

## دواى پێشەکی:

ساتێ باس لە هونەرێکی وەك هونەری غووتی دەکەین دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت لە یەکێك لە هونەرە خاوەن تایبەتمەندییە جیهانییەکان دەدوێین، لە دوای هونەرەکانی: سەرەتایی، کلاسیکی، ڕۆژهەڵاتی. ئەمانە ئەو هونەرانەن کە بە نموونە جیهانییەکانی هونەر ناوزەد دەکرێ. هونەرەکانی تر جگە لەمانە هەرچییەك بن، بە بەشێك و پارچەیەك و درێژکراوەی ئەو چوار هونەرەی پێشوو دادەنرێن.

ڕاستە هونەری غووتی لە هونەری ڕۆمانییەوە سەرچاوەی گرت، خودی هونەری ڕۆمانیش خۆگونجانێکی رووکەشی بوو کە هەستیاریی سەرووی ئەوروپا پشت بە توخمە بنەڕەتییەکانی هونەری کۆنی ڕۆژهەڵاتی دەیبرد بەڕێوە، وەختێ هونەری ڕۆمانی هەرچی زیاتر بەرەو هونەری غووتی دەچوو. هونەری غووتیش ڕووەو لوتکە هەنگاوی دەنا. لە بڕینی ئەم ڕێڕەوەدا ڕۆژ بە ڕۆژ هونەری غووتی زیاتر بەرەو هونەرێکی ئەفرێنراوی سەرووی ئەوروپا دەچوو، تا لە کۆتاییدا بە تەواوەتی خۆی لە سەرەتاکانی جیاکردەوە و سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. لە بەدیهاتنی ئەم بەرەنجامەدا بیری مەسیحی ڕۆڵی خۆی هەبوو کە ئەودەمە ببووە بیرێکی جیهانی، قەشەو پیاوە دینییەکانیان لە هەر کوێیەکی جیهان بوونایە بە زمانێك دەدوان. کەنیسە و پێگە ئاینییەکان ببوونە مەڵبەندی سەرەکی بۆبە بە دیارکەوتن و جێبەجێ کردنی ئەم تەرزە نوێیەی هونەر، چون هەر ئەم جێگانە بووبوونە مایەی کۆبوونەوە کۆمەڵگەی ئەوکاتە بەبێ جیاوازی توێژو چینەکان.

پەرەسەندنێکی گەورە لە فەلسەفەی ئایینی مەسیحیدا لە نیوەی سەدەی دوازدەیەمەوە بەدەرکەوت. پێشرەوایەتیی ئەم پەرەسەندن و گۆڕانکارییانە لە لایەن قەشە ڕۆشنبیرەکانەوە بوو کە ئاگاداری چوونە پێشەوە و پێشکەوتنە زانستییەکان بوون لە ئەورووپادا بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری. هەردوو زانکۆی فەرەنساو ئۆکسفۆرد دوو پێگەی سەرەکی تیشکی ئەم زانستە بوون.

بەرەنجامی ئەم بووژانەوە زانستییە گرنگی زیاتر درا بە باوەڕهێنان لە ڕێگەی قەناعەت پێ کردنەوە لە بری سەپاندنی ئایین لە ڕێی زۆر و ترسەوە، ئەم خواستە ئاینییە نوێیە کاریگەریی کردە سەر هونەری ئەو سەردەمە و لە پێش هەموویانەوە کاریگەریی کردە سەر هونەری بیناسازی کە سەرەکیترین و گرنگترین گۆڕەپانی پیادەکردنی ئەم بارە نوێیە بوو. لێرەدا بوو هونەری بیناسازیی غووتی سەری هەڵدا بە گۆڕانکاری لە دیزاینی گشتیدا و لە شێوازی پایەو دالان و کۆڵەکەیدا. کە دواتر دێینە سەر باسکردنی ئەوەی جێی ئاماژەیە هونەری غووتی لە دوو بەش پێکهاتووە هونەری غووتی پیرۆز (المقدس) و هونەری غووتی میللی. دووەمیان بەوە دەناسرێت زیاتر مۆرکی خۆماڵی پێوە دیاربێت و هەموو شێوەیەکی دەرەکیشی گونجاندووە بە پێی پێداویستی ناوخۆیی، هەرچەندە شتێکی کەم لە هونەری کەنیسەی غووتی ماوەتەوە، بەڵام لە بارەی هونەری میللی غووتی هیچ شتێ جێ نەماوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، چون هیچ کەسێك وەك هونەر تێی نەڕوانیوە و پێودانگی بۆ نەکردووە و بەهای پێ نەبەخشیوە تا پارێزگاریی لێ بکات.

گەر سەرنجێکی خێرامان ئاراستەی هونەری سیرامیك و گۆزەگەری ئەو سەردەمە بکەین لە دوای بە میللی بووندا بگەڕێین تێیدا، ئەوا چ لە ماددەی بەکارهێنان و دوادەست تێوەردانیدا (اللمسة الأخيرة) هیچ سیمایەکی ئاسایی بەدی ناکەیت کە لە کاری هونەریدا هەیە. بەڵام لە بارەی ئەو قاپانەی لە خەزەفی سەدەی ناوەڕاستدا هەیە لە لایەنی توانای ڕیتمی هێڵەکانی و سرووش بەخشینی ڕاستەوخۆی بارستایی و پێوانەی بە پێودانگێکی شێوەکاری لە ئاستێکی بەرجەستەیی جوانی وادایە کە هاوشان دەکرێت بە قاپە برۆنزییەکانی سەردەمی خێزانی تشاو لە چین، یاخود بە هەندێ پارچەی دیاری کراوی پەیکەری زنجی.

ڕاستە هونەری سیرامیکی ئەم سەردەمە لە ئاست هونەری پەیکەرسازیدا نییە (گەر سەرنجێك خێرا بدەینە پەیکەری بێ سەروقۆڵی بەردینی ئینگلیزی کۆتاییەکانی سەدەی سێزدە لە کەنیسەی ونستر دەتوانین هەموو ناسکییەکی شاراوە لە یەکێ لە ئایینە مەزنەکان و باڵایی ڕۆحانی بەرجەستەکراو لە بەردێکدا ببینین).

لەگەڵ ئەمانەشدا دەتوانین بڵێین بەبێ بوونی توانا لە پیشەسازیی سیرامیکدا ئەم سەردەمە نەیدەتوانی پەیکەرسازی بەدەست بهێنێت. یەکەمیان سادەو سەرەتاییەو دووەمیان ڕۆحانی و ئاڵۆزە، بەڵام پێکەوە یەکەیەکی شێوەکاری بەدی دێنن کە هونەر بێ ئەو یەکەیە بوونی نییە.

## بیناسازی

گۆڕانکاری لە بیناسازیدا لە فەرەنساوە سەرچاوەی گرت، ئەویش بە نارەزایی هەندێ لە قەشە فەرەنسییە دڵ گەرمەکان بۆ بیروباوەڕی نوێ و بەرامبەر بەکارهێنانی شێوازەکانی بیناسازی کە لە تەرزی ڕۆمانی پێش مەسیحیەتەوە وەرگیرابوو. وەك بەکارهێنانی داڵانە کەوانەییەکان. هونەرمەندان لەم پێشکەوتن و گۆڕانکاریانەدا گەیشتنە بەدی هێنان و ئەفراندنی تەرزێکی نوێی هونەری مەسیحی کە هەرچی زیاتر ناسك و ڕووناکتر بێت، هەرچۆن تەرزی غووتی دادەنرێت بە یەکەمین تەرزێکی بیناسازی لە ئەورووپادا کە خۆی دەرباز کردبێت لە کاریگەریی هەردوو هونەری ڕۆمانی و بێزەنتی لە شێوازی هونەری و چ لە ناوەڕۆکدا. بنەمای ئەم گۆڕانکارییانەی هونەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی لە هزر و بیرکردنەوەی ئایینی مەسیحیدا ڕوویان دا ئەویش بە گەیشتن بە (دوانەیی ڕاستی) (ثنائية الحقيقة) کە پێشتر هەموو گرنگی دانێ بە سیمای دنیایی دوورکەوتنەوە بوو لە سیما ڕوحانییەکان، بەڵام گۆڕانی ئەم بیرکردنەوە و لێکدانەوەیە بۆ ئەوەی لە هەموو سیمایەکی دنیاییدا سیمای ڕۆحی هەیە خۆی لە خۆیدا باوەڕهێنان بوو بەوەی دوو سەرچاوەی جیاواز هەن بۆ ڕاستی: باوەڕ و زانست، دەسەڵات و ئاوەز، لاهووت و فەلسەفە کە هاوڕێك نین لەگەڵ یەکتر، بەڵام هەر کامێکیان دەتوانن گوزارشت بکەن بە شێوازی تایبەتی خۆیان لە جۆرێك لە ڕاستی. ئەم بیرکردنەوە نوێیە تاکە ڕێگەی چارەسەر بوو بۆ سەردەمێك کە دەست بەرداری ئیمان نابێت لە پێناو زانستدا هەرچۆن دەست لە زانستیش هەڵناگرێ بۆ ئیمان.

گەر بێینەوە سەر گۆڕانکارییەکانی ڕوویان دا لە بیناسازیی غووتی-دا دەتوانین لە چەند خاڵێکدا چڕیان بکەینەوە:

**یەکەم:** دەرکەوتنی داڵانە یەکتر بڕەکان و دروست کردنی داڵانی تر لە سەری، بەم داڵانە یەکتر بڕانە (کە بۆ یەکەمین جار لە فەرەنسا بەدەرکەوت) دەوترا ئۆجیف (Ogive) لە سەدەی دوازدەهەمدا لە سەدەی سیازدەهەمدا بیناسازەکان تایبەتمەندێتی ئەم قۆڵە یەکتر بڕیوانەیان تا ئەوپەڕی توانای بەکارهێنا، بەمەش بیناسازیی غووتی ڕزگاری بوو لە دوا کاریگەرییەکانی بیناسازیی ڕۆمانسکی.

**دووەم:** بەکارهێنانی دالانی هەڵتۆقیو لە بری دالانی کەوانەیی و نیمچە کەوانەیی ئەمەش لە خزمەت ئەو گۆڕانکارییەدا بوو کە لە دالانە لاکانەوە بووە دالانە یەکتر بڕەکان.

**سێیەم:** دروست بوونی پایە فڕیوەکان بەرەنجامی بالابوون و بەرزبوونی کەنیسەی غووتی ڕانەگرتنی ئەو بەرزییەش لە لایەن پایەو دالانەکانی ناوەوەی. ئەم پایانە لە دەرەوە بنیات نران.

**چوارەم:** دەرکەوتنی پەنجەرەی گەورەو ڕەنگاوڕەنگ لەسەر دەروازە و دیواری بەرزی کەنیسەکان کە پێیان دەوترا پەنجەرە گوڵینەکان. لەبەرئەوەی فەرەنسا لەو سەردەمانەدا خاوەن دەسەلاتێکی (شاهانە) مەلەکی بەهێز بوو، شارەکانی سەربەخۆو دەوڵەمەند بوون، دەبینین ئەم شارانە سەرگەرمی پێشبڕکێ کردن بوون لەگەڵ یەکتردا لە بنیاتنانی کەنیسەو پێگە ئایینیەکاندا، هونەری بیناسازی غووتی گەیشتە چڵەپۆپەی سەردەمی خۆی لە سەرووی فەرەنسا، هەرچۆن دواتر گوێزرایەوە ڕووەو ولاتانی تری ئەوروپاو لە پێش هەمووشیانەوە ئینگلتەرا، دەبێت تێبینی ئەوە بکەین ئەم هونەرە چ وەك پەیڕەو چ وەك شێوازی کارکردن تێیداو بەخشینی بەرەنجامی، هاوتا نەبوو بە فەرەنسا، چون لە هەر ولاتێك تێکەڵ بە کولتوورو پێشینەی ئەو میللەت و ولاتە دەبوو، بۆ نموونە هەرگیز بەرەنجامەکان لە ئیتالیا وەك فەرەنسا لە لایەك و وەك هیچ ولاتێکی تری ئەوروپا نەبوو لە لایەکی ترەوە. ئەویش بە هۆی کاریگەریی هەردوو هونەری بێزەنتی و ڕۆمانییەوە لەسەر جووڵەی هونەری لە ئیتالیادا.

هێڵکاریی سەرەکیی بیناسازی کەنیسەی غووتی لەسەر شێوەی خاچە، کە ئەو دەروازەیەی لەسەر باڵە کورتەکەی خاچەکەیە دەمانباتە سەر دالانێکی سەرەکی بە قوربانگەیەك کۆتایی دێت و ئەویش چەندان نوێژگەی لێ دەبێتەوە، دالانی هەڵتۆقیو کە ئەوانیش یەکتر دەبڕن، ئەم دالانەش لەسەر پایەو کۆڵەکە وەستاون لە هەردوو قاتەکەدا نموونەی ئەمە لە کەنیسەی نۆتردام-دا بە ڕوونی دەردەکەوێت لە شاری پاریس کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (١١٦٣-١٢٠٠).

گەر لە دەروازەی کەنیسەی غووتی بڕوانین دەبینین چەندان دەرگای هەیەو دوو تاوەری گەورە لەسەر هەردوو لایەنی، لەسەر دەرگا سەرەکییەکەوە پەنجەرەیەکی بازنەیی گەورە هەیە کە ڕووپۆشە بە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ، هەرچۆن لە چەقی پێگەیشتنی هەردوو باڵی خاچەکەدا گومەزێك هەیە کە سەری گیراوە بە تاوەرێکی هەڵتۆقیو کە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیەکە بەرەو ئاسمان.

پشت بە پتەوبوون و بەرزبوونی کەنیسەی غووتی پەنجەرەی گەورەی تێدا بنیات نرا کە ئەم پەنجەرانە بوونە یارمەتیدەرێکی چاك لە ڕووناك کردنەوەی ناو کەنیسەی غووتی لە

لایەك و لە لایەکی تریش پێچەوانە بوونەوەی ئەو ڕووناکییە ڕەنگاوڕەنگەی پەنجەرە شووشە ڕەنگاو ڕەنگەکان بۆ خۆی کەشێکی تایبەت و ڕۆحانی دەبەخشییە ناوەوەی. لە جوانترین نموونەکانی تەرزی غووتی کەنیسەی (شارتەر و ریمز)ە لە فەرەنسا و هەردوو کەنیسەی (سالیزبوری و گلۆستەر)ە لە ئینگلتەرا. لە بارەی ئیتالیاشەوە وەك وتمان کاریگەریی ئەم هونەرە لەویَ کەم بوو، هەرچۆن گۆڕانکاریی تایبەتیشیان بەسەردا هێنابوو، وەك نەمانی تاوەر لەسەر دەروازەی کەنیسە و کەم کردنەوە و بچووك کردنەوەی پەنجەرەکان ئەمەش لە کەنیسەی فلۆڕەنسادا بەدەردەکەوێت، بەڵام لە ژووروی ئیتالیا زیاتر تەرزی غووتی ڕەچاو کراوە لە کەنیسەکاندا وەك کەنیسەی میلانۆ کە لە ساڵی (١٣٨٦)دا دروست کراوە.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژە بدەین بە هەرچی زیاتر بوونی بۆشایی نێوان دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی دنیایی کە پێشتر هێند لێك نزیك بوون کە دەتوانرا بڵێین یەك بوون، پاشاو پیاوانی دەوڵەت هەر لە بینای کەنیسەدا بە خەڵکی کۆدەبوونەوە و کاروباری دەوڵەتیان تێدا باس دەکرد، بەڵام بە زیادبوونی ماوەی نێوانیان، پیاوانی دەوڵەت بە تایبەت لە ئیتالیا دەستیان کرد بە بنیات نانی پێگەیەك تایبەت بە خۆیان و کاروباری خۆیان، ئەویش لە بنیاتنانی کۆشکەکاندا ڕەنگی دایەوە کە بە شێوازێکی فەنتازی و لەژێر کاریگەریی تەرزی غووتی‌دا بنیاتیان دەنا، (ڕەنگە بۆ ئیتالیا ئەمە سەرەتایەکی سادەو سانا بێت لە دەست پیَکردنی جیابوونەوەی دەسەڵاتی دنیایی لە دەسەڵاتی ئایینی).

لە جوانترین نموونەی تەرزی غووتی‌ی دنیایی لە ئیتالیا (کۆشکی سەرۆکایەتی)یە لە فلۆڕەنسا (١٢٩٨) هەروەها کۆشکی (کادئۆرۆ)یە لە ڤینیسیا ساڵانی (١٤٢٢-١٤٤٠) بنیات نراوە کاریگەریی ڕۆژهەڵاتی بە ئاشکرا پێوە دیارە لە ڕووی پێشەوەی کە خاوەنی دەرگاو پەنجەرەی زۆرە.

## پەیکەرسازی

پێش ئەوەی بێینە سەر چۆنیەتی ڕازاندنەوەی ڕووی دەروازەی کەنیسەکان دەبێت باس لە وازهێنانی پەیکەرسازە غووتییەکان بکەین بۆ ڕێسا نەخشەسازییە کۆنەکان کە پشت بەستوو بوو بە ئەتێلەکان، ڕووکردنیان لە قۆناغی نوێدا بەرەو سروشت و وەرگرتنی یەکەی نەخشەسازی لێی وەك هێشووی تریَ و گەڵای مێوو گەڵای (ئاکانتس) ئەمانەش یەکەی نویَ بوون لە سەرەتاکانی سەدەی سێزدەهەمدا بە دەرکەوتن لەسەر ڕووی کەنیسە گەورەکان. ئەم خۆ دەرباز کردنەش بەرەنجامی ڕۆژو دووان نەبوو بەڵکو بەردەوامیی نیو سەدەی خایاند تا

هونەرمەند بتوانێ لاسایی هەر شتێ بکاتەوە لە سروشتدا کە سەرنجی ڕابکێشێ. چون چیتر سروشت ئەو (جیهانە ماددییە لاڵە بێ گیانە) نەما کە پێشتر وەها تەماشای دەکرا

لە بارەی بابەتە ئایکۆنۆ گرافیییەکان تەرخان کرا بۆ ناوەوە و ڕووی کەنیسەکان و دەرگاو دەروازەکان. تا گوزارشت لە بیرۆکە ئایینییەکان بکات. ئەو پەیکەرانەی لە سەرەتادا هەست دەکرا شێوەهایەك بوون و نووسابوون بە دیوارەکاندا دواتر بوونە بەشێکی جیانەکراوە لە خودی بیناکەو یەکانگیر لەگەڵیدا، بۆ نموونە هەندێ پەیکەر درێژ دەکرایەوە بە درێژیی پایەکانی و کۆڵەکەکانی لەسەری بەرجەستە کرابوون، هەر دروست بوونی ئەم حاڵەتە بووە مایەی پەیدابوونی مشت و مڕێکی تایبەت کە هەندێ لە لێکۆڵەرەوان درێژبوونەوەی فیگەری سەر ئەم کۆڵەکەو پایانە دەگێڕنەوە بۆ گوزارشت کردن لە هەڵکشان و بەرجەستەکردنێکی ڕۆحانی و خودی ئەو فیگەرانە، بەڵام هەندێکی تریان ئەم درێژکردنەوانە پابەند دەکەن بە ڕێککەوتن و هارمۆنی شێوەی پەیکەرەکان لەگەڵ ڕیتمی بیناکاندا.

هونەرمەندەکان وەك سەردەمی ڕۆمانسك ڕێنومایییان لە پیاوانی ئایینی وەردەگرت، کە ئەوان وایان بڕیاردابوو کە بابەتەکانیان سادەو ساکار بێت لەچاو سەردەمی پێشوودا، ئەو بابەتانەی پەیکەریان بۆ کراوە یاخود بە شووشەی ڕەنگین بەرجەستەکراون لە پەنجەرەکاندا دەڵێی بۆ خەڵکێکی نەخوێندەوار دانراون هێند سانان. بابەتەکانیش بە پێی دەروازە و پێگەی جیاواز بنیات نراون و بەرجەستە کراون، ڕووی هەر کەنیسەیەك لە سێ دەرگای گەورە پێك هاتووە: دەرگای ناوەند هەمیشە تەرخانە بۆ حەزرەتی عیسا کە لە شانی ناوەندداو شانەکانی ئەم دیواودیویش بۆ پەیامبەرەکانی تر، بەشی سەرەوەی ئەم دەروازەیە بۆ عیسایە لە ڕۆژی دواییدا.

یەکێ لە دەرگای لاکان تایبەتە بە حەزرەتی مریەم و مردنی و بردنی بۆ ئاسمان. هاتنی فریشتە و پەیامبەرەکان بۆ لای. دەرگای لاکەی تری تایبەت و تەرخانە بە پیرۆزمەندێکی ئەو شارەی کەنیسەکەی تێدا بنیات نراوە لەگەڵ بەسەرهاتەکانی ژیانی.

لە بەشە بەرزەکانی ڕووی ئەم دەروازانە پەیکەری گەورەی پەیامبەرەکان و فریشتەکان دادەنرێت. ئەم بەش بەشکردن و دانانە وەك ڕێسایەك بە وردی پەیڕەو کراوە لە ژمارەیەکی زۆری کەنیسەکاندا. مەگەر لەو کەنیسانەدا نەبێت کە چاکراونەتەوە لە دوای ڕوخانیان یاخود سووتانیان یا لەو کەنیسانەدا نەبێت کە بچووکن.

هونەری پەیکەرسازیی غووتی لە فەرەنساو ئیتالیا ڕەنگدانەوەی بەپێز و قووڵی لەخۆ گرتووە بۆیە زیاتر بایەخ پێدانمان ئاراستەی ئەو دوو وڵاتە دەکەین.

لە فەرەنسا باس لە سێ قوتابخانەی سەرەکی دەکرێت بۆ پەیکەرسازی، بەلام زیاتر جیاوازیی ئەم قوتابخانانە لە چۆنیەتی بەرجەستەکردن و مامەڵە لەگەڵ بابەتە دینییەکاندا بەرچاو دەکەوێت نەك جیاوازی لە شێوازی کارکردن و تەکنیکدا، واتە کەمتر هەست بە جیاوازیی لایەنی ئیستاتیکی دەکرێت.

## ١-قوتابخانەی پاریس

ئەم قوتابخانەیە لە کەنیسەی (نۆتردام)دا بەرجەستە دەبێت، پەیکەرەکان لە سادەییەکی فراواندا بەرجەستە کراون، جۆری جلوبەرگەکان وەك هونەری یۆنانی مامەڵەی تێدا کراوە بە نزیکی، هەندێك کاراکتەر پەیکەری تا نیوەیان بۆ دروست کراوە واتە نیوەی لەشیان دیارە کە ئەمەش دیاردەیەکە لە هیچ کەنیسەیەکی تری فەرەنسادا نییە، پەیکەری حەزرەتی عیسا زۆر بە گەورەیی بەرجەستەکراوە لەسەر دەروازەی ناوەند، بابەت و ڕووداوەکانیش هەر بەو ڕێسایە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد دابەش کراوە.

## ٢-قوتابخانەی شارتر

لەم قوتابخانەیەدا نەخش زۆر بەکارهاتووە هاوشانی بابەتەکان، ئەوی جێی سەرنجە دروست کردنی پەیکەری زەبەلاحە لەسەر شانی ئەم لاولاکان بە ڕێژەیەکی زۆر کە بۆ یەکەمین جارە بەم ڕێژەیە کار بکرێ لە سەدەی سێزدەدا.

پەیکەرەکان جۆرە درێژکردنەوەیەکیان پێوە دیارە کە بەرجەستەی هەڵکشانێکی ڕۆحانی دەکات.

## ٣-قوتابخانەی ئامیان

کەنیسەی ئامیان بە نموونەیەکی کامڵ بۆ هونەری بیناسازی غووتی فەرەنسی دادەنرێت، هەرچەندە ئەم قوتابخانەیە لەژێر کاریگەریی دوو قوتابخانەکەی پێشوودا دەرنەچوو، بەلام بە سێ پەیکەری زەبەلاح لەوان جیایەو ناوبانگێکی جیهانی پێ بە دەست هێناوە کە بە ترۆپکی جوانیی پەیکەرسازیی غووتی دادەنرێن لە ئەوروپادا بە گشتی.

لە ئیتالیا هونەری پەیکەرسازیی غووتی بەرەو تەرزێکی هەرچی زیاتر واقعی چوو لەسەر دەستی خێزانی پیزانۆ (Pizano) کە چوار پەیکەرسازی لەسەر ئاستێکی هونەری بەخشییە پەیکەرسازیی غووتی، تا بە ئاسەوارە هونەرییەکانیان لە شارەکانی ئیتالیادا کە ئاوێنەی بالانومای بلیمەتیی ئەوانە ئەم هونەرە زیندوو بکەنەوە.

## *نیکۆلا پیزانۆ

نیکۆلا بە ڕێخۆشکەری تازەکردنەوە دادەنرێت لە مەیدانی هونەری پەیکەرسازی ریلیفدا ئەمەش لە کورسیی شۆردنگەی شاری بیزادا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە بە بابەتی ئایینی نەخشاندوویەتی. کاریگەریی هونەری کلاسیکی بە شێوازیدا دیارە.

## جیوفانی پیزانۆ

کوڕێ نیکۆلایە هەندێ کاری باوکی تەواو کردووە و لە هەندێکیشیدا هاوبەش بووە وەك بانگەی کەنیسەی سینا، زۆر پەیکەری بچووکی لەسەر عاج دروست کردووە.

## ئەندریا پیزانۆ

کوڕی جیۆفانییە، یەکەم کاری هونەری کە کردبێتی دەرگای شۆردنگەی بەردەم کەنیسەی فلۆڕەنسایە لە برۆنزەو لە بیست و هەشت پارچە پێکهاتووە، یاریدەدەری هونەرمەند و بلیمەت (جیۆتۆ) بووە لە دانانی تاوەری ئەم کەنیسەیەدا.

## نینۆ پیزانۆ

کوڕی ئەندریایەو دواکەسی خێزانەکەیەتی، بە هاوبەشی باوکی زۆر کاری ئەنجام داوە، دواتر چووەتە شاری بیزاو چەندان کاری پێ سپێردراوە لەوانە دەروازەی کەنیسەی سان مارتینۆ. زۆر کاری هونەری ئەو لە مۆزەخانەکانی ئیتالیاو فەرەنسادایە.

لێرەدا ئەوەی شایەنی ئاماژە پێ کردنە ئەوەیە کارە پەیکەرسازییەکانی ئەم سەردەمەو سەردەمی ڕۆمانسکی بریتی بوون لە کاری پەیکەری ڕیلیفی، ئەوە بێ لە پەیدابوونی جۆرێك لە ڕێگەی کارکردن بۆ بەرجەستەکردنی بابەتەکان.

ئەوەی دەمێنێتەوە لێرەداو شایەنی ئاماژە بۆ کردنە ئەویش بڵاوبوونەوە و پەیوەست بوونە بە شێوازی وێنەکردنی پێوەندیدارەوە، واتە گێڕانەوەی بەسەرهاتێك یاخود بابەتێك و ڕووداوێك بە وێنەی یەك لە دوایەکی پێوەندیدار بە یەکترەوە، هەڵبەتە لێرەدا مەبەستمان لە وشەی وێنەکردن و وشەی نیگارکێشان نییە، بەڵکو مەبەست بەرجەستە کردنە.

## نیگارکێشانی غووتی

گەر بە فەرەنسا دەست پێ بکەین ئەوا دەبێت پێش وەخت ئاماژە بەو کاری هونەری دیواربەندە (فریسکۆ) ناوازانە بکەین کە دەرکەوتوون هەندێ جار وەك ئەو کارکردنانەی لە هەردوو کەنیسەی سیان ساڤان و بزرلاڤیل دەبینین، بەڵام سەرباری ئەم جۆرە کارانەش هونەری فریسکۆ هەر کەمتر بەدەر دەکەون لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. بابەتە ئایکۆنۆ

گرافییەکان بە شێوەیەکی نموونەییتر بە دەرکەوتن لە هەردوو هونەری شووشە ڕەنگینـەکان و قاڵی چنیندا.

هونەری کارکردن لە شووشە ڕەنگینـەکاندا لـە فەرەنسا لـە سـەدەی دەوە سـەرچاوەی گـرت، شـاری پـاریس لـە سـەدەی دوازدەیـەمدا بـە گـەورەترین مەڵبـەندی ئـەم پیشەسـازییە دانـــراوە. هەرچـەندە بـە داخـەوە زۆرێـك لـەو کـاری هونــەری شووشــە بــەندە ڕەنگینانــە نــەماون کــە دەروازەکانی کەنیسەی نۆتردامی ڕازاندبۆوە چەند پارچەیەکی بچـووك نـەبێت، بـەڵام کۆمـەڵێ کاری جوان و بێژۆك لە کەنیسەی (سانت شابل) دەبینینەوە.

هـەموو کەنیسـەکانی فەرەنسا بـەم جـۆرە شووشـە بەندییـە ڕازێـنرابۆوە، بـەڵام بـە بۆنـەی جەنگەوە (بە تایبـەت لـە کـاتی جـەنگی سـەد سـاڵەو شۆڕشـی فەرەنسی)دا تێکشکان و نـەمان. جوانترین کۆمەڵە لەم کارکردنانـە کـە گەیشـتبێتە دەسـتمان بـە شـێوەیەکی بـاش ئـەو کۆمەڵە قەشەنگەیە کە پەنجەرەو دەروازەکانی کەنیسەی (شارتر)ی ڕازاندۆتەوە.

قـاڵی و فـەرش چنـین لـە ڕازاندنـەوەی دیـواردا بـەکاردەهات لـە کەنیسـەو کۆشـکەکاندا، لـە بـەنرخترینو جوانترینیـان کارگـەکانی پـاریس دروسـتی دەرکـردن و تایبـەت بـوو بـۆ مـەلیك و پیاوانی دەوڵەت. جۆری تریشی بابەتی دنیایی و وێنەی ئەسـپ سـوار و ڕووداوە وەرگێراوەکـانی مێژووی کۆنی تێدا بەرجەستە دەکرا.

گەر لە بارەی هونەری نیگارکێشانی غووتی لـە ئیتالیـا بدوێـین پـێش هـەموو شـتێ دەبێـت ئاماژە بەوە بدەین کە نیگارکێشان دوا هونەر بوو لە ئیتالیادا کە خۆی لە کاریگـەریی بـێزەنتی دەرباز کرد لە چاو هونەرەکانی تردا، بیناسازی و پەیکەرسازی لە سەدەی یـازدەوە چوونـە نێـو هونـەری ڕۆمانسـك و غووتییـەوە، بـەڵام نیگارکێشـان تـا ســەدەی سـێزدەش هونەرمـەندەکانی بیریان لە گۆڕانکاری نەکردبۆوە. مەیلی ئەوان زیاتر بەلای دەوڵەمەندکردنی ڕەنگەوە بـوو وەك گرنگی دان بە هێڵ ئەمەش بۆ خۆی کاریگەریی سیمای هونەری بێزەنتی بوو لە سەریان کە لە سەدەی شەشەمەوە تا سەدەی نۆیەم هەموو ئەورووپای گرتبـۆوە، بـەڵام لـە شـاری ڤینیسـیا ئـەم کاریگەرییە تا سەدەی سێزدە درێژبۆوە.

دەکرێت هەندێ هۆکاری تر هەبووبن سەرباری کاریگەریی بێزەنتی بۆ ئەفراندنی هونـەری ڕۆمانسـك، بـەڵام دەستنیشـان کردنـی سـەرجەم ئـەو هۆکارانـە شـتێکی قـورس و گرانـە لـەناو هونەری نیگارکێشانی ئیتالی‌ی سـەدەی سێزدەدا، لەبەرئـەوە هونـەری نیگارکێشـانی ئیتـالی لـەم سـەردەمەدا بـە دیاردەیــەکی هونــەریی بـێزەنتی تایبــەت دادەنرێـت بـە هاوکـاریی هـەندێ کاریگـەریی نـاوخۆیی کە ورد ورد لـە زیـادبووندا بـووە تـا گەیشـتۆتە چڕبوونـەوە لە هــەندێ

پارچەی هونەریدا کە دیارن و دەتوانرێ بە ئیتالی مەزەندە بکرێ. هونەری نیگارکێشان پەنای بۆ هەندێ شێوازی جیا بردووە کە لە سەدەی ناوەڕاستەوە بۆی ماوەتەوە وەك مۆزاییك و دەستنووسەکان و فریسکۆو نیگاری سەر تەختە، کە لە پێش زایینەوە بۆی مابۆوە تادوا زایین، بەڵام بە پێگەو گرنگییەکی بالاترەوە ، هونەری مۆزاییك زیاتر سیمای سەردەمی بێزەنتی بوو، بەڵام، فریسکۆ ئیتالیای کردە نیشتمانی خۆی تا دوا سەردەمی ڕێنیسانس.

فریسکۆ لە گیراوەیەکی پێکهاتوو لە قسڵی مردوو و خۆڵ پێکدێت کە دیواری پێ سواغ دەدرێت دواتر بە ڕەنگ کاری لەسەر دەکرێت، لە تایبەتمەندێتی قسڵ ئەوەیە لەگەڵ خۆڵ و ئاودا تێکەڵ بکرێت ڕوویەکی ڕەق پێك دێنێت کە ڕەنگ بە باشی هەڵدەمژێت و وشك دەبێتەوە لەسەری، گەر هونەرمەند بیەوێت کارەکەی سەرکەوتووبێت لەسەر ئەم ڕووە دەبێت ئاگای لەوە بێت ڕەنگەکانی زوو وشك بێتەوە لەبەر ئەوە پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی بۆدرە یاخود تۆزی مەڕ مەڕ، لە جێبەجێ کردنی کارەکەشیدا دەبێت خێرابێت و بەبێ گۆڕانکاری هەرچۆن دەبێت بزانێ کە کارەکەی وشك بۆوە ڕەنگەکانی چ ئەنجامێکیان دەبێت واتە وێناکردنی کارەکەی بە وشکی پێش وشك بوونەوە.

## هونەرمەندەکان

### *نیگارکێش: چیمابۆی (١٢٤٠-١٣٠٢)

چیمابۆی ساڵی (١٢٤٠) لە دایك بووە، لە شاری فلۆرەنسە لەوێش فێری نیگارکێشان بووە. لە بەناوبانگترین کارەکانی وێنەی حەزرەتی مریەمە لە مۆزەخانەی ئۆفیتسی لە شاری فلۆڕەنسا کە ڕووبەرەکەی (٢،٢٣) م بە (٣،٨٥) م. هونەری نیگارکێشان لەم سەردەمەدا لەژێر کاریگەریی بیناسازیدا بوو ئەمەش ببووە هۆی دواکەوتنی هەر بەم هەنجەتەش گرنگییەکی زۆری داوە بەو تەختەی مریەم لە سەری دانیشتووە، ئەو نەخشەی لەسەری کردووە هەمان نەخشی سەردیواری شۆردنگەی فلۆڕەنسایە، هەر ئەمەشە تاکە پێکهاتەی بیناسازی لە کارەکەیدا.

ئەم هونەرمەندە لە سەرەتادا بەکارە مۆزائیکی و شووشە بەندەکانی بەناوبانگ بووە کە لەژێر کاریگەریی هونەری بێزەنتیدا کاری تێدا کردوون، بەڵام دواتر وازی لەم ڕێسای کارکردنە هێناوە و ڕووی کردۆتە نیگارکێشانی تابلۆی گەورە بۆ کەنیسەکان بە ڕەنگی تێکەڵ بە زەردێنەی هێلکە کە پێی دەوترا (تێمپرا)[٢] ئەم جۆرە کارکردنە لەم پێوانە گەورانەدا لەوەوپێش بەکارنەهاتبوو. داهێنانەکانی ئەم هونەرمەندە کاری کردە هونەرمەندانی دوای خۆی لە فلۆڕەنسا لە سەروو هەمووشیانەوە هونەرمەندی هەڵکەوتوو جیۆتۆ.

## *نیگارکێش: جیۆتۆ دی بۆندۆنی (١٢٦٦-١٣٣٧)

ناوی جیۆتۆ لە مێژووی نیگارکێشاندا بە کەوانەیەکی ئەفسووناوی دەوردراوە، هاوسەردەمانی لە بارەی بلیمەتی بۆ هاوتای ئەو دەدوێن بە شێوەیەك چەندان ئەفسانە لە هەڵکەوتوویی ئەو لەم هونەرەدا دەگێڕنەوە، ئەو بێ هیچ گومانێك بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی هونەری نیگارکێشانی ڕێنیسانس دادەنرێت.

ئەو لە شاری فلۆرەنسە لە دایك بووەو ژیانی هونەریی خۆی لە شاری ئاسیزی دەست پێ کردووە، کاتێ منداڵ بووەو شوانی مەڕ بووە چیمابۆی هونەرمەندی ناسیوە، ئەو دەمەی لەسەر دەستی ئەو دەبێتە قوتابی مامۆستاکەی بە زوویی ئاشنای توانای بێ وێنەی ئەو دەبێت تا لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ نەخشاندنی دیواری کەنیسەی (پیرۆزمەند فرەنسیس) لە شاری ئاسیزی کە لە بارەی ئەفسانەکانی ئەم پیرۆزمەندە کاریان کردووە، کاتێ مامۆستاکەی لە چوارەم کاردا کۆچی دوایی دەکات، جیۆتۆ بیست و چوار کارەکەی تر تەواو دەکات، ئەم نیگارانە بەرزیی هەر یەکێکیان سێ مەترە. لەلای چەپی دەروازەی گشتییەوە دیمەنێکی بەناوبانگ و تایبەت بەو پیرۆزمەندە هەیە کە تێیدا قسە لەگەڵ چۆلەکەکاندا دەکات. تەرزی ئەم کارە باڵایە بە خاڵێکی وەرچەرخان دادەنرێت لە نێوان هونەری ڕۆمانسکی و غووتی-دا. هەرچۆن هەندێ کاریگەریی مامۆستاکەی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام کارامەیی جیۆتۆ دەگاتە باڵاتر لە مامۆستاکەی ئەمەش لە دیزاینی گشتی کارەکەو پشتینەکانیدا دەردەکەوێت کە بە شێوەیەکی داهێنەرانە دروستی کردووە جیاواز لە شێوازی مامۆستاکەی. واتە گۆڕینی باکگراوندی ئاڵتوونی بێزەنتی بە دیمەنێکی سروشتی. ئەم گۆڕانکارییەش بۆ یەکەمین جار بووە لە تابلۆدا بکرێت. نموونەی ئەم کارە تابلۆی (پیرۆزمەند واز لە سامانەکەی دێنێت، فریسکۆ، ١٢٨٨-١٢٩٦) لە کەنیسەی شاری ئاسیزی.

گەر لە قۆناغی دووەمی کاری هونەری ئەم هونەرمەندە بدوێین ئەوا دەبێت بچینە شاری پادوا (Padua) لە کەنیسەی سکۆرڤنی کە لەوێ (٣٨) دیمەنی بە سێ بەش دروست کردووە بەشی یەکەم مێژووی ژیانی مریەم و باوکییەتی، بەشی ناوەڕاست ژیانی حەزرەتی عیسایە، بەشی خواروو بۆ ڕووداوی ئازاردان و مردنەکەیەتی، هەرچۆن لەسەر هاتنە ژوورگەکەیەوە نیگارێکی گەورەی ڕۆژی دوایین کێشراوە، وا دەگێڕنەوە شاعیری گەورەی بلیمەت دانتی سەردانی جیۆتۆی کردووە[٣] کاتێ خەریکی ئەم کارانە بووە هەرچۆن لەبەر سەرسامی ڕۆبەرت پاشا بە جیۆتۆ کە حاکمی ناپۆلی و فلۆرەنسا بووە ساڵی (١٣٣٤) دەیکاتە سەرپەرشتیاری کارە

ئەندازەییەکانی فلۆڕەنسا لە بیناسازیدا. ئەویش هەڵدەستێ بە بنیاتنانی تاوەری زەنگۆڵەکان لە کەنیسەی فلۆڕەنسا کە دواتر پەیکەرساز ئەندریا پیزانۆ نەخشاندوویەتی.

جیۆتۆ بە یەکەمین هونەرمەندێ دادەنرێت کە مرۆڤی بە جووڵەی ئاسایی خۆی دروست کردبێت هەرچۆن لە کێشانی جلوبەرگدا هەوڵی دروست کردنی ساوی ماددەکانی داوە و دەربڕینی واقیعییانەی سیمای دەموچاویانی مەبەست بووە. هەرچۆن گرنگیدانی بە درەخت و بەرد لە دیمەنی سروشتی پشتی فیگەرەکانیدا کەمتر نەبووە. لە کارکردنی لە کەسایەتییەکاندا.

جیۆتۆ لە شاری ئاسیزی ڕەنگەکانی بێزەنتی بوون، بەڵام لە شارەکانی فلۆڕەنسەو بادوا ئەم ڕەنگانە بوونە ڕەنگی غووتی، واتە زیاتر هەمەجۆر و گەش بوون، هونەرەکەی دەستی کرد بە قوتار بوون لە هونەری بێزەنتی و هەنگاونان بەرەو شێوازی سەردەمی ڕێنیسانس. هونەری ئەو کاریگەرییەکی قووڵی کردە سەر هونەری نیگارکێشان، لە دوای خۆی چەندان قوتابی بەجێهێشت کە هونەرەکەی لێوە فێربوون.

## قوتابخانەی سینا

لە ساتێکدا کە ناووناوبانگی جیۆتۆ پلەی یەکەمینی بۆ شاری فلۆڕەنسە سەندبوو لە نیگارکێشانی ئیتالی-ی سەدەی چواردەدا، لە شاری سینا قوتابخانەیەکی نیگارکێشان پەیدابوو کە ناوبانگی کەم نەبوو، هونەرمەندەکانی گەیشتنە پلەیەکی گەورە لە کەماڵ لە ڕێگەی کارهایەکەوە کە لێوان لێو بوو لە سۆز و خواناسی. ئەمەش لەژێر دەستی هونەرمەند دۆچیۆ-دا بەڕێوە دەچوو.

### نیگارکێش: دۆچیۆ (١٢٥٥-١٣١٩)

لە شاری سینا لە دایك بوو، سەر بە سەردەمێکی گۆڕان خوازە، لەژێر کاریگەریی بێزەنتیدا بووە، کارە بەناوبانگەکەی (گەورەیی یاخود باڵایی Maesta) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣٠٨)، شاری سینا داوایان لێکرد ئەم تابلۆیە دروست بکا بۆ دانانی لە کەنیسەی شاردا.

دۆچیۆ ئەم کارەی بە سێ ساڵ تەواو کرد کە لە ڕێیەوە نەمریی بە دەست هێنا، کاتێ تەواو بوو میللەت بە دڵ گەرمییەکی بەرزەوە لەرێ پێوانێکی مەزندا ساڵی (١٣١١) گواستیانەوە لە ئەتێلەکەی هونەرمەندەوە بۆ کەنیسەکە، تابلۆیەکی گەورەیە لە پێوانەدا، ئەم ئاسەوارە هونەرییە تا سەدەی هەژدە فەرامۆش کرابوو، بەڵام ئێستا لە مۆزەخانەی کەنیسەی سینایە[٤].

کارەکە لە دوو بەشی سەرەکی پێك هاتووە لە لایەکەوە وێنەی حەزرەتی مریەمە بە گەورەیی کە فریشتەو پیرۆزمەندەکان دەوریان داوە، لەلای تریەوەی دیمەنەکان لە ژیانی مەسیح وەرگیراون

ئازاردانی و هاتنە دەرەوەی لە گۆڕ، لە بەناوبانگترینی ئەم پارچانەو ناوازەترینیان لە خاچدانی مەسیحە کە هێندە وردەکاریی تێدا کراوە تا ڕاددەیەکی زۆر لە مینیاتۆر دەکات، بە جوانترین کارێك دادەنرێت کە هونەرمەند تێیدا بلیمەتیی خۆی وەك نوێگەرێك پیشان داوە.

## پەراوێزەکان:

١-ناوی هونەرمەندەکان. نەزانراوە وەك لە سەردەمی ڕۆمانسك تەنیا لە ئیتالیادا نەبێت کە دواتر ئاماژە بە ناوەکان دەکرێت.

٢-تێمپرا (Tempra) گوزارشتێکە بەو کارانە دەوترێت کە بە ڕەنگی تێکەڵاو بە ڕێژەیەك لە زەردێنەی هێلکە جێبەجێ دەکرێت.

٣-نووسەر و ئەدیبی گەورە بۆکاشیۆ ساڵی (١٤٥٠) لە سەری نووسیوە و دەڵێت: (جیۆتۆ ئەو هونەرەی گێڕایەوە نێو ڕووناکی کە بۆ چەندان نەوە خرابووە ژێر گڵ) هەرچۆن بەترارك بە سەرسامییەوە لەسەر بەرهەمەکانی نیگارکێشانی نووسیوە.

٤-بەشەکانی ئەم تابلۆیە ئێستا دابەش بووە بەسەر کەنیسەی سیناو مۆزەی میللی لە لەندەن و مۆزەی نیۆیۆرك و مۆزەی میللی لە واشنتن.

## سەرچاوەکان:


١-محيط الفنون/ مجموعة من الاساتذة- الفن القوطي، الاستاذ حنا سميكه، دار المعارف بمصر.

٢-معنى الفن/ هربرت ريد- ترجمة سامي خشبة، مراجعة مصطفى حبيب. دار الشؤون الثقافية العامة- ط٢-١٩٨٦.

٣-فنون الغرب في العصور الوسطى و النهضة و الباروك، نعمت إسماعيل علام- دار المعارف بمصر ١٩٧٦.

٤-النحت الحديث/ هربرت ريد. ترجمة فخري خليل- مراجعة جبرا إبراهيم جبرا- دار المأمون بغداد ١٩٩٤.

# هونەری سەرەتای ڕێنیسانس (کوانترۆشینتۆ) سەدەی پانزەهەم ١٤٠٠-١٥٠٠

**(خوداتان خۆشبوێت لە ڕێی خۆشویستنی ئافەریدەکراوەکانی کە هەرچی زیاتر نزیکن لە واقعەوە).**
**پیرۆزمەند فرانسوا ئاسیزی**

ئەمە بانگەوازی سەردەمێکە کە مێژوونووسەکان کۆك نین دەربارەی سەرەتاو سەرهەڵدانی کە ئەویش سەردەمی بوژانەوە یاخود ژیانەوە یا لە دایك بوونەوەی نوێیە. گەر بێتوو زاراوە بنەڕەتییەکەی بەکاربهێنین (Renaissance) ڕێنیسانس دیاریکراوتر دەبێت[1]. مەبەست لەم زاراوەیە گەڕانەوە نییە بۆ شارستانیەتی ڕابوردوی کلاسیکی، بە شێوەیەکی نوێ، بەڵکو مەبەست دۆزینەوەی مرۆڤە بۆ مەدەنیەتی جیهانی کۆن و سودلێوەرگرتنیەتی بەپێی گونجاندن لەگەڵ پێداویستی ژیانی نوێ. لێرەدا مەبەست لە شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانییەو بیروباوەڕی ئەوانە دەربارەی مرۆڤ وەك بەهاو پێگەی ئەو لە ژیان و کۆمەڵ دا.

هەندێ لە مێژوونووسەکان ساڵی ١٤٥٣ –واتە ساڵی کەوتنی قوستەنتەنیە، و ساڵی کۆتایی جەنگی سەدساڵە- بە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان سەدەکانی ناوەڕاست[2] و سەردەمی نوێ دادەنێن. هەڵبەتە گۆڕانکارییەکان بەبێ پێشینەو ڕەگ و ڕیشەنین کە سەرەتایان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەم، هەرچۆن دەبینین سەدەکانی ناوەڕاست لە هەندێ وڵاتی ئەوروپیدا درێژ دەبێتەوە تا سەدەی حەڤدەهەم. ئەمە بێلەوەی هەندێ لە بیرمەندان سەرەتای ڕێنیسانس لە ئەوروپادا دەگێڕێتەوە بۆ سەدەی دوانزەهەم ئەو ساتەی هونەری غوتی لە فەڕەنسادا سەری هەڵدا. بە پێچەوانەی ئەمەوە هەندێکی تر خاڵی وەرچەرخانی ڕاستەقینە بۆ سەردەمی نوێ بەو ساتەوەختە دەزانن کە سەرەتای بزاڤی ڕۆشنگەرایی و پیشەسازی و دەرکەوتنی بیرۆکەی پێشکەوتنە، واتە لە دەستپێکی سەدەی هەژدەدا.

ئەورووپای سەدەی پانزە بە بۆنەی پتەوی ڕژێمی دەرەبەگایەتی لە لایەك بە هۆی بلاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە لایەکی تریش بە هۆی هاوسەنگی و هاوئاهەنگی نێوان دەسەڵاتی ئاینی لە ڕۆما و دەسەڵاتی کاتی لە سەروو ببوە یەکەیەکی شارستانی یەکگرتوو. ئەم

شارستانیەتەش بە لوتکەی گەیشت لە دوو سەدەی دواتردا، زانکۆ ئەوروپی‌یەکانی وەك -شارتر و پاریس و ئۆکسفۆرد- کاریان هاوڕێکی کردن بوو (پشت بە فەلسەفەی قوتابخانەگەرایی) لە نێوان ئاوەزو باوەڕدا. لەم میانەدا بوو پیرۆزمەند برنار لە سەرەتای سەدەی دوانزەو پیرۆزمەند فرانسوا ئاسیزی لە سەرەتای سەدەی سیانزە کاریان کرد بۆ هەرچی توندوتۆڵ کردنەوەی خۆشەویستی ئاسمانی و پەیوەستی زیاتری نێوان یەزدان و گەردون و مرۆڤ.

بەڵام یەکگرتویی و پتەوی ڕژێمی دەرەبەگایەتی تا کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست بڕی کرد بەرەنجامی تێك چونی میانی دەسەڵاتی دنیایی و ئاینی واتە کێشەی نێوان ئیمپراتۆرو پاپا. تەنانەت دوبەرەکی نێوان کەنیسەی کاسۆلیکی خۆیان و نەش و نما کردنی پەیوەندی سەرمایەداری نوێ، کە بووە هۆی بنچینەیی بۆ لاواز و گەندەڵ بوونی بنکە ئابوری‌یەکەی. کۆمەڵێکیش هەروەك تامەزرۆی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یە نوێکان بوون، ڤێزیشیان لە پەیوەندی‌یە کۆنەکان دەهاتەوە. هەرچەندە سەرەتای پرۆسێسی ئەم گۆڕان و گەشەکردنە بە سستی دەستی پێکرد، بەڵام ساڵ لە دوای ساڵ تا دەهات هەنگاوی گورج تری دەنا.

کەڵەکەبوونی سەرمایە بە خێرایی‌یەکی ئەوتۆ کە نە مێژوو تا ئەو کاتە بە خۆیەوە دی بوو نە هیچ بستێکی تری سەر ڕووی زەمین دەیتوانی شان لە شانی بدات. ڕاستەوخۆ بووە هۆی پێشکەوتنی سامانی مادی لە وڵاتانی ئەوروپادا. هەر ئەم پێشکەوتنە مادی‌یە و ژیان هاتنەوە بە بەر ئابوری دارایی‌دا لە کۆتایی سەدەی دوانزەدا بووە هۆی بە دەرکەوتنی شاری نوێ وەك سەنتەری شارستانی. ئەمە دانانی هێڵی جیاکەرەوەیە لە نێوان نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا. پەرەسەندنی ئەم شارانە لە سەدەکانی چواردەهەمدا بە یەکجارەکی جێی خۆیان گرت و پاریس کە تا ئەوکاتە تاکە پێگەی سەرەکی شارستانیەتی ئەوروپی و غوتی بوو ئەو توانا و پلەیەی لە دەست دا بەرەنجامی هیلاکی شەڕی سەدساڵە لە لایەك و پەیدابوونی زانکۆکانی تر لە ئەوروپادا لە لایەکی تر وەك زانکۆی -براج و کراکوفیا و ڤیینا- لەو شارانەش کە توانییان دەرکەوتنی شارستانی بۆ خۆیان بە دەست بێنن وەك شارە بازرگانی‌یەکانی ئیتالیا بە تایبەت بیزا و فلۆرەنسا و سینا، ئەمە بێ لە شارە فلمنکی‌یەکان بە تایبەت بروج و جان.

پێش ئەوەی بێینە سەر هۆکاری گۆڕانکاریەکان چ ئەو هۆکارانە بێت کە بە ئاشکرا کاریگەریان کردووە یاخود ئەو هۆکارانەی بە نهێنی و نادیاری (کە ڕەنگە لە هۆکارە دیار و ئاشکراکانی زیاتر ڕۆڵیان هەبێت) کاریان کردووە دەبێت ئاماژە بەوە بدەین بەرەنجامی ئەم گۆڕانکاریانە ئەوروپای‌یەکان جڵەوی شارستانیەتیان لە دەست گەلانی ڕۆژهەڵات وەرگرت و

کەوتە دەست خۆیان. هەرچەندە هۆکاری ئـەو گۆڕانکاریـە شارسـتانیيە گەورانـەی نێـو مێـژوو زۆرجار ئاڵۆز و بگرە هەندێ جاریش دژ بە یەکن، بەڵام گەر سەیری ڕێنیسـانس بکـەین و ئـەو نزیك بوونەوەیە لە سروشت و جیهانی مرۆڤ هەست پێ دەکەین. ئەوکات دەتوانین بە لایـەنی کەمەوە ئاماژە بە چوار هۆکار بدەین کە هاوکاریی ئەم پەرەسەندنەیان کردووە:

**یەکەم**- دەگەڕێتـەوە بـۆ خـودی هونـەر خـۆی: تێبینـی ئـەو نزیـك بوونەوەیـە دەکـەین کـە هونەری ئەورووپی لە دو سەدەی پێشتردا بە دەستی هێنا لە هەردوو بواری پەیکەرسازی غوتیو نیگارکێشانی ئیتالی لە سەردەمی جیۆتۆوە بەرەو شێوەی سروشتی. بە جۆرێك سەرسام دەبـین کـە هونەرمـەندانی سـەدەی پـانزە دەبینـین نـازانین بەرهەمـەکانیان سـەر بـە شارسـتانیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بدەین لە قەڵەم یاخود سـەر بـە ڕێنیسـانس کـە هێشـتا لـە لانکـەدا بـووە؟ جیاوازییەکان هێند کەمە ستەمە جیاکردنەوەی.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بە هونەری (کورتوازی)[٣] (Courtois) بدەین لە میانی سـاڵانی ١٣٧٥ و ١٤٢٥دا کە لە زۆربـەی وڵاتـانی ئـەورووپادا شـێوازی ئـەم کارکردنـە بڵاوبـوو (بـە تایبـەتی باکووری ئیتالیا) پێی دەوترا شێوازی کورتوازی یاخود هونەری تەختی پاشایەتی (فن البلاط) یا هونەری نێوکۆشکەکان، ئەم شێوازە هەر لە بریتانیاوە تاسـقلیەو لـە ئیسـپانیاوە تابوهیمیـای گرتبۆوە، سەرەڕای نزیکی لە وێنەی سروشتەوە بابەتە ئاینی و نائاینییەکانیشی لەخۆ گرتبـوو وەك دیمەنی ڕاوشکار و سەما و ژیانی کۆشـکەکان، بـە ڕازاوەیـی و ناسـکی ڕەنگـەکانی و نـەرمی هێڵەکانی کە ڕێك و چەماوە بـوون زیـاتر هونـەری فارسـیمان بیردەهێنێتـەوە، ئـەم شـێوازە کـە زیاتر بۆ کـاری مینیـاتۆری و دەسـت نووسـەکان و قـەراغی دیوارەکـان بـەکاردەهات کاریگـەریی خۆی لە هونەرمەندانی سەدەی پانزە کردبوو.

**دووەم**- دەگەڕێتەوە بۆ بیری ڕۆحانی نوێ کە هەردوو پیرۆزمەند برنار و فرانسـوا ئاسـیزی بڵاویان دەکردەوە، بە تایبەت دوهـەمیان لـە سـەدەی سیانزەدا کـە پیرۆزمـەندێکی شـاعیر بـوو، بەسەر هەموو شتێکی سروشتدا دەیگووت هـەر لـە ئاسمـان و ئەسـتێرە و بـاڵندە و گیانـەوەر و گـوڵ و گیـاوە، بـەو هەنجەتـەی ئەمانـە گشت نیعمـەتێکی خودایـە بـۆ مـرۆڤ، ئەمـەش چـاوی هونەرمەندەکانی لە بەرامبەر سروشتدا کردەوە کە پێشتر لەژێر دروشمی (سروشـت جیـهانێکی بێگیانە) هونەرمەند بێ ئاگابوو لەو جوانییە دەوڵەمـەندە و تەنـها بـە هێما لاهوتییەکانـەوە خەریك بوو، لەو ساتەوە کە دەروازەی سروشت بۆ هونەرمەند ئاوەڵا بـوو ئاسمـانی شـین جێی ئەو پشتێنە ئاڵتونییەی گرتەوە کە هێمایەك بوو بۆ ڕووناکی خودایی.

بەرەنجامی دەرکەوتنی چیاو درەخت و ئاوو گیانەوەر و باڵندە بە شێوە ئاسایییەکەی خۆیان لە بەرهەمی هونەریدا شێوازێکی سەیر لە هونەردا هاتەکایەوە، کە هەندێ لە رەخنەگران ناوی دەنێن (سروشت گەرای ڕۆحانی) (الناتورالیة الروحانیة). کە بە ڕوونی لە کارەکانی ستیڤانۆ دازیفیۆ و لۆرنزیتۆ و فرائەنجلیکۆی ئیتالیدا دەرئەکەوێت و هەرچۆن لە کارەکانی قوتابخانەی فەرەنسی فلمنکیدا کە لە بۆرجۆنیا سەری هەڵدا بەدەرکەوت.

بەم شێوەیە هونەرمەندی ڕۆژئاوایی -لە ڕێگەی ڕوحانیەتەوە- گەڕایەوە سەر ئەو لاسایی سروشتەی شارستانیەتە بێئاینەکانی پێشوو. بەڵام ئەمان بە ئاسانتر و لە ڕێی ئامێر و شمەکی تازەترەوە -وەك بۆیەی زەیتی- کە سروشت بەخشینەکە ساناترو خێراتر دەکات. بەڵام ئەم خاڵە واتە خاڵی دووەم هەندێ لە مێژوونووسان و بیریاران ئەو هێز و کاریگەرییەی پێ نابەخشن و بە بیانوویەکی دەزانن بۆ بێهێزکردنی کاریگەری شارستانیەتی کلاسیکی[٤].

**سێهەم**- لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاری و پەرەسەندنانەی بەسەر فەلسەفەی قوتابخانەگەرایدا هات -کە ڕۆڵی خۆرهەلات بە ڕوونی تیا دەرئەکەوێت- ئەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پێی دەوترا واقعیەت -خۆی لە ئایدیالیەت نزیك بوو- نزیك بوونەوەیەکی ڕاستەقینە لە واقعیەت نزیك بۆوە بە بانگەوازی هەندێ لە فەیلەسوفەکان بە تایبەت ڕۆجیر بیکۆن و ولیەم ئاکامی بۆ پشت بەستن بە هەست و ئەزموون کە ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە زانین، ئەمەش بووە هۆی جۆرێك لە دابڕانی ئاوەز و ئیمان، ئاوەز گۆڕەپانی خۆی هەبوو، باوەڕ یاخود ئیمانیش گۆڕەپانی خۆی. بەمەش ئاوەز لە دەسەڵاتی کهنوتی دەرباز بوو. بەڵام تێبینی دەکەین ئەفلاتونیزم لە ناو نەچوو بەڵکو گۆڕرا لە ڕێنیسانسدا. هەربۆیە کۆتاییەکانی سەدەی پانزە سەرکەوتنی ئەفلاتونیزمی نوێی بەخۆوە دی.

**چوارهەم**- کە لای هەندێ بە گرنگترین هۆکار دەژمێررێت دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و چونە سەرەوەی چینی بۆرجوازی، کە لە گەورە بازرگان و خاوەن بانك و کارگەکاندا خۆی دەنوێنێت. بۆرجوازیەت هەر بە سروشتی کارەکەی و سەرقاڵی مادی خواستی واقعیە و حەز بە خۆشی هەستی دەکات (واتە خۆشییە دنیاییەکان). هزری لەسەر ئاوەزو ئەزموون بنیات دەنێت. بەڵام ئەم چینە بە هەوڵ و سەرسامی بۆ توێژی ئۆرستۆکراتی، کۆمەڵێ ڕێسای لەخۆ دەگرت کە شتێك لە ڕۆحی سوارچاکی و نمونەیی بوونی تیا بەرجەستە دەبوو، ئەم تێکەڵە سەیرە لە واقعیەت و ئایدیالیەت، لە مادیی و ڕۆحانی، لە سیما هەرە دیارەکانی ئەو سەردەمە بوو. ئەم خاڵەو خاڵی یەکەم زۆر لەمە زیاتر هەڵدەگرێت دواتر بە درێژی دێینە سەر ڕەهەندەکانی کاریگەریی ئەم دوولایەنە. چون کاریگەری جیۆتۆ لەسەر

هونەرمەندانی ئیتالی سەرجەم کاریگەرییەك بووە کەس نەیتوانیوە لە سنوری دەرچێت، دیارە خواستی نزیك بوونەوە لە سروشت لەلای جیۆتۆ بەرەنجامی ڕۆڵی هونەری یۆنانی و ڕۆمانییەو کاریگەرییانە لەسەر ئیتالیا تا سەدەی پانزە و لاوازی دەسەلاتی غوتی بووە لەو ولاتەدا، ئەمە بێ لەوەی کاریگەری هونەری بێزەنتی بە گشتی لە ئەورووپای ڕۆژهەلات زیاتر بەدەرئەکەوێت و کاریگەری هونەری غووتی لە ئەورووپای خۆرئاوا. ئیتالیاش سەرەتای سەدەی پانزە کە بە ئیتالی پێی دەوترێت کوانترۆشنتۆ Quatrocento یاخود چوار سەدەکان (بە تایبەت فلۆرەنسا) ئازادبوو لە زالی تەرزی بێزەنتی واتە تا ئەوکاتە کاریگەری هونەری بێزەنتی لە ئیتالیادا بەرچاو بووە. ئەو ماوەیەش ماوەی کارکردنی جیۆتۆ بووە، لە دوا ئەم ماوەیەوە کاریگەری هونەری غوتی دەست پێدەکات، بەلام بە درێژایی ئەم ماوانە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری کلاسیکی بەردەوام بووە، کاریگەری هەردوو هونەری بێزەنتی و غوتی بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست بەردەوام بووە. هەرچەندە هێندەی تەرزی هونەری بێزەنتی بە هونەرێکی مەسیحی دادەنرێت هێندە تەرزی غوتی ناچێتە ئەو ئاستەوە بگرە تا ئێستا هەندێ مێژوونووس سەیریان لێ دێت کە مەسیحیەت بە تایبەت لە ئیتالیا کە بنکەی پاپایە هونەری غوتی گرتە خۆی چونکە ئەم تەرزە مەسیحی نییە بەلکو تەرزێکی بیناسازییە زیاتر خێلە بێباوەڕە بەربەرییەکانی نێوەندو سەروی ئەورووپا لەگەڵ خۆیاندا هێنایان ئەو دەمەی هێرشیان دەهێنایە سەر نێوەند و ژوروی ئیتالیا.

هەمیشە بڕیار بۆ پیاوانی ئاینی بوو لە جێبەجێکردنی تەرزی بیناسازی کەنیسەکاندا و ئەندازیارەکانیش نەیان دەتوانی لەژێر یاساو ڕێساکانی ئەوان دەرچن هەر بەم شێوەیە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هونەر دیلی دەستی پیاوانی کەنیسە بوو.

لە لایەکی تریش دەرەبەگ و خاوەن زەوی و زارەکانیش کۆشکەکانیان سەخت بنیات ئەنا هەروەك قەلایەك تا بیان پارێزێت لە ڕق و تووڕەیی جوتیاران و هەژاران، زۆرێك لە جوتیاران بەرەنجامی زوڵم و زۆری فەرمانڕەوا و دەرەبەگەکان هەڵهاتن و ڕوویان لە شارەکان کرد کە لەوێ بەکاری پیشەسازی دەستی و بازرگانییەوە خەریك بوون زوو بە زوو گوزەرانیان گۆڕڕاو ڕوو لە باش بوون بوو، هێزێکی نوێی خاوەن کاریگەریان لەسەر ژیان پێك هێناو حەزیان بە هەموو شتێکی نوێ دەکرد چون خۆیان زۆریان چەشتبوو بەرەنجامی ڕێسا باوو کۆنەکان، لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم چینە نوێیە جۆرێك هەوڵدان و خواستی گۆڕان و دەرچوون لە چوارچێوە کۆنەکەی ژیان بەدەرکەوت. بۆ ئەم مەبەستە بانگەواز بۆ گەڕانەوە بۆ کلتوری کۆن

لە سەرچاوە بنەڕەتی‌یەکەیەوە دەست بەکار بوو ئەویش لەو ئاسەوارە هزریی و شیعریی و هونەرییەدا کە یۆنان و ڕۆمانەکان بەجێیان هێشتبوو، واتە ڕۆشنبیری کلاسیکی.

بەڵام ئەم ئاسەوارانە لە کوێ بوون؟

بەشی زۆریان لە دێرو کەنیسەکاندا دەستیان بەسەرا گیرابوو، تا دواتر کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرو شاعیری گەورەی وەك بترارك و بۆکاشیۆ.. هتد پشت بە خێزان و بنەماڵە[٥] پێشکەوتن خوازەکانی چینی ناوەند (وەك خێزانی میدتشی) ئەم ئاسەوارانەیان دەرهێناو لێیان توێژینەوە و ئەو دەستنووسانەش کە بە لاتینی نووسرابوون وەریانگێڕانە سەر زمانی نەتەوەیی. کارەکە بەوەندەوە نەوەستا بەڵکو نێرراوی تایبەت دەنێررا بۆ هێنانی دەستنووس لە یۆنان و جێگەی تر، وەرگێڕی تایبەتی بۆ دانرابوو تا وەریان گێڕنە سەر ئیتالی. سنوری ئەم جوڵەیە ئاسەواری ڕۆمانیشی گرتەوە لە هونەر و ئەدەب دا. فلۆرەنسا پێگەی یەکەم بروسکەی دەستپێکی سەردەمی ڕێنیسانس بوو بەو پەرەسەندنە گشت گیرییەی لە زانست و هونەردا ڕوویدا تیایدا بە تایبەت لە سەردەمی فەرمان ڕەوایی (کۆزیمو) و (لورینزۆ) کە لە دوو مەزنترین پیاوانی خێزانی میدتشی بوون.

ئەم دوو پیاوە پارەیەکی باشیان خەرج دەکرد لە پێناو کڕینی دەستنووسە یۆنانی و عەرەبی‌یەکاندا، هەرچۆن بەردەوام لە پێشوازی گەرمی ئەو هونەرمەند و ئەدیب و زانایانەدا بوون کە دەهاتنە فلۆرەنسا لە قوستەنتەنیەو ئەندەلوسەوە و زیاترین پێشوازی و خزمەتیان دەکردن. ئەمە سەرباری ئەو کتێبخانەو زانکۆیانەی دایان مەزراندن. بەم شێوەیە لە سەدەی چواردەهەم و پانزەهەمدا شاری فلۆرەنسا بووە مەڵبەندی هەموو جموجوڵێك و ناودارترین پێشەواکانیشی خەڵکی ئەو شارە بوون و جێ خۆی بووە کە ناوی پایتەختی ڕێنیسانسی لێ بنرێ و فلۆرەنسا لە سایەی ئەو دوو پیاوەدا بە ئەسینا ئەچوێندرا لە سەردەمی زێڕینیدا[٦].

لە دوای ئەوەش کە کڵێسا هەستی بە تواناو هێزی ئەو گۆڕانکاریانە کرد، چیتر نەیتوانی ئەم ئاڕاستە نوێیە کە سەراپا خەڵکی ئیتالیای بە تایبەتی و ئەورووپای ڕۆژئاوای بە گشتی گرتبۆوە فەرامۆش بکات، چونکە لەوە دەترسا نەبا وردە وردە کۆمەڵ لە کەنیسەو ڕۆما بتەکێتەوە و چیتر ڕۆڵی خۆیان بدۆڕێنن بۆ ئەم مەبەستە چەند پاپایەك دەستیان کردە خۆ نزیك کردنەوە لە بیروباوەڕی نوێ کە بە (هیومانیزم)[٧] ناسراو بوو. لە نزیکەوە پەیوەندییان بە هیومانیستەکانەوە پەیدا کرد. نیکۆلای پێنجەم یەکێك بوو لەو پاپایانە کە هەرگیز هیچ دژایەتی‌یەکی لەوەدا نەدەبینی بایەخ بە کەلتوری بەر لە زاین بدرێت و لە هەمان کاتیشدا دڵسۆزی ئاینی مەسیحی بن. بە پێچەوانەوە ئەو دەیویست بە هۆی ئاین و لایەنە چاکەکانی

شارستانیەتی کۆنەوە سەرلەنوێ ڕۆما بکاتەوە بە پایتەختی جیهانی مەسیحی. بۆیە ناکرێت هەوڵەکانی ئەم پاپایە (نیکۆلای پێنجەم) بۆ گەڕان بە دوای دەستنووسە کۆنەکاندا فەراهەم بکەین کە بوونە هۆی هێندەی تر دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی ڤاتیکان، کە دەستنووسی فەیلەسوفە عەرەب و ئیسلامیەکان لە پاڵ دانراوەکانی هیرۆدۆت و دەستنووسە یۆنانی و ڕۆمانە کۆنەکاندا دانرابوون تیایدا.

بەدیارکەوتنی ڕوحی نوێ و گۆڕانکاریەکانی لەسەر کەنیسەو پیاوانی ئاینی لە سەردەمی پاپا (لیۆی دەهەم)دا کە لە بنەماڵەی میدتشی بوو چووبوە سەر عەرشی پاپویەت لە ڕۆما زیاتر هەست پێدەکرێت، گرنگی دانی دنیایی ئەم پیاوە لە دروست کردنی هەزاران خانوو بۆ نیشتەجێ بوونی دانیشتوان و دامەزراندنی زانکۆ و خەرج کردنی پارەیەکی زۆر تێداو دامەزراندنی کتێبخانەی ڤاتیکان بە پەیداکردنی هەموو دەستنووس و دانراوە بە بەهاکانیەوە لە ڕۆما دەردەکەوێت.

جارجارێك لە ڕیزی پیاوانی ئاینیەوە[٨] نارەزایی بەرز دەبووەوە کە سۆزی هەندێ کەسیان لەناو جەماوەردا بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا بەڵام تەوژمی ڕێنیسانس و گۆڕانکاری‌یەکانی هێند بە گوڕ بوو کەسانێکی وەها کەم هیچیان پێ نەکرێت لە بەرامبەریدا. فراوان بوون و تەوژمی ڕێنیسانس لە ئیتالیاوە بە زوویی پەڕیەوە بەرەو وڵاتانی ئەوروپا (بە تایبەت ئەوروپای ڕۆژئاوا). دەکرێت بڵێین سەرەتای ڕێنیسانس ئیتالیەو پێگەیشتن و کامڵ بوونیشی ئەوروپی‌یە، ئەمە گەر بە شێوەیەکی تایبەتی لێی برووانین بەڵام گەر بە شێوەیەکی گشتی تەماشابکەین و ڕۆڵی شارستانیەتەکانی تری جیهان (بە تایبەت ڕۆژهەڵات) فەرامۆش نەکەین ئەوا دەکرێت بڵێین ڕێنیسانس دەسکەوتی ڕەنج و کۆششی ئەوروپایە لە چوارچێوە تەسکەکەیدا و هی هەموو جیهانە لە چوارچێوە فراوانەکەیدا. لێرەدا ئەبێت ئەوە لە یاد نەکەین کە بە هاتنی ڕێنیسانس کۆتایی هات بە سەردەمی شارستانیەتەکان، چیتر میللەتێ نەما خۆی بە تەنها خاوەنی شارستانیەتێك بێت وەك شارستانیەتی مسیۆپۆتامیا، دۆڵی نیل یاخود یۆنانی و ڕۆمانی، بە شارستانیەتی ئیسلامی کە باڵی بەسەر سەدەکانی ناوەڕاستدا کێشابوو دوایی هێنرا بە سەردەمی شارستانیەتەکان. چیتر سەنتەری شارستانیەتەکان زیادیان کرد و هەمەجۆر بوون و هاوسەردەم، کاریان تێدەکراو کاریگەریشیان دەکرد لە هەمان کاتدا، ڕاستە وەك وتمان ڕێنیسانس سەرەتاکانی لە ئیتالیاوە سەرچاوەیان گرت بەڵام هەموو ئەوروپا پێکەوە لە پێگەیاندنیا ڕۆڵی تایبەت و جیاوازی خۆیان گێڕا بەدەر لەوەی ڕەگەزێکی هاوبەش هەموو دیاردەکانی ڕێنیسانسی لەسەر پاکی وڵاتە ئەوروپیە جیاجیاکاندا بە یەکترەوە

گرێدابوو، بەڵام هەر وڵاتە بە هۆی باری خودی خۆیەوە پێویستی بەوە دەکرد پێ لەسەر دیاردەیەکی تایبەتی دابگرێ و سیما و تایبەتمەندێتی خۆی بپارێزێ بۆ نمونە ڕێنیسانس لە ئەڵمانیادا چووە قاڵبێکی قووڵی فیکرییەوەو ڕاستەوخۆ لە مەسەلەکانی کڵێسەی کاتۆلیکییان دەکۆڵییەوە تا کاری لە بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینیش کرد لە کۆتاییدا[٩]. بەڵام فەرەنسییەکان بە تایبەتی ڕوویان کردە لێکۆڵینەوەی یاسای ڕۆمانی کۆن، ئەمەش بۆ ئەوکاتە دەست پێشخەرییەکی گرنگ بوو. ئەنجامیش زەمینەیەکی لە باری بۆ گەشەکردنی لێکۆڵینەوەی یاسایی لە فەرەنسادا ڕەخساند[١٠]. کەچی بیروباوەڕی ڕێنیسانس لە ئینگلستاندا لە زەمینەی فەلسەفەو ئیستاتیکادا ڕەگی داکوتاو بە ئاشکرا لە بواری ئەدەب و سۆسیۆلۆژیاو شانۆدا گوزارشتی لەخۆی کرد.

لە سایەی ئەم گورجوگۆڵی و چالاکی و بایەخ پێدانەدا بە سەرچاوە بنەڕەتی و هەمەجۆرەکان خواستی مرۆڤایەتی نوێ سەری هەڵداو هاتەپێش، کە هەر ئەم هۆکارەش بووە مایەی گۆڕینی ڕێڕەوی ژیان و هونەر بۆ چەندان سەدەی تر. لە چونە پێشەوەی ئەم بزاڤەدا لایەنگیریی جۆرە بیروباوەڕێك یاخود هزرێکی دیاریکراو نەدەکرا، بەڵکو هەموو بیروباوەڕ و هزرێك بە گیانێکی کراوە پێشوازی لێدەکرا. تەنها تەرازوییەك کە پشتی پێ ببەسترێ بۆ بە چاك زانین و بە خراپ زانین و هەڵسەنگاندن تەنها ئاوەز بوو، هەموو ئەو سامانە ڕۆحانییەی زیندو کرایەوە و هێنرایەوە نێو ژیان دەدرا لە سەنگی ئاوەز. ڕەتکردنەوەوپەسەندکردنیش هەر لەم ڕێگەیەوە بوو. چیتر شتێکی (پیرۆز) نەما، هەرچۆن هیچ ڕێسایەك نەبوو بسەپێنرێت بەسەر ئاوەز و ڕۆحی مرۆڤدا. مرۆڤ خۆی بووە هەموو شتێ، بووە بنەما و خولگە. ئەمانە گشت لە بەدواداچونی ئەو زانستانەدا ڕەنگی دایەوە کە دەربارەی مرۆڤە. هەرچۆن ماناکانی ئەم بزاڤە لە ئەفراندنە هونەرییەکانی مرۆڤی ئەو ساتەدا پێچەوانە بۆوە و بە شێوەیەکی بەرچاو و دیار کاری تێکرد.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد بە هاتنی سەردەمی ڕێنیسانس کۆتایی هات بە سەردەمی شارستانیەتەکان ئەمەش زەنگی گۆڕانکارییەکی گشتی بوو کە تیایدا میللەتێ دوا ئەکەوێت و میللەتێ پێشئەکەوێت. بەڵام لە ماوەیەکی کورتی دواترا لە ڕێڕەوێکی گشتیدا یەکدەگرنەوە. کە دەڵێین سەردەمی شارستانیەتەکان ئاوابوو دەتوانین بڵێین مرۆڤایەتی پێی نایە چوارچێوەیەکی نوێوە کە دەکرێت بە چوارچێوەی ڕێبازەکان ناوزەدی بکەین. یاخود سەردەمی ڕێبازەکان. واتە چیتر دەربارەی شارستانیەتی میسری و چینی و هندی و نمونەی ئەمانە لە سارشتانیەتەکانی میللەتان نابیستین، بەڵکو (بارۆك) و (ڕۆکۆکۆ) و (کلاسیك) و

(ڕۆمانتیك) دەبیستین. كە ئەمانەو هی تریش ڕێبازگەلێكن تایبەتمەندنین بە میللەتێكەوە، گەر لە سەرەتاشدا لای میللەتێك لە میللەتان گەشەی سەندبێت.

## پۆلاندنێك لە بەر ڕۆشنایی ئەم گۆڕانكاریەدا:

لەبەرئەوەی ئەو گۆڕانكاریەی ئاماژەمان پێدا مانایەكی تایبەتی هەیە بۆ مێژووی مرۆڤ لە پەیوەندیدا بە بیركردنەوەی ئاینی و بە كۆمەڵگەوە، لە واقعدا ئێمە دەتوانین لەم وێناكردنەوە سێ قۆناغی گەورەی سەرەكی لە ژیانی مرۆڤدا بدۆزینەوە، كە زادەی پێچەوانەكردنەوەی بەرهەمی ڕۆحانی و هزریەتی لە سەردەمی شارستانیەتەكان و ئەو سەردەمانەدا كە دواتر دێن.

## قۆناغی یەكەم: قۆناغی كۆمەڵیی

قۆناغی كۆمەڵی بەو كاتانە دەژمێررێت كە مرۆڤ تیایدا زۆر پابەندی كۆمەڵ و بیروباوەڕە ڕۆحانی و بەها كۆمەڵایەتییەكانی بووە. هەموو چالاكییەكانی خستۆتە گەڕ لە پێناو كۆمەڵەكەیدا، هەمیشە جەختی لە باوەڕبوونی خۆی بەو بیروباوەڕوو بەهایانە كردۆتەوە پێی. هونەر لەم سەردەمانەدا ئەو ئەركانەی بەجێهێناوە كە هاوبەش بوونی ئەو لە ژیانی كۆمەڵدا سەپاندویەتی بەسەریدا. لێرەوە هونەرمەند دەستبەرداری خودی خۆی بووە، بەكارە هونەرییەكانی ئامانجی بەدیهێنانی پێگەیەك و نەمریی نەبووە بۆ خودی خۆی وەك تاكێك، بەڵكو بە سیفەتی كارەكەرێك و خزمەتكارێكی كۆمەڵەكەی لەكاردا بووە. زۆرجار هونەرمەند لەم سەردەمەدا ناوی خۆی تۆمار نەكردووە لەسەر ئەو بەرهەم و كارانەی دروستی كردوون، واتە ئیمزای لە كارە هونەرییەكانی نەداوە، چون ئەو كارە هونەرییەی ئەنجامی داوە هێندەی بە ئەركێكی ئاینی و كۆمەڵایەتی سەرشانی خۆی زانیوە هێندە بە كارێكی هونەریی خاوەن بەهای جوانی تێی نەگەیشتووە. وەك بە ڕوونی بەدەرئەكەوێت لەلای هونەرمەندە میسرییە كۆنەكان. هەستی كردووە بە ئەركێكی خۆی هەڵدەستێت لە ژیاندا وەك هەر كەسێكی تر. دیسان وەك لە بەسەرهات و شیعرە میللییەكاندا دەیبینین، تەنانەت شاكارە مەزنەكانی ئەم سەردەمانە هەمان شتیان بەسەردا پیادە دەبێت. بۆ نمونە وا لێكدراوەتەوە كە (هۆمیرۆس) نووسەرو دانەری ئەلیادە نییە بە ڕاستی و بە مانای نووسەر و دانەری بەڵكو كۆكەرەوەی بووە لەو سرودانەوە كە میللەت خاوەنی بووە و هەمیشە وتویانەتەوە. هەمان شێوە لە ئەدەبی میللی هەموو گەلێكدا هەیە هەر لە گۆرانی و شیعر و بەسەرهات و كاری شێوەكاریی سنعەتی و میللیو.. هتد.

بەم شێوەیە دەبینین مرۆڤ لە سایەی ئەم کۆمەڵیە کۆنەدا یەکەم جار و دواجار هونەرەکەی لە پێناو کۆمەڵدا بنیات دەنێت. ئەم قۆناغە لە دوای یۆنان و ڕۆمان لە ئەوروپادا تا سەرەتای ڕێنیسانس بەردەوام بووە.

## قۆناغی دوهەم: قۆناغی مرۆڤ

لەم قۆناغەدا بیرۆکەی کۆمەڵ لادەچێت و تا بیروباوەڕێکی تر جێی بگرێتەوە کە ئەویش "بیروباوەڕی مرۆڤە" ساتێ دەڵێین بیروباوەڕی مرۆڤ مەبەست لە باوەڕهێنان بە تاك نییە بەڵکو باوەڕبوونە بە مرۆڤ. جیاوازیش لە نێوانیاندا گرنگە، لەبەرئەوەی ئەم جیاوازییەیە کە قۆناغی دوهەم لە قۆناغی سێهەم جیادەکاتەوە.

چەمکی مرۆڤ لەم قۆناغەدا چەمکێکی ڕەهای مرۆڤە یاخود مرۆڤی ڕەها. مەبەست لە مرۆڤی ڕەهاش ئەو مرۆڤەیە یاخود مرۆڤ وەك نوێنەری ڕەگەزی مرۆڤ نەك کەسێکی دەست نیشان کراو. لە قۆناغی یەکەمدا خەڵکی خواوەندیان دەپەرست، بەو سیفەتانەیەوە کە لە سنوری مرۆڤ و تواناکانیدا تێدەپەڕێت. هەرچۆن خوداوەند لەو قۆناغەدا سەنتەری گەردون و خولگەی ژیانی بۆ دەنواندن، هەر لەسەر ئەم وێناکردنەشەوە بیروباوەڕ و ئاینەکان ئەفرا. بەڵام لە قۆناغی دووەمدا خەڵکی ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە مرۆڤ تواناکانی لە بن نایەت و بێکۆتایە، گەر جڵەوی بۆ شل بکرێت پەرجوو دەخوڵقێنێت. لەمەوە بیرۆکەی خواوەندیان داگرتە سەر زەوی و بیرۆکەی مرۆڤیان خستە جێگەی، مرۆڤ چیتر بووە چەقی گەردون و خولگەی ژیان. هەموو شتێك کەوتە پێناوییەوە هەر ئەو ڕاستی دیارو بەرچاوو کاریگەر و کارتێکەرە. لەبەرئەوە شتێکی سەیر نابێت گەر هەموو وزەکان ئاراستەی بە پیرۆزکردنی مرۆڤ بکرێت لەسەر زەوی.

ڕووانینی خەڵکی لە سەردەمی شارستانیەتەکاندا بە ئاراستەی دەرەوە بوو. پێوەی خەریك بوون و گرنگییان بە دیاردەکانی دەدا، بە دوای هۆکارێکدا دەگەڕان لە ڕێگەیەوە بەسەر ترس و دڵەڕاوکێیاندا سەرکەون و بگەنە دڵنیایی و ئاسودە بوون.

بەڵام لە قۆناغی دواتردا خەڵکی لە جیهانی دەرەوە بوونەوەو، شتێکی تیا نەما بۆ یان جێی ترس و دڵەڕاوکێ بێت، ڕوویان کردە خودی خۆیان و لێی ڕامان، جیهانێکی نامۆ و سەیریان تیا بەدی کرد بەڵام لە هەمان کاتدا جیهانێك بوو فراوان و نادیار. چیتر سەرنج و گرنگی پێدانی خۆیان بەم جیهانەوە سەرقاڵ کرد لە هەوڵی دەرخستنی ڕازەکانی و تێگەیشتنی نادیارەکانی. لە چوارچێوەی ئەم قۆناغەدا "مرۆڤی بلیمەت" بەدەرکەوت، بیروباوەڕی "بلیمەتی مرۆڤایەتی" دەرکەوت و سەری هەڵدا. ڕێنیسانسی ئەوروپی بانگهێشتکەر و دۆزەرەوەی زیندوی ئەم بیروباوەڕە نوێیەیە.

جا بۆچی سەردەمی ڕێنیسانس ئەوا دواتر بە درێژی دێینە سەری. بەڵام گەر ئەم دەستنیشانە وەك خودی خۆی جێی سەرنجە ئەوا هەموو دەستنیشانکردنە مێژوویی‌یەکان کە پەیوەستە بە قۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ و هزری مرۆڤەوە -هەمیشە دەستنیشانکردنێکی ورد نابێت، چونکە لە پرۆسێسێکی نەرم و لەسەرخۆوە سەرچاوە دەگرێت، بنەما سەرەتاییەکانی زۆر جار شاراوە دەبێت و دەرناکەوێت تا وێناکردنەکە نەبێتە دیاردەیەکی گشتی.

ئەمەش ئەوە بوو کە لە ڕێنیسانسدا ڕووی دا، خواستی مرۆڤایەتی بووە دیاردەیەکی گشتی کە لە هەموو جۆرە چالاکییەکی مرۆڤدا خۆی دەنواند. گەر ڕێنیسانس بیروباوەڕی (مرۆڤ)ی هێنابێتە بوون: ئەوا ئەم بیروباوەڕە بەردەوام چالاکی مرۆڤی هەژاندووە بە شێوەیەك بێت یان زیاتر، بە درێژایی پێنج سەدە، کە نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدە کۆتایی پێ هاتووە.

## قۆناغی سێ هەم: قۆناغی تاك

دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی مرۆڤدا، کە هەموو بیروباوەڕی خۆی لە (تاك)دا چڕکردبۆوە. ئەمەش دەرەنجامی باوەڕنەمانی خەڵکی ڕوویدا لەبەرامبەر ئاوەزی مرۆڤدا کە لە قۆناغی پێشودا بە بەرزو پیرۆزی ڕاگرتبوو. هەرچۆن هەندێ لە زانستە نوێیەکان، بە تایبەت دەرونزانی کاریان کرد لە تێکشکاندنی بتی بلیمەتیدا، ساتێ بڕیاری دا کە بلیمەت جیاوازییەکی چۆنایەتی لەگەڵ هیچ مرۆڤێکی تردا نییە، جیاوازییەکە تەنها لە چەندایەتی زیرەکیدایە بە بڕێك کە لە مرۆڤی ئاسایی زیاترە. کەواتە جیاوازی لە نێوان بلیمەت و کەسێکی ئاساییدا جیاوازییەکی چەندایەتییە نەك چۆنایەتی، واتە جیاوازی لە پلەدا نەك لە جۆردا لەو دەمەوە بیروباوەڕی تاکگەرایی سەرچاوەی گرت، واتە باوەڕهێنان بە تاك (نە ڕەگەز و نە کۆمەڵ) کە بنەمایەو ڕاستییە. وەك چۆن ئەفراندنەکانی مرۆڤ لەوەوپێش لە هونەر و بوارەکانی تردا لە لایەن بیروباوەڕی ئاینی و دواتر بیروباوەڕی مرۆڤگەرایی کاریتێکرابوو، هەروەها کەوتە ژێر کارتێکردنی بیروباوەڕی تاکگەراییەوە لەم دەمەی دواییدا. کەواتە دەتوانین بڵێین: هونەر کۆمەڵگەرایی شکۆفەی کرد، مرۆڤگەرایی پەروەردە بوو، تاکگەرایانەش کۆتایی پێهات.

## کاریگەریی کەسایەتییەکانی ڕێنیسانس

هەمیشە سەرباری گۆڕانکارییە گەورەکان و ڕۆڵی گشتی میللەتان و دیاردەکان ڕۆڵی تایبەتی شان بە شانی ئەوان دەبێتە هۆکاری کاریگەرو شان بە شانی ڕووداوەکان جێ دەستی خۆی دیاری دەکات. لێرەدا ڕۆڵی تایبەتی چەند کەسایەتیەکمان مەبەستە لەم سەردەمەدا ئەرکی خۆیان لە بەرامبەر سەردەمە مێژووییەکەیان و گۆڕانکاری و ڕووداوەکان ئەنجام دراوە، هەڵبەتە کەسایەتییەکانی ڕێنیسانس زۆرن کە پێشەوایەتی سەرهەڵدانی ئەم سەردەمە هەستیارەیان کردووە، بەڵام لێرەدا دەکرێت بە شێوەیەکی پوخت و خێرا ئاماژە بە هەندێکیان و ڕۆڵیان بدەین لە هاتنەکایەی ئەم ڕۆژگارە نوێیەدا؛

### (دانتی) ١٢٦٥- ١٣٢١ ز

ناوی تەواوی دانتی ئەلگیرییە شاعیرێکی ناسراوی ئیتالی و یەکەمین مژدەبەخشی سەردەمی ڕێنیسانسە. دژی دەسەڵاتدارانی سەردەمەکەی خۆی بووە، لەسەر ئەم هەڵوێستەشی هەتا مردن توشی ئاوارەییو دەربەدەری بووە.

ڕۆڵی گرنگی دانتی لە هاندانی خەڵکیدا بووە بۆ بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی لە بری زمانی لاتینی، خۆیشی بە ڕاستەوخۆ شاکارەکانی بە زمانی نەتەوەیی نووسی، کە ئەمەش لە دوو سەرەوە کاریگەریی خۆی نواند. یەکەم لە بە میللی کردنی ڕۆشنبیری و تەرخان نەبوونی بۆ نوخبەی تایبەتی ئەرستۆکراتی و پتەوکردنی گیانی نەتەوایەتی و یەکپارچەیی خاکی نەتەوە. دووەم: ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتی ئاینی و پیاوانی ئاینی. خاڵی یەکەم بووە مایەی زیاتر گرنگی دان بە چاپکردن و بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیری چون خەڵکانێکی زۆر بە پەرۆشەوە بە زمانی نەتەوەیی بەرهەمەکانیان دەخوێندەوە. لە دیارترین بەرهەمەکانی (کۆمیدیای یەزدانی)یە کە بریتییە لە ١٠٠ سرود و نزیکەی ١٤ هەزار بەیت. لە سێ بەش پێك هاتووە یاخود سێ شوێن: دۆزەخ و خاوێنگە و بەهەشت. دانتی گەشتێ دەکات بۆ ئەو دونیاو بەم سێ بەشەدا تێپەڕ دەبێت بە دوا (باتریس)ی خۆشەویستیدا، لەم گەشتەدا (ڤێرجیل)ی شاعیری بت پەرستی ڕۆمانی دەکاتە ڕێ نیشاندەری خۆی. هەڵبژاردنی ئەم شاعیرە کە دڵسۆزی سەردەمەکەی خۆی بوو، سەرسامی و سۆزی دانتی پیشان دەدات بۆ داب و نەریت و یاساکانی ڕۆمای کۆن. لە لایەکی تریشەوە ڕەوشتی بەرزو بێ هەوایی و دڵسۆزی "ڤێرجیل" لای ناودارانی ڕێنیسانس باشترین نمونەی ئادەمیزادی سەردەمەکەیان بووە.

دانتی لە دۆزەخدا پیاوانی کەنیسە لە قەشەو پاپاکان دەبینێت کە لەگەڵ تاوانباران و چەتەو ڕێگر و ساختەبازان و دوزمان و تەڕنی (خائن)یەکاندا دەسوتێنرێن.

لە پاکژگەدا فەرمانڕەوا بت پەرستەکان دەبینێت چونکە دڵسۆزبوون و خزمەتی وڵاتیان بە پاکی کردووە. بێگومان باوەڕی پتەوی دانتی بە ئاینی عیسایی وای کردووە لە خاوێنگە زیاتر بەوانە ڕەوا نەبینێ[11]. کۆمێدیا خەوبینینە بە یەکگرتنی ئیتالیاوە و بانگەوازە بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی دنیایی لە دەست پاپاکان. بۆ ئەم ئامانجەش گەشبینە هەر لەبەرئەمەشە ناوی شاکارەکەی ناوناوە (کۆمیدیا)[12]. لە سەدەی چواردەهەمەوە بەرهەمەکانی ڕاستەوخۆ بوونە هێزی پاڵپێوەنەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەو نیشتمانیی گەلی ئیتالیا. ئەو وتەیەی کە دەڵێت: "هۆی هاتنە دونیای مرۆڤ بۆ ئەوەیە تا بەرز بفڕێ" بەڵگەی پەیبردنی ئەوە بە بەهای مرۆڤ و هەرچی زوتر هەستکردنیەتی بەو بیروباوەڕانەی دواتر هومانیستەکان بانگەوازیان بۆ کرد و جەختیان لەسەر کردەوە.

## پەترارك ١٣٠٤-١٣٧٤ز:

فرانچیسکۆ پەترارك شاعیر و نووسەر و داهێنەری ئیتالی، لە دوای دانتی بە کەسایەتی دوهەم دادەنرێت لە کاریگەری و خاوەن توانای بیرکردنەوە و هەڵوێست لە سەردەمەکەی خۆیدا، زۆری هەوڵ و چالاکی ئەم کەسایەتییە گرنگە دەکرێت لە گرنگی دانی دا کۆبکرێتەوە بە دەستنووسە کۆنەکان، چونکە ئەم پێشڕەوە خاوەن توانایەکی کەم وێنە بووە لە زمانی لاتینیدا، کە هاوسەردەمانی خۆی و بە تایبەت لە دەرەوەی ئیتالیاوە هێجگار زۆر پێی سەرسام بوون، ئەو دەستنووسانەی ئەم خاوەنی بووە تەنانەت لە کتێبخانەی ڤاتیکانیشدا چنگ نەکەوتون و زۆربەی تەمەنی خۆی بۆ ساغ کردنەوە و وەرگێڕانی ئەم دەستنووسانە تەرخان کردبوو، ئەمیش هەروەکو دانتی نمونەی باڵای فەرمانڕەوایی لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا دەبینیەوە و لە خەونی گێڕانەوەی مەزنی ڕۆمای جاراندا بووە. یەکپارچەیی و یەکگرتنی خاکی ئیتالیا ئاواتی بەرزی ئەو بوو. لە شاکاری "ئیتالیای نیشتمانم" (Italia mia)دا بە ڕوونی ئەم خواستەی دەرئەکەوێت. پەترارك یەکەمین کەس بوو زانستی مرۆڤایەتی بەرامبەر لاهووت دانا، لە بیروباوەڕەکانیدا دژ بە بیرباوەڕی سەدەی ناوەڕاست بوو، تاکە ڕێگەی سەرفرازی و خزمەت کردنی کۆمەڵ و فیکر ئەو ڕێگەیە بوو کە لە ڕابردوودا (واتە پێش سەدەکانی ناوەڕاست) گرتبویانەبەر. بۆیە وشەی Humanitasی لاتینی لە نووسەرانی پێشوو خواست، نووسەرانی دوای خۆی ئەم وشەیە کاری تێکردبوون و بە شێوەیەکی بەربلاو بەکاریان دەهێنا. هەرچەندە خۆی لە چینی ئۆرۆستۆکرات بوو بەڵام ئاراستەی هەمیشەیی دژ

بەم چینە بوو[١٣] هەرچۆن لە ساڵی ١٣٤٧دا پشتگیریی ئەو ڕاپەڕینەی کرد کە لە ڕۆما دژ بە دەربەگایەتی سازدرا.

جگە لە شیعر زۆر بەرهەمی مێژوویی و ڕامیاری و ئاکاریی و فەلسەفی نووسیوەو، (بەشێکی باشی تیاچووە) لە چەند بەرهەمێکیدا بە توندی ڕەخنە لە لایەنە خراپەکانی کەنیسە دەگرێت بە تایبەتی لەو شیعرانەیدا کە ناوی (نامە بێ ناونیشانەکان)ی لێناون. وەك دانتی ئەمیش سودی لە ڤێرجیل وەرگرتووە بۆ گوزارشت کردن لە هەندێ مەسەلەی دنیایی نزیك بەخۆی.

زۆربەی هومانیستانی سەردەمەکەی یان هاوەڵی نزیکی بوون یاخود قوتابی خۆی بوون. شێوازی هێند کاریگەر بووە لە نووسیندا زۆربەی هاوسەردەمەکانی لاسایییان کردۆتەوە هەربۆیە دەکرێت قسە لە قوتابخانەیەکی (پەترارك)ی تایبەتی بکەین لە ئیتالیاو دەرەوەی.

هەرچەندە پەترارك بە پچڕانی تەواوی لە دونیای دەرەوە لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا توشی گۆشەگیری هات، بەڵام ڕۆڵی ئەو لە دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمە بە وەرگێڕان و ساغ کردنەوەی دەستنووسەکانی و هەڵوێستی نەتەوایەتی و ڕەت کردنەوەی بیروباوەڕەکانی سەدەی ناوەڕاست و ڕەخنەی لە کەنیسەو پشتگیریی لە گیانی شۆڕشگێڕی دژ بە چینی دەرەبەگ و ئۆرستۆکرات. پێویستە پێگەیەکی شیاوی لە قۆناغی یەکەمی ڕێنیسانسدا بۆ دابنرێ.

## (**پۆکاشیۆ**) ١٣١٣- ١٣٧٥ز:

نووسەری ناوداری ئیتالی (جیوڤانی پۆکاشیۆ) لە خێزانێکی فلۆرەنسایی لە پاریس لە دایك بووە. لە گەڕانەوەیدا بۆ ئیتالیا لە شاری ناپۆلییەوە دەستی بە جموجوڵ و چالاکی ئەدەبی کرد. ئەو کاتەش کە گەڕایەوە بۆ فلۆرەنسا لە هەرەتی لاوێتی و لوتکەی چالاکی ئەدەبیدا بوو، پێشوازی گەرمی لێکراو هەر ئەوکاتە چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتووی ئەو شارە بەسەر چینی ئۆرستۆکراتی دەسەڵاتداردا سەرکەوتنی تەواوی بەدەست هێنابوو. ئەم هەل و مەرجە دەرفەتێکی گەورەی ڕەخساند بۆ ئەم نووسەرە کە پەرە بە وزە و توانای خۆی بداو ڕۆڵی تایبەتی لە ژیانی سیاسیدا بە کردەوە بگێڕێ. چەند ئەرکێکی دیپلۆماسی گەورەی لە دەزگا کۆمارییەکاندا وەرگرت و بەوپەڕی سەرکەوتوییەوە بەجێی هێنان.

پۆکاشیۆ خاوەن بیرکردنەوەیەکی دیموکراسی و نیشتمانی قووڵ بوو، خواستی جێگیرکردنی زمانی نەتەوەیی بوو هەر بەو زمانەش دەینووسی. لە شاکارەکانی (دیکامیرۆن)[١٤] ە لەسەد چیرۆکی کورت پێك هاتووەو بە سێ ساڵ نووسیویەتی نووسەر لەم چیرۆکانەدا سەرەڕای بەخشینی ڕۆڵی پاڵەوانێتی بە ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەی ئیتالی لە هەموو چین و توێژەکان واتە لە

میر و سەرۆکەوە تا جوتیار و دەست و پێوەندەکان، بە شێوازێکی گاڵتەجاڕی پەردە لەسەر هەڵس و کەوتی ڕەبەن و قەشەو تێکڕای پیاوانی کڵێسە هەڵدەماڵێ و ئاشکرای دەکا، کە ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێکی مشەخۆر و ساختەباز و داوێن پیس و دوزمان و مەرایی کەرن.

هەرچەندە پۆکاشیۆ ڕاستەوخۆ توخنی مەسەلە ئاینییەکان نەکەوتووە بەڵام هەنگاوێکی چاونەترسانەی نا بۆ ئاشکراکردنی ڕووی ڕاستەقینەی پیاوانی کەنیسە. لە هاوشانی ئەمانەوە باس لە سەرکەوتن و ڕاستی ئەو یاسایانە دەکات لە ژیاندا کە لە تەك عەقڵی ئادەمیزاد و بەرژەوەندییەکانی سەردەمی نوێدا دەگونجێن. بە جۆرێك دەرووانێتە ئادەمیزاد کە داهێنەرێکی گەورەی ژیانەو پێویستە لە شوێن و جێگەی شیاوی خۆیدا دابنرێ. پۆکاشیۆ جەختی لەسەر ئەو بیروباوەڕە کردەوە کە دەوترا: نابێ پلەوپایەی تاکەکەس بەو چاوەوە تەماشا بکرێ لە چ خێزان و بنەماڵەیەکە، بەڵکو دەبێ کاروکردار بکرێتە محەکی چاکەو پیاوەتی تاکەکەس.

پۆکاشیۆ وەك دانتی و (پەترارك)ی هاوچەرخی لە گێژاوی ئەو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییانەدا کە شارەکانی ئیتالیا تێیدا دەژیان و هەموو لایەنێکی هزریشی گرتبووەوە، دوچاری تەنگوچەڵەمەیەکی سایکۆلۆژی بووبوو. لە بیروڕا دونیاییەکانی پاشگەز بووەوە. گەر بترارك نەبوایە بە تەواوەتی دەست بەرداری هەموو جموجۆڵێکی ئەدەبیش دەبوو. ساڵانی دوایی تەمەنی بۆ کاری زانستیی تەرخان کرد و دەستی دایە کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی دەستنووس و نووسینەوەی مێژوو لە لایەك، لە لایەکی تریش شیکردنەوەی نووسینەکانی (دانتی) و لەسەر حەڤدە سرودی (کۆمیدیای یەزدانی)ی نووسی و یەکەم کەسیشە مێژووی ژیانی نووسەرەکەی خستە دووتوێی کتێبەکەوە.

لە کاتێکدا کۆتایی بە باسی ئەم سێ پێشەوایە دەهێنن، سەرەڕای هەموو کەم و کورتییەك لە بەرهەم و بیری ئەواندا، ڕۆڵێکی دیار و ئاشکرایان لە بوژاندنەوەی ئەورووپادا هەبووە و بۆچونەکانی ئەوان بۆ ڕۆژگاری خۆیان سیمایەکی پێشکەوتن خوازی پێوە دیارە و بووەتە بەردی بناغە بۆ هاتنەکایەوەی دنیایەکی نوێ، پاشان لەگەڵ ڕەوتی پەرەسەندنی کۆمەڵدا گەشەیان پێکراو لە جاران زیاتر نەش و نمایان کرد و کاریان کردە سەر هەموو ڕێبازە فیکرییە نوێکانی دوای خۆیان(١٥).

## پێگەی ئیتالیا وەك زێدی ڕێنیسانس:

لە ئەنجامی چەند هۆیەکی دیاریکراودا کە هەریەکەیان بەم یان بەو شێوە کاریان لەوی تر دەکرد، بیروباوەڕی ڕێنیسانس لە وڵاتی ئیتالیادا بەر لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپا خۆی نواند. سەرباری ئەو هۆیانەی فلۆرەنسایان کردە پایتەختی ڕێنیسانس و ئاماژەمان پێدا لە پەراوێزدا،

ئاماژە بە چەند هۆکارێکی تر دەکەین کە ڕۆڵی خۆیان گێڕا بۆ دەرکەوتنی ئەم ڕاپەڕینە نوێیە لەم وڵاتەدا کە تا ئەمڕۆ دەستنیشانکردنی مەودای مێژوویی ڕۆژگاری ڕێنیسانس و ئەو وڵاتەی سەری تیاهەڵدا، یەکێکە لەو مەسەلە ئاڵۆزانەی مشت و مڕی زانستیانەی لەسەر دەکرێ. بەڵام سەرەڕای جیاوازیش مێژوونووس و لێکۆڵەران باوەڕیان وایە کە ئیتالیا لانکەی ڕێنیسانس و بزوتنەوەی مرۆڤایەتییە.

ئەم وولاتە لە کۆتایی سەدەی ناوەڕاستدا زۆر بە خێرایی بەرەو پێش چوو. لە سەدەی یانزەهەم بە دواوە ئابوری ئیتالیا پشتی بە بازرگانی دەرەوە بەست. گورجوگۆڵی بازرگانی لە دەریای سپی ناوەڕاستدا لە برەودا بوو تا توانی هەموو ئالْ و گۆڕێکی نێوان ئەورووپاو ڕۆژهەلات بۆ خۆی قۆرخ بکات. ئەمەش بە قازانجێکی گەورە و دەوڵەمەندییەکی زۆر بۆ ئیتالییەکان شکایەوە. لە میانی سەدەی سیانزەهەمدا ئیتالیا ڕیزی پێشەوەی بە هۆی خواستی ئاوەزی و ڕێنومایی کارانەوە لە ئابوریدا و پەرەسەندنی سەرمایەداریدا بۆ خۆی داگیرکرد هەرچۆن بەرەنجامی ئەم خواستەش بوو توانی پەرەسەندنی سەرمایەداریی ڕۆژئاوایی لە ئیتالیادا بهێڵێتەوە. شارەکانیش لە شاری وڵاتانی تر زیاتر پێشکەوتوتر بوون[١٦]. جوڵەی بازرگانی لە شاری ڤینیسیادا هێند بە گوڕ بوو هەموو بوارێکی گرتبۆوە بە دوا قازانجدا. تا گەیشتبووە بازرگانی بە کۆیلەی سپییەوە. (واتە کڕین و فرۆشتنی ئافرەتی بولکانی بە میر و خەلیفەکانی ڕۆژهەلات چونکە ئەم بازرگانییە قازانجێکی زۆری لە دوا بوو) ئەمە سەرباری پێشکەوتنی پیشەسازیی کە بە هاوشانی بازرگانیی ئیتالیای خستە پێگەیەکەوە کاری کردە ئابوری تێکرای وولاتانی ئەورووپا. لەبەرئەوەی ئەم وولاتە پێش ڕۆژئاوا کەوتبوو لە لایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتییەوە، نوێ بوونەوەی ئابوریی دەست پێکرد بووە مایەی ئەو ئاسانکاریانەی لە مەیدانی دارایی و مەیدانی گواستنەوەدا کە جەنگی خاچ پەرستی پێویستی پێی بوو لە ئیتالیاوە ڕێکبخرێت. پێشبڕکێی سەربەست بۆ یەکەمین جار لەوێوە سەری هەڵدا و یەکەم ڕژێمی بانکی ئەورووپی تیا بەدەرکەوت. هەرچۆن نابێت ئەوە لە یاد بکەین لە ئیتالیادا پێش هەموو وڵاتێکی ئەورووپی ئازادبوونی چینی ناوەند ڕاگەیەنرا، بە هۆی لاوازیی هەردوو ڕژێمی دەرەبەگی و سوارچاکی (الفروسیه) هەر لە سەرەتاوە لەچاو ئەورووپای سەرودا. ئۆرستۆکراتیەتی لادێیی ئیتالی جێ پێی هەبوو لە شارەکانداو توانای خۆ گونجاندنیشی هەبوو لەگەڵ ئۆرستۆکراتی دارایی لە شارەکاندا. ئەم بارودۆخە پڕ لە گۆڕانکارییە بنەڕەتیانە کە لە سروشتی سیستمی شارەکانی ئیتالیادا ڕەنگیان دابۆوە، کاری کردە سەر خێزانە دەسەڵاتدارەکان کە لە کشتوکاڵ زیاتر بایەخ بە کاروباری پیشەسازی و بازرگانی بدەن. کارایی و بە توانایی ئەم

خێزان و بنەماڵە فەرمانڕەوایانــە هۆکـارێکی تـرن کـە نـاکرێت فـەراموش بکرێـن لـە پێشـرەوی کردنی ئیتالیدا. هێزی دەزگای ئابوری ئەم خێزان و بنەماڵانە کە خۆیان دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون لەناو دەوڵەتدا هەرەس هێنانی پەیوەندیی‌یە دەرەبەگایەتی‌یەکانی ئیتالیای پێش هـەموو وڵاتانی تر خست.

بە هۆی ئەو جموجۆڵە بازرگانی‌یەی باسمان کرد بـیروڕاو دیـاردە گرنگـەکانی شارسـتانیەتی ڕۆژهەڵات دەگەیشتە ئەوروپا لە ڕێی ئیتالیاوە. ئـەمەش کـاری خـۆی کـردە سـەر بوژانـدنـەوەی ئەورووپی بە گشتی و ئیتالیا بە تایبەتی لە ساڵانی شەڕی خاچ پەرستاندا. کە بە هۆی شکست و پاشەکشەیان زۆر دیاردەی شارستانی بۆ ڕۆژئاوا پەڕاندەوە.

هۆیەکی تری گرنگ کە وای کرد ئیتالیا بەر لە هەموو وڵاتانی تر ببێتە پێگەی ڕێنیسانس. بوونـی ئـەم وڵاتەیـە بـە مەڵبـەندی کڵێسـەو جیـهانی مەسـیحی بـە چـەند سـەدەیەك بـەر لـە ڕۆژگاری ڕێنیسانس. ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتن و پەرەسەندنی دیاردەکانی ڕێنیسانس تێیدا لە دوو جەمسەری ناکۆکەوە. چونکە پێشتر ئاماژەمان بە ڕۆڵی پیـاوە ئاینی‌یـەکاندا بـە تایبـەت لـە ڕۆمـادا بـۆ بـەدواچون و دەوڵەمـەندکردنی هۆکاری دەستنووسـەکان. لـە لایـەکی تریشـەوە ئیتالیا ناوبانگی بەوە دەرکردووە کە سروشتێکی ڕازاوەی هەیـە، ئەمـەیش وای کـردووە زمـان و ئـەدەبیاتی بـەپێزتر بکـاو سـەرچاوەی داهێنـان لـە بوارەکـانی هونـەرو ئـەدەبدا بتەقێتـەوەو بنچینەیەکی نوێ بۆ چێژ لێوەرگرتنی ئەم بەرهەمە جۆربەجۆرانە دابمـەزرێنێ. ئیتالیا پشت بـە بیروبـاوەڕی یەکـەیی کـە سروشـی بـە هونەرەکـەی دەبەخشـی توانـی خواسـتی کلاسـیکی لـە ڕێنیسانسـدا بهێڵێتـەوە. ڕۆشـنبیریی هونـەریی بـۆ یەکـەمین جـار لەسـەر تەختـەی شـانۆی ئیتالی‌یەوە دەرکەوت و دواترینیان لەبەرئەوەی کەلتوری سەردەمی کلاسیکی کۆن بە هێجگاریی لە ئیتالیادا نەفەوتابوو و لە هەموو قوژبنێکدا ڕێکەوتی ئاسەواری کلاسیکیت دەکرد.

ئەوەی زانراوە زۆرێك لەو تیۆریانەی لە بنەچەی ڕێنیسـانس دەکۆڵنـەوە هۆکـاری سـەرەکی بەمـەی دواترینیـان دەزانـن کـە ئەمـەش شـتێکی ئاسـانە یـاخود لێ ئاسـانتر نـیـە هـۆی پـەیدابوونی ئـەم شـێوازە نوێیـە بـۆ هۆکارێکی دەرەکـی ڕاسـتەوخۆ بگێڕیتـەوە. بـە هـەرحاڵ ئەنجامی کارکردنی ئەم هۆیانە ئیتالیا پێشرەوی وەرگرت بۆ سەردەمێکی نوێ، هـەل و مـەرجی بۆ ڕەخسا بۆ گەشەکردن و توانی خزمەتێکی ئەوتۆی بکا، ڕەگـەزە بنچینەیی‌یـەکانی نەشـو نما کردنی بە جۆرێك پێببەخشێ کە لە وزە و توانای هیچ وڵاتێکی تری ئەورووپاییدا نەبوو. ئەم واقیع بۆ ڕەخساندنە وای لە هەندێ مێژوونووس کردووە بگەنـە ئـەو بـاوەڕەی کـە بوژاندنـەوە تەنها ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە.

## زنجیرەی گۆڕانکارییە مێژووییەکان لە ئیتالیای ڕێنیسانسدا

گەر بمانەوێت هەرچی ووردتر و قولّ تر بڕووانینە گۆڕانکارییە مێژووییەکان و سەرەتاکانی دەست نیشانکراوتر بن لە ئیتالیادا ئەوا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەدەی پانزە ئەو دەمەی کۆمارە دەریاییە بچوکەکان وەك ڤینیسیاو پیزاو جێنوا سەربەخۆ لە ڕژێمی دەرەبەگایەتی بەدەرکەوتن. پاشان هەر ئەم کۆمارە بچوکانە بوو کۆمەڵگە ناوخۆییە ئازادەکانی لیّ دروست بوو وەك میلانۆ و لۆکاو فلۆڕەنسا و ڤیرونا کە ئەمانە دەوڵەتۆکە بوون و بە گشتی لە بازرگانیدا کاریان دەکرد. بە دروست بوونی ئەم کۆمەڵگە ناوخۆییانە، هەر زوو بە زوو کێشە کەوتە نێوان ئەمان و گەورە خاوەن زەوییە دەوڵەمەندەکانی دەوروپشتیانەوە، بە شێوەیەکی کاتی کێشەکە بە سەرکەوتنی چینی ناوەند کۆتایی هات. بەمەش ئەرستۆکراتیەتی لادێ گواستیەوە ناو شارەکان و هەوڵی خۆگونجاندنی دا لە دوتویّی ئەم بارە نوێیەدا.

لە هەمان کاتدا کێشەیەکی تر سەری هەڵدا لە نێوان چینی بەرز و چینی ناوەند بە گشتی لە لایەك و لە نێوان چینی ناوەندی گەورەو بچووك لە لایەکی تر، دوو بەرەکی کەوتە نێوان دانیشتوانی شارەکانەوە کە پێشتر دژی دوژمنێکی هاوبەش یەکگرتوو بوون. بوونە چەندان بەش و کەوتنە کێشەیەکی تاڵەوە تا دورترین ئاست. ئەو گۆڕانکاریانەی کە کلتوری یۆنانی و ڕۆمانی لە فەلسەفەو ئەدەب و هونەردا گوڕیان پێ دەبەخشی هاوکات بوو لەگەڵ دەنگدانەوەی هات و هاواری ئەو شەڕانەی کە لە شەقام و کۆڵانەکانی فلۆڕەنساو دەوڵەتۆکەکانی تری ئیتالیادا بەرپابوو؛ لە نێوان دەستە سەربازییە بەکرێ گیراوەکانی لە پێناو سەرکردە سەرکێشەکانیاندا دەجەنگان و کاریان دەکرد، لە هەوڵی دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات و دەوڵەمەندی دا، بۆ گەیشتن بەم مەبەستە هەموو جۆرە چەکێکیان بەکاردەهێنا، تەنها لە پێناو ئەوەی ئەیانەوێت تەنانەت گەر ئەو چەکە غەدر و ژەهر و خیانەتیش بێت. هەرکامێك دەستی بە جڵەوی فەرمانڕەوایەتیدا دەگەیشت هێندەی نەدەبرد دەبووە زۆردار و بەردەوام دەبوو لە زۆرداری کردندا تا سەرکێشێکی تر دەهات و جێگەکەی دەگرتەوە. ئەمانە هەمووی سیمای کڵپەسەندنی ئاگری کێشەی نێوان بۆرژوازیەتی بچووك و گەورە لە لایەك و لە نێوان بۆرژوازیەت و بازرگانە بچووك و پیشەگەرەکان لە لایەکی ترەوە بوو.

لە کۆتایی سەدەی دوانزەدا دیموکراتییە سەرەتاییەکان بوونە ئۆتۆکراتیەتی سەربازیی، هۆکاری ئەمەش نەزانراوە. ئایا دانانی فەرمانڕەوا ڕەهاکان بەرەنجامی کێشەی خوێناوی نێوان چینە ئەرستۆکراتییەکانە یاخود کێشەی نێو چینی ناوەند؟ یا هەردوو دیاردەکە پێکەوە؟!.

بەهەرحاڵ هەمیشە دابەدوای کێشەی ناوخۆی بەرە جیاوازەکان دوورو نزیك بە پەیدابوونی ڕژێمی فەرمانڕەوایەتیەکی ڕەها کۆتایی دێت[١٧].

لە سەدەی سیانزەهەمەوە فەرمانڕەوایی ڕەها بووە بۆ ماوەو پشتاوپشت لە زۆر شوێندا، تەنها لە هەندێ شوێنی کەمی وەك فلۆرەنسا و ڤینیسیا نەبێت کە دەستوری کۆماری کۆن مابۆوە وەك چوارچێوە و ئەو ئازادیەی پێشوو لە کەم بوونەوەدا بوو. چیتر کۆمەڵگەی ڕامیاریی ئازاد شتێك بوو بەسەرچوو بەپێی زەمان.

قۆناغە جیاوازەکانی پەرەسەندنی سەرمایەداریی لە فلۆرەنسادا لە هەموو شارێکی تری ئیتالی ڕوونتر و دیارتر بەدەرکەوت، لەم شارەدا وردتر چونە سەرەوەی چینی ناوەندی باڵا دەرئەکەوێت، لە ڕێی دەستەی پیشەیەکانەوە بۆ دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتدا. چون ئەم شارانەو فلۆرنسا لە سەرویانەوە نەیانتوانی لەگەڵ ڕژێمی خێزانە فەرمانڕەواکاندا بگونجێن.

دەستە پیشەیەکان توانییان دوای مردنی فریدریکی دوهەم دەست بەسەر دەسەڵاتی خۆجێیەتیدا بگرن و لە دەست فەرمانڕەوای ڕەهای دەرکەن، (یەکەمین دەسەڵاتی میللی) بنیات بنێن و سەرکردەی بۆ هەڵبژێرن. بەم شێوەیە لوتی خێزانە سەربازییەکان شکاو ئەرستۆکراتیەتی دەرەبەگی وەدەرنرا لە حکومەتی کۆماریی. ئەمەش یەکەمین سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی چینی ناوەند بوو لە مێژووی نوێدا، ڕووداوێك بوو یادی سەرکەوتنی دیموکراتی یۆنانیمان دەخاتەوە بەسەر حکومەتە خوێن ڕێژەکاندا.

بەڵام دوای دە ساڵ (بە یەکگرتنی ئەرستۆکراتیەتی دارایی و ئەرستۆکراتیەتی بۆماوەیی) ئەرستۆکراتیەت توانی دەست بگرێتەوە بەسەر دەسەڵاتی مێژوویی دواتری فلۆرەنسادا.

سەدەی چواردەهەم لێوان لێوبوو لە کێشەی نێوان چینی ناوەند کە پێشڕەوایەتی دەستە پیشەیەکانی دەکرد و ئەو کرێکارانەی کەناچار دەکران بچنە دەرەوە لێیان. لەم دەوڵەتەدا سەرمایە دەسەڵات دارییەکی دەکرد هێند توند و تیژ و هێند دوور لە ویژدانێکی ئاکارییەوە کە نە لەوەو پێش و نە لەوەو دوای مێژووی ئەورووپای ڕۆژئاوا بە خۆوەی نەدیبوو. گەشەسەندنی ئابوریی بەرەنجامی چەوساندنەوەی بێ ڕاددەی هەژارەکان[١٨] خۆی دا لە لوتکەی.

لە ساڵانی ١٣٢٨-١٣٣٨ چەندان خێزانی گەورە نابوت بوون، دەسەڵات چووە دەستی حکومەتێکی میللی کە لە بۆرجوازیەتی بچوك پێك هاتبوو (یەکەمین حکومەتی لەو جۆرە بوو لە فلۆرەنسا). چل ساڵی دوای ئەوە[١٩] تاکە ماوەی دیموکراتی ڕاستەقینە بوو لە مێژووی فلۆرەنسادا. لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی پیشەگەراکان و دروست بوونی حکومەتێکی میللی کە

تیایدا چەند دەسکەوتێ بۆ چینی کرێکاران بەرهەڤ بوو، چەند ساڵێکی نەبرد حکومەتی میللەت لەناوبراو دەسەلآت گەڕایەوە لای چینی باڵا بە هاوبەشی چەند خێزانێك[٢٠].

لەسەرەتای سەدەی پانزەوە ماوەیەکی نوێ لە گەشەسەندنی ئابوری و هێمنی باڵی کێشا بەسەر فلۆرەنسادا (کە بە درێژایی فەرمانڕەوایی کۆزیمۆ میدتشی بەردەوام بوو) فلۆرەنسا گەیشتە چڵەپۆپەی توانای ئابوریی. چینی دەسەلآتدار حەزیان بە دەرخستنی هێزو تواناو سامانیان دەکرد هەر لە ساڵی (١٤٢١)ەوە (جیبرتی) دەستیکرد بە کارکردن لە دەرگای ڕۆژهەلآتی بێوێنەی شۆردنگەی کەنیسەی فلۆرەنس، برۆنیللسکی گومەزی سەر کاتیدرالیەکەی دروست کرد.

بیرۆکەکە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا کردنی فلۆرەنسا بوو بە ئەسینایەکی تر.

لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەوە بەرەنجامی هەرچی زیاتر دەوڵەمەندبوونی چینی بۆرجوازی، بیروباوەڕ و هەڤۆت و سەرەتاگەی ڕەفتارە ئاوەزیەکانی خۆی لە دەست دا و نمونە بالآکانی مەللاکە گەروەکان جێیانی گرتەوە، بەمەش کەسایەتی بۆرژوازی وردە وردە سیما ڕۆمانتیکیەکانی لە دەست دا. لێرەدا هەردوو بازنەی کۆشك و چینی ناوەند لێکیان دا لە نێوەندی ڕێدا، دەسەلآتدارەکان بە شێنەیی پێشکەوتن خوازبوون و چینی ناوەندیش زیاتر مەیلی بەلای ڕێبازی پارێزگاردا چوو. حەزیان بە هونەرێك دەکرد نمونەی باڵای ڕۆژگاری تەخت و سوارچاکی و ڕوحانیەتی غوتی سەدەی ناوەڕاستی تیابێت.

## هۆکارە ئایدیۆلۆژی و ئابوریەکان لەسەر هونەری ڕێنیسانسی ئیتالی

کۆتایی سەدەی دوانزە بە گەشانەوەی ئابوری و چونە پێشەوەی گوزەرانی و نیشتەجێ بوونی شارەکان دەزانرێت هەر ئەم هۆیەشە وا دەکات سەرەتای دووری ڕێنیسانس بۆ ئەو ساڵانە ببرێتەوە، لە گرنگترین دیاردەیەك کە لەم ڕۆژگارانەوە سەری هەڵدا لە هونەردا خواستی لێکچوون بوو لەگەڵ سروشتدا، ئەم خواستەش ئەو دەمە ئەفرا کە چیتر نیگارو کارە پەیکەریەکانی سەردەمی غوتی هێماگەرایەکی پەیت نەما. هەڵبەتە ئەمە ناکاتە ئەوەی بڵێین سەردەمی ڕێنیسانس دۆزەرەوەی سروشتە، گەر وامان ووت هاوڕا دەبین لەگەڵ خواستی لیبرالیەت لە سەدەی نۆزدەدا، چون لیبرالیەتی سەدەی نۆزدە بانگهێشتکەری بیروڕایەکی لەوجۆرەیە. وەختێ (بورکارت) دەڵێت: "دۆزینەوەی جیهان و مرۆڤ" پێشتر لە ڕێنیسانسدا کراوە، ئەم وتەیە بە مەبەستی پشت گیریە لە بیرکردنەوەیەك کە سەراپا هێرشە بۆ سەر گیانی دواکەوتویی ڕۆمانتیکی و پەیوەست کردنەوەیەکی ڕێنیسانس و ئایدیولوجیەتی لیبرالیە کە لە نووسینەکانی (میشیلیە)دا دەردەکەوێت. ئەو وێناکردنێکی هەیە بۆ ڕێنیسانس

بە ڕوویــەکی گشتی کـە سـەرەتای پەرەسـەندنێکە دواجار دەبێتـە هۆی سـەرکەوتنی بیرۆکـەی ئازادی و ئاوەز. ئەمانە گشت ئاماژەیەکن بۆ گرنگی پێدانی سەرەکی ئـەو لـە شیکردنەوەکانیدا لەسەر دەست نیشانکردنی ئەو بنەمایانەی کە بزاڤی لیبرالّیەت بۆی دەگەڕێتەوە، ئـەوەی جـێ گرنگی پێدان و سەرنجی ئەوە هەمان کێشەیە دژ بە خواستی کەهنوتی و گیانی دەسەڵاتگەرایی لـە میانی ئــاوەزییدا. سـەرکەوتنی ئـازادی و ئـاوەز هەڵبەتـە دەمـان گەیەنێتـە وێنـاکردنی سەردەمی ڕێنیسانس بە سەردەمێکی دژە ئاینی یاخود بە دوور لە ئاین، (ئەمـەش وەك خـاڵێك لـە سـەرەتای باسـەکەمانەوە ئاماژەمـان بـە پێچەوانەکـەی دا) هۆکـاری ئەمــەش تەنـــها لای بورکارت و میشیلیە نـیـە بـەڵکو بینینی بیـل Bayle لـە (فەرهـەنگی مێژوویـی و ڕەخنــەیی) بەشی چوارهەم، ڤۆڵتێر لـە (گـەڕان لـە نێـو ڕێسـاو ڕۆحـانی میللـەتان) وەرزی دوانـزە. مۆرکـی نائـاینی ڕێنیسـانس شـتێکە سـەلمێنراو. ڕێنیسـانس هـەتا ئـەمڕۆ لـەژێر قورسـایی ئـەم وەسـف کردنـەدا دەناڵێنـێ. هەرچـەندە لـە واقعـدا تەنـها سـەردەمێك بـوو دژ بـە کەهنوتیـەت و گیـانی قوتابخانەگەراو زاهیدی بەڵام لە پاڵ ئەمانەدا بە هیچ شێوەیەك و مانایەك سەردەمێکی گومان گەرا نەبوو، هەرچۆن ناکرێت وا بزانرێت و بوترێت کە هەستی ئـاینی هەسـتکردنێکی سـەراپا بـزر بـووە. بـەڵکو ڕێنیسـانس تەنانـەت بـەو شـێوەیەش دژایـەتی دەسـەڵاتی نـەکردووە کـە لایەنگرانی ڕۆشنگەرایی و لیبرالّیەت جەختی لەسەر دەکەنـەوە، لـەلای مێژوونووسـە لیـبرالّی و ئیشتراکی‌یەکان دەردەکەوێت.

بـەڵێ لـەم سـەردەمەدا توانـرا گۆڕانکـاری سـەرەکی بـهێنرێت بەسـەر کاریگـەریی بیرۆکـە ئاینی‌یەکانی دەرباری ئەو دنیاو ڕزگاربوون و گوناهی یەکەم.. هتد، بەڵام ئەمە ناکاتە ئـەوەی سەردەمێکی دژ بە ئاین بووبێت. هەتا ئەمڕۆش ئەو دووبەرەیەی ئاماژەمان پێدا ڕێنیسانس بە جەنگێکی ڕزگاریی ئاوەزو سەرکەوتنی گیانی تاکڕەوی دەزانن. گیانی تێکۆشان لە پێناو ئـازادی لە نێوەندی سەدەی هەژدەهەمدا کاری لەسەر بەهێزکردن و پتەوکردنی ڕێڕەوی ڕادیکاڵی کـرد لە تێ ڕووانینی ئاوەزیدا بۆ ڕێنیسانس، لەبەرئەوەی تێکۆشان دژ بە کۆنەپەرستی یـادی کۆمـارە ئیتالی‌یـەکانی هێنایـەوە بـیر لـە ڕێنیسانسـدا و سروشـی پەیوەسـت کردنەوەیـەکی هـەردو حاڵەتەکەی ئامادەکردەوە ئەمە جگە لە هۆکارێك کە تەواوکەر بوو بۆ تێگەیشتنێکی لیبرالّیانـە لـە سـەردەمی ڕێنیسـانس و بڵاوکردنـەوەی ئـەو تێگەیشـتنە ئـەویش ڕۆژنامەگـەریی دژ بـە ناپولیون بوو لە فەڕەنسا و بەرەی دژ بە پیاوانی ئاینی بوو لە ئیتالیا.

بورکارت خواستی تاکگەرایی تێکەڵ بە خواستی هەستیو شـەهوانی کـرد، هـەرچۆن بیرۆکـەی ڕەهـابوونی خـودی لـە دەسـت خواسـتی زاهیدیـی تێکـەڵ بـە بـەهاخوازی سروشـت و بانگـەواز بـۆ

چێژوەرگرتن بە ژیانەوە (ڕزگارکردنی جەستە) کردووە. ئەمەش لەژێر کاریگەریی نائاکاریی ڕۆمانتیکی لای (هینە) لە لایەك و بە پیرۆز ڕاگرتنی پاڵەوانی لە ئاکار بەدەری لای نیتشە.

لیبراڵیەت و ڕەوتی تاکگەرایی لە سەدەی نۆزدەدا بەرەنجامی ڤین هەڵگرتنیان لە جیهانی ئاکاریی چینی ناوەند و شۆڕش بە سەریا، بووە مایەی دەرکەوتنی ڕەوتێکی بێ ئاینی زیادەڕەو، هەوڵی ئەوەی دا لە بری ئەو لەززەتانەی کە دەستەوسانە لە پێگەیشتنیاندا وێنای ڕێنیسانس بە زیادەڕۆیترین شێوە بکات[٢١] ، ئەم وێناکردنەش بەرەنجامی دەروونی سەدەی نۆزدەیە زیاد لەوەی بەرەنجامی دەرونی خودی ڕێنیسانس بێت. ڕەوتی ئیستاتیکی بزاڤی ڕۆمانتیکی زۆر زیاتر بوو لەوەی تەنها پەرستنی هونەرمەند و هونەر بێت. ئەم فەلسەفە جوانییە ئەو کەسە گوناهکارو زۆردارو توندوتیژانەی نێو ڕێنیسانسی بە کەسایەتی گەورە دەزانی کە چاو لە سەیرکردنیان تێر نابێت.

تایبەتمەندێتی چەمکی تاکگەرایی لیبراڵی و هەستی شەهوانی چەندێ بەسەر سەدەکانی ناوەڕاستی دوایندا پیادە ئەبێت هێندە بەسەر ڕێنیسانسیشدا. لێرەوە سنورەکان زیاتر جوگرافیو نەتەوەیی بەدەردەکەون. زیاد لەوەی مێژوویەکی پەیت بن، بۆ نمونە مرۆڤ هەمیشە ئەو دیاردانەی لە خواروی ئەوروپا ڕوودەدەن دەگێڕێتەوە بۆ ڕێنیسانس، ئەو دیاردانەش کە لە سەرویدا ڕوودەدەن بۆ سەدەکانی ناوەڕاست. نیگارکێشانی فراوان لە هونەری ئیتالیدا، بە شێوەکانیەوە کە بە ئازادی دەجوڵێنەوە و بە یەکەی جێگەیەوە بۆ دیمەنەکانی، وا دەرئەکەوێت لە مۆرکی ڕێنیسانسەوە وەرگیرابێت، بەڵام جێگەی دیاریکراو و داخراو لە نیگارکێشانی کۆنی زەوی‌یە نزمەکاندا، بەو شێوە مرۆڤییانەوە کە گەورەیی و مەزنی‌یان تیایە تا ڕاددەیەك و هەموو ئەو توخمە وردەکاری‌یە زیادانەی کە بە وریاییەوە کۆکراونەتەوە لە شێوازێکی مینیاتۆری ناسکدا، ئەمانە گشت مۆرکێکمان تیا بەجێ دێڵێ کە بە هەموو شێوەیەك سەر بە سەدەی ناوەڕاستە. بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا جێ‌پێ‌کانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی لەرزین کە سەراپای ڕۆژئاوای گرتبۆوە لە دوتوێی یاسای سوارچاکی نێودەوڵەتی و کەنیسەی جیهانی بە کلتورە جیهانی‌یەکەیەوە، چینی ناوەند جێی گرتەوە بە ڕەوتی نەتەوەیی و هەستی نیشتمانی‌یەوە.

لە دیارترین سیماکانی هونەر لە سەدەی پانزەدا لە بەرامبەر هونەری سەدەکانی ناوەڕاست و ئەوروپای سەرودا ئەو ئازادی و خۆڕسکی‌یە نەزانراوەیە کە لە گوزارشت کردندایەو ڕێك پۆشی و کەشخەیی و فورسی‌یە لە هێڵە مەزنە دەرپەڕیوەکانیدا بەرەو ڤاڵبەکانی. هەموو شتێك تیایدا ساف و بریسکەدارە، ڕیتمی ئاوازییە. تیایدا ئەو ویقارە ڕەق

هەڵاتووە سەپێنراوە وون دەبێت کە لە هونەری سەدەکانی ناوەڕاستدایە، گوزارشتێکی شێوەیی زیندوو ڕوون جێی دەگرێتەوە.

یەکگرتنی توخمە کلاسیکییەکان بە هونەری سەدەی پانزە کە پێش هونەری سەردەمی کلاسیکی کەوتووە، هەر مانەوەی ئەم توخمانە لە شێوازەکانی ڕێنیسانسدا تا لوتکەی پەرەسەندنی وای کرد لە هونەرەکانی سەردەمی نێوەند و هونەری هاوسەردەمی خۆی لە ئەورووپای سەروو جیابێتەوە ئەو شێوازە ئایدیالییەی جیۆتۆ پەیوەست دەکات بە (رافاییل)ەوە دواتریش ڕافاییل دەیگەیەنێتە لوتکەی هونەریی لە سەدەی شانزەدا وەك تەوژمێکی هونەریی کە بە باڵای جوانی نمونەییدا هەڵدەدا بە مانا فیساگۆرییەکەی دژ بەو تەوژمەی بەهاتنی مایکل ئەنجیلۆ گەیشتە ترۆپك لە هەوڵی گوزارشت کردندا لە مەینەتییەکانی مرۆڤ بە هەموو ئەو تاڵی چەشتن و دڵەڕاوکێ و تێکۆشانەوە، ئەم کێشەیە بە پلەهای جیاواز لای زۆرێك لە هونەرمەندانی ئەو سەردەمە دەبینین -کە لە نێوان ناوەڕۆکی درامی و قاڵبێکی جوانی ڕێککەوتودایە- هەر ئەم کێشەیەش بوو هەناسەی کرد بە بەر ژیانی هونەری ئیتالیدا سەرباری هەموو ڕەوتێکی ئاوەزیی خاوەنەکانی.

هەرهەمان ئەو شێوازە ئایدیالییەی جیۆتۆیە لە هونەری مازاتشۆ و دۆناتێللۆو ئاندریا دل کاستانێو و پیرودیلا فرانشسکا و سنیوریلی و پیروجینۆدایە. تەنها هونەرمەندێکی ئیتالی لە سەردەمی ڕێنیسانسی پێشکەوتودا نییە ئازادبووبێ لەم کاریگەریە.

توخمی سەرەکی لەم تێگەیشتنەی هونەردا ڕێبیری ڕێککەوتن و هێزی کاریگەری هەمەکییە، یان بە لایەنی کەمەوە ڕێگرتنەبەرە یاخود بەرەو ڕێککەوتن چون و هەوڵدانە بۆ بەخشینی ئینتباعێکی گشتی، سەرباری هەموو پڕکردنەوەیەکی وردەکاری و ڕەنگەکان، بەم شێوەیە کاری هونەریی سەر بە ڕێنیسانس هەمیشە وەك یەکەیەکی تەواو بە دەردەکەوێت گەر بەراوردی کاری هونەریی دواینەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بکرێت، هەرچی چەندێ لە ناوەڕۆکدا دەوڵەمەند بێت سادەو هاوڕێکە لە بنەمادا.

بەڵام قاڵبی سەرەکی بۆ هونەری غوتی (لەپاڵ یەکدا) بوونە "التجاور Juxtaposition" جا مەسەلەیەك نییە گەر کارە هونەرییەکە لە چەندان بەش پێك هاتبوو سەربەخۆ یان شایەنی شیکردنەوە نەبێت بۆ بەشهایەکی وا، گەر وێنەیی بێت یا شێوەکاری، داستان بێت یا نواندنێکی درامی، گرنگ ئەوەیە ڕێبیرێکی فراوان بوونەوەیە نەك چڕبوونەوە، ڕێککەوتنە نەك جیایی لە پلەدا، بە دواهاتنێکی کراوەیە نەك چوارچێوەیەکی ئەندازەیی داخراو، وێنەیەکی نمایشکاری پانۆرامییە بۆ واقع. لە نیگارکێشاندا شێوازی پەسەندکراو یان ڕێگای (پەیوەست) بوونە "الطریقة المتصلة". هونەری غوتی بەم شێوازەی وا لە بینەر دەکات لە یەکێك لە

وردەکارییەکانەوە بچێ بۆ یەکێکی تر، بەمەش وای لێدەکات بەشە بەدوا یەکدا هاتووەکان یەك لە دوا یەکتر هەڵوەشێنێ، بەڵام هونەری ڕێنیسانس دەرفەتی وەستان بە بینەر نادات لە هیچ بەشێکدا، یاخود جیاکردنەوەی هیچ توخمێکی تاك لە پێکهاتە کامڵەکە، بەڵکو پاڵی پێوە دەنێت بۆ پەی بردن بە هەموو بەشەکان لە یەك کاتدا. کە ئەمەش دەکرێت بە هاوکات بوون (التزامن) لە بینگەدا ناوزەد بکرێت. لە هەمان کاتدا بەدیارکەوتنی گوزارشت کردن لەو گۆڕانکارییەی ڕوویداوە لە چەمکی جێگەدا (المكان). ئەم گۆڕانکارییەش خۆی لە خۆیدا گۆڕانکارییە لە چەمکی هونەردا سەراپا. چون سەدەکانی ناوەڕاست، جێگەیان بە شتێکی ئاوێتەی شایەنی شیکردنەوە دادەنا، ڕێیان دەدا لە درامادا چەند دیمەنێکی جیاواز دابنرێت لە پاڵ یەکتردا، بەڵکو واز لە ئەکتەرەکان دەهێنرا لەسەر شانۆ بمێننەوە گەر ڕۆڵیشیان لە ڕووداوەکاندا نەمابێت. بینەرانیش بەو شێوەیە ڕاهاتبوون هیچ گرنگییەکیان نە بەم دیمەنانە دەدا کە نواندنی تیا نەمابوو نە بەو ئەکتەرانەش کە ڕۆڵیان نەمابوو، ئەم دابەشکردنی گرنگی پێدانە پاساو بۆ هێنانەوەی شتێکی مەحاڵ بوو. کاری هونەریی لە بینینی تێگەیشتنی نوێی هونەرەوە لە یەکەیەکی دابەش نەبوو پێك هاتووە، بینەر دەبێت بە سەیرکردنێك پەی بە ڕووبەری تەواوی وێنەکە بەرێت لەسەر بنچینەی ڕێبیری بەربینەی چەقی[٢٢]. دەکرێت ئەو گرنگیدانە وردەکارییەی سەدەکانی ناوەڕاست وەسف بکەین بە ڕووکەشێك بۆ هەرچی زیاتر بوونی خواستێ بۆ هاوشێوە بوون لەگەڵ سروشتدا. بەڵام ڕێنیسانس ئەو ڕەسەنایەتییەی لە وەسف کردنی واقعدا بە دەستی هێنا لەسەر لۆژیکێکی ناوەکی بۆ شێوازی بینین و هاویەك بوونی بەرامبەر لە نێوان توخمەکانی کارکردندا وەستابوو. کە لەسەر هاویەك بوونی ئەو توخمانە بوەستێ لەگەڵ واقعی دەرەکیدا.

ئەمە هۆکارێکی جیایی ڕێنیسانسە لە سەدەکانی ناوەڕاست، دیاردەکانی ئەم جیاییە لە هێنانەوە بەرکایەی سەردەمی کلاسیکییەوە سەرچاوە دەگرێت کە دەکرێت وەك هۆکارێك ئاماژەی پێ بدەین، چونکە ئەو هەستە لە سەدەی چواردەهەمەوە هەبوو، دوژمنانی تیۆری کلاسیکی پەیوەستییەك لە نێوان هەستیاریی غنائی و هەست کردن بە سروشت و خواستی تاك گەرایی لای دانتی و جیۆتۆ بە ڕوویەکی تایبەت دادەنێن. هەرچۆن هەندێکی تر باس لە کاریگەریی کەلتوری مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەکەن لەسەر ڕێنیسانس.

جەماوەری هونەر لە ڕێنیسانسدا لە دوو بەرە پێك هاتبوون: چینی ناوەند لە شار و کۆمەڵگەی تەخت لە کۆشکەکاندا، هەرچەندە لە ڕێ و ڕێسایاندا جیاواز بوون بەڵام خاڵی هاوبەشییان هەبوو.

شێوازەکانی سوارچاکی و توخمەکانی هونەری کورتوازی لـە هونـەری غوتـیدا کاریگـەرییان کـردە سـەر هونـەری چینـی نـاوەند، هـەرچۆن کۆمەڵگـەی کۆشـك بۆیـان دەرکـەوت نـاکرێت بـێ خواسـتی واقعیەت و ئاوەزگەرای چینی نـاوەند بمێننـەوە. بـەم شـێوەیە یـەکگرتنێك لـە نێـوان ڕێبـازی چینـی ناوەند لە دانیشتوانی شارو ڕێبازی سوارچاکی ڕۆمانتیکی لە هونەردا بەدەست هات.

لە کۆتایی سەدەی پانزەهەمدا هونەرێك کە خاوەن سیمای چینی ناوەند بێت وەك هونەری فلۆرەنسی، مۆرکێکی وەرگرت کـە بـە پلـەی جیـاواز شـێوازی کورتـوازی لـەخۆگرتبوو، ئەمـەش شـتێك نـیـە تەنـها ئاماژەیـەك نـەبێت بـەو ڕێگەیـەی دیموکراتیـەتی شـاری گـەیاند بـە فەرمانڕەوایەتی ڕەهای میرەکان.

ئەودەمـەی چینـی نـاوەند گەیشـتە بـارێکی ئـابووری دەوڵەمـەند، پەرەسـەندنێکی هاوشـانی کلتوریشی بە دەست هێنـا کـە بـە مـاوەی مـەزنی یەکـەمی کلتـوری چینـی نـاوەند نـاودەبرێت. هونـەری جیۆتۆش زادەی ئەو دەمەیە، جیۆتـۆ بـە یەکـەم هونەرمـەندی گـەورە دادەنرێـت کـە خواسـتی هاوتـابوونی سروشـت بنوێنێـت لـە ئیتالیـا، ڕێـزی لـە مۆرکـی کلاسـیکی دەگـرت، هونەرەکـەی هونـەرێکی ئـاوەزی سادەکراوەیە. لـە دوای ئـەم هونەرمـەندەوە شـێوازی هونــەری فلۆرەنسی زیاتر لە سروشت نزیك بۆوە، هەرچەندە ڕێنیسانس هونەرمەندێکی بـەخۆوە نـەدی هێنـدەی ئـەو هـەوڵی دڵسـۆزانەی دابێـت تـا لـە وەسـف کردنـی واقعـدا سـادەو ڕاسـتەوخۆو ڕاستگۆبێت.

ئـەم شـێوازەی جیۆتـۆ کـە لێکچووە لەگـەڵ سروشـتدا بـاڵی کێشا بەسـەر هـەموو سـەدەی چواردەدا، یەکـەم گۆڕانکـاری گرنـگ کـە بەسـەر شـێوازی پێشـکەوتوی جیۆتـۆدا هـات لـە شـاری (سیینا)وە سەرچاوەی گرت. لە دوای ئەمبرۆجیۆ لۆرینزیتی کـە دوابـەدوای جیۆتـۆ لـە دیمـەنی سروشتیدا داهێنانی کرد، هونەرمەند سیمۆن مارتینی بەکارە فریسکۆکانی کە لـە کۆشـکی پاپـا لـە ئـەڤینۆن ئـەنجامی دا کاریگـەریی ئـەو گۆڕانکاریانـەی لـە سـەروو ڕۆژئـاوادا بەدەرخسـت: (گرنگی دانیان بە قوڵی "ڕەهەندی سێهەم" لەسەر تـەرزی جیۆتـۆ بـووە، بـەڵام لۆرینـزیتی گرنگی داوە بە سروش بەخشین لە شوێندا کە ئەمەش پێچەوانەی جیۆتۆ بووە).

لە دوا ساڵی ١٣٣٧[٢٣] ، بە ساڵانی شکستی هونەری شێوەکاری دادەنرێت لـە فلۆرەنسادا بـەڵام شاری سیینا لەبەر کاریگەریی چینی نـاوەند و بـەهێزی ڕێسا کۆمەڵایـەتی و ئاینیـەکان کـەمتر کاریگەری ڕێچکەی گۆڕانکارییە ئاوەزییەکانی لەسەر بوو.

لـە فلۆرەنسادا گۆڕانکارییـەکان و پێشکەوتنەکان هێـواش تـر و گونجـاو تـر بـوون لـە چـاو سییـنادا لە پاڵ ئەو ڕێڕەوانەی کاریگەری جیۆتۆیان لەسەر بوو لە فلۆرەنسادا ڕێڕەوێـك بـاوبوو

لە لایەن ئەندریا ئۆرکانیا (Andrea Orcagna) و ناردو دی چیونی (Nardo di Cione) و قوتابییەکانیانەوە، بە پێچەوانەی خواستی خۆبەخۆی ڕاستگۆیانەی نێو هونەری لۆرینزیتی (AmbrogioLorenzetti)، پابەندی شێوازی کهنوتی شکۆداری سەدەکانی ناوەڕاست بوو، لە هاویەك بوونی توندوتۆڵ و لە بیروباوەڕی (بەدوایەکداهاتن و کەڵەکەبوون). بە پێشنیهادی هەندێك ئەمە ڕەوتێك بوو دژ بە خواستی لێکچوونی سروشت[٢٤].

لە سەدەی پانزەدا سیینا وازی لە پێشڕەوایەتی هونەر هێنا بۆ فلۆڕەنسا کە ئەودەمە گەیشتبووە لوتکەی هێزی ئابووریی خۆی. بەڵام تەنها ئەم گەشەسەندنە ئابورییە هۆکاری ئەم پێشڕەوایەتی کردنە نەبوو. بەڵکو داواکاری بەردەوام لەسەر کاری هونەری کە چوبووە دوتوێی پێشبڕکێوە لەسەری، کەشێکی تایبەتی بۆ ئەفراندنی هونەرمەندانی فلۆڕەنسا ڕەخساند و فلۆڕەنساش (سەرباری ڤینیسیا) بووە پێشەنگی هەموو چالاکییەکی پێشکەوتنی گرنگ لە جیهانی هونەردا. بە جیاو سەربەخۆ لە شێوازی کورتوازی کە هونەری دوا سەدەکانی ناوەڕاست بوو لە ئەورووپای ڕۆژئاوا باوبوو. ئەوەی جێی تێبینییە فلۆڕەنسا کە چینی ناوەند تیا دەست ڕۆیشتوو بوو زانیاری و تێگەیشتنی بۆ هونەری کورتوازی خواستراو لە فەڕەنسا دیاری کراو بوو، ئەم هونەرە کە لە کۆشکی میرەکانی سەروی ئیتالیا بڵاوبوو بە بۆنەی نزیکی سەروی ئیتالیا لە ناوچەکانی ڕۆژئاواو پەیوەندی ڕاستەوخۆشی بەو ناوچانەوە کە بە فەڕەنسی دەدوان. وەك شارەکانی میلانۆ و ڤێرونا و بادوا و ڕاڤینا کە لە کۆشکەکانیاندا ئەدەبی سوراچاکی فەڕەنسی دەخوێندرایەوە و دیوارەکانیان و دەستنووسەکانیان بەو نیگارانە دەڕازاندەوە کە لە خودی شێوازە بنەڕەتییەکەی وەرگیرابوو، دەگەڕایەوە بۆ شێوازی نیگارە چنراوەکان (tapestry).

هونەرمەند پیزانیللۆ[٢٥] (Pisanello) نموونەی دیاری ڕاددەی کاریگەری ئەم نیگارە دیواربەندانەیە لەسەر هونەری ڕێنیسانس بە تایبەت لە پشتینە (باك گراوند)کانیاندا کە ڕازاوەیە بە دیمەنی سروشتی لە گیاو گوڵ و گیانەوەر بە شێوازێکی وردەکاریی تەواو زیندوو. ئەوەی لێرەدا گرنگە بیزانین ئەوەیە کۆنترین ئاسەواری ئەم هونەری کارکردنە لە ئیتالیادا ناگەڕێتەوە بۆ کۆنتر لە سەرەتای سەدەی پانزە. چون ئەوەی بۆ کۆنتر بگەڕێتەوە گەر شتێکی کەمیش بێت ئەوا جیاوازی هەر هەیە. پێگەی سەرەکی ئەم شێوازی نیگارکێشانە زەخرەفییە قەڵاو کۆشکەکان بوو زیاتریش کۆشکی میرەکانی سەروی ئیتالیا کە زەخرەفەی دیواربەندی دەوڵەمەندی ڕازاوەی تیا بەرجەستەکراوە. بە تایبەت قەڵای کانجراندی Cangrande لە ڤێرونا و قەڵای کارارا Carara لە پادوا.

بە پێچەوانەی هونەری ئەم قەڵاو کۆشکانە سیمای هونەری کۆماری شارەکان کەنیسەیی بوو بە درێژایی سەدەی چواردە، ئەمەش لە سەدەی پانزەدا گۆڕڕاو سیمایەکی دنیای وەرگرت پشت بە داواکاری تایبەتی نوێ لە هونەردا و خواستی ئاوزەیی گشتگیری سەردەمەکە، وای کرد وێنە ئاینی‌یەکان لێوان لێوبن لە بابەتی دنیایی جگە لە بەدەرکەوتنی جۆرەها هونەری دنیایی وەك نیگارکێشانی نۆڤلێتی و نیگاری کەسایەتی. لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەوە بە یەکجارەکی هونەری کۆشك لە هونەری چینی ناوەندا دەرکەوت بە تایبەتی لە فلۆرەنسادا، تا بە شێوەیەکی سادە ئەدەبی کۆشك بووە هونەرێکی میللی و گەیشتە دەست هەموو کەسێك[٢٦]. بەڵام ناکرێ ئەوەش لە یادکەین کە ئەم ئەدەبە لە سادەبوونەوەیی و میللی بوونیدا سیما نمونەیی‌یە ڕەسەنەکەی خۆی وون کرد و بووە تەنها خوێندنەوەیەکی سەرپێ‌یی.

بەڵام هونەرمەندانی وەك مازاتشۆ (Masatccio) و دۆناتێللۆ (Donatello) کە گەورە هونەرمەندانی نەوەی یەکەمی سەدەی پانزە بوون، هەر لە هونەری پتەوی جیۆتۆوە نزیك بوون و کاریگەریی هونەری کۆشکیان کەمتر لێ دەرکەوت، ئەمەش بە گەڕانەوەی چینی ناوەند بۆ سەرەتاو تێکشکانی بوو (بەرەنجامی شکستی دارایی و شۆڕشی پیشەگەراکان). ئەم گەڕانەوەیە بۆ واقعیەت و دەست بەرداربوونی هەڵچون و شێوازی ڕازاندنەوەیە تاکە سیمای هونەری سەدەی پانزە نەبوو بەڵکو هاوشانی هونەری شێوە پەیکەری مازاتشۆ و دۆناتێللۆ (کە دەچووە سەر هونەری ڕێنیسانس)، کلتوری غوتی ڕۆحانی هەر بەردەوام بوو[٢٧].

ئەم ڕێبازە سەربەخۆیانە کۆمەڵێك نەبوو گوزارشتێکی ڕەهایانەی لێبکات بەڵکو لە یەك نەوەدا یاخود کۆمەڵێك هونەرمەندی هاوتەمەن دا جیاوازی هەبوو، تەنانەت ڕێدەکەوت زەینی هونەرمەندێك شێوازی دژ بەیەکی لەخۆ دەگرت، بۆ نمونە هونەرمەندێکی وەك فرا ئەنجلیکۆ تیایدا توخمەکانی کەنیسی و دنیایی سەردەمی غوتی و ڕێنیسانس تێکەڵ بوون، بە ڕاددەیەکی پتەوی وەها کە هیچی کەمتر نی‌یە لە پلەی تێکەڵ بوونی ئاوەزگەرایی و ڕۆمانتیکی و توخمی چینی ناوەند و کۆشك لە هونەری هەریەك لە کاستیانۆ و ئۆتشیللۆ و پیزانیللۆ و گۆزۆلی. (Go zzoil)

بەم شێوەیە سنوری جیاکەرەوە لە نێوان دواکەوتوان لە سەردەمی غوتی و ڕێخۆشکەران بۆ ڕۆمانتیکیەتی چینی ناوەند (کە پەیوەستی شێوازی غوتی‌یە) لە زۆر لایەنەوە سنورێکە توانای دیاریکردنی بنەبڕی نی‌یە.

خواستی (لێکچون لەگەڵ سروشتدا) کە ڕێبازی هونەریی سەرەکی بوو بۆ هەموو ئەو سەدەیە بە پێی گۆڕانکاری و پەرەسەندنە کۆمەڵایەتی‌یەکان گۆڕڕا لە ڕێڕەویدا، سێ شێوازی بەخۆوە دی.

١)خواستی لێکچونی سروشت لای مازاتشۆ کە سیمای شێوازی باڵاو سادەیی دژ بە شێوازی غوتی بوو.

٢)گرنگیدان بە ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکان و ڕێژەی جێگەیی ئەو دەوڵەمەندییەی سیمای ژیانی ڕۆژانە بوو لە هونەری گۆزۆلیدا.

٣)هەستیاری و دەرون خوازی لای بۆتشیللی.

ئەم سێ شێوازە نمونەی سێ قۆناغی جیاوازن لە پێشکەوتنی مێژوویی بۆ چینی ناوەند. چینی ناوەند هەموو شتێکی بە ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەچواند تەنانەت بابەتە ئایینیەکانیش. دیمەن لەسەر شەقامەکان و ناوماڵەکان و ژوری نووستن و دیمەنی ئاهەنگ گێڕان و مزگێنی و لە دایك بوون و مریەم هەموو وەك دیمەنێکی کۆمەڵایەتی نمایش دەکران.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا هونەر لە فلۆرەنسادا (سەرباری ئەمانە گشت) بەدەربوو لە ڕێساکان تا کۆتایی ئەم سەدەیە. جەماوەری هونەرمەندانی وەك بۆتشیللی ڤیرکۆ هەرگیز هاوبەش نەبوون لە هیچ شتێکدا، لەگەڵ ئەو چینە ناوەندەی کە ڕۆژگارێك مازاتشۆ و دۆناتێللۆ کاریان بۆ دەکردن.

بەرەنجامی ئەم ڕێبازانە لێکدانێکی کۆکەرەوە ڕوویدا لە نێوان خواستی لێکچونی سروشت و خواستی پەیڕەوکردنی ڕێساکان، واتە لە نێوان ئاوەزگەرایی و ڕۆمانتیکیەت. کە لە هەمان ساتدا بووە مایەی دروست بوونی هونەرێك کە سیمای مۆرکێکی ڕێزگرتنی خودی بۆ چینی ناوەند فەراهەم بکات. ئەو چینە ناوەندەی تا ئەودەمە ئەیویست گوزارشت لە خۆی بکات بە شێوەیەکی کۆمەڵی نەك خودی، کە دواتر کردیە مۆرکی خۆی.

ئەنجومەنە خۆجێیە ئیتالیەکان داراییەکی باشی خەرج دەکرد لەسەر ئەم گورجوگۆڵیە هونەریانە دەق وەکو ئەوەی شارە یۆنانیەکان دەیان کرد لە کاتی خۆیدا. تەنانەت ئەم خواستە شارە بچوکەکانی پیزا و لۆکاشی گرتبۆوە دوابەدوای فلۆرنسەو سیینا.

پارەیەکی زۆر بە زیادەڕۆیی خەرج دەکرا لە پێناو داواکاری کاری هونەریدا، کارەکە دەگەیشتە ئاستی پێشبڕکێ سازدان بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە، دیارترین نمونە ئەو پێشبڕکێیە بوو ساڵی ١٤٠١ بۆ دەرگا برۆنزییەکانی هەیکەلی شۆردنگەیان سازدا لە نێوان شەش هونەرمەنددا[٢٨]. سیو چوار هونەرمەند دەست نیشان کرا بۆ بڕیاری کۆتایی کە ساڵێك مۆڵەتیان درابوێ بۆ کارکردن.

لە سەرەتادا ئەو کارە هونەرییانەی چینی ناوەند لە هونەرمەندی داوا دەکرد بە بەرهەمی بێنێت لە پێناو بەخشینی بوو وەك دیارییەك بە کڵێسەو دێرەکان، بەڵام لە نیوەی ئەم

سەدەیەوە ئەم چینە فێربوون کاری دنیایی و تایبەت بە ژمارەی زۆر داوا بکەن ماڵ و کۆشك و قەڵاکانیان پێ برازێننەوە. تا وای لێهات زۆر زیاتر لە کەنیسە تایبەتەکانیان گرنگییان بە ماڵەکانیان دەدا و پارەیەکی زۆر لەم پێناوەدا خەرج دەکرا[٢٩].

بە هاتنی سەردەمی کۆکەرەوەی تابلۆکان هونەر چووە قۆناغێکی تری پێشکەوتنی کارکردنەوە، چون پەیوەستییەکی مێژوویی پتەو لە نێوان هونەرمەندو کۆکەرەوەی کاری هونەریدا هەیە. هاتنی ئەم سەردەمە هونەرمەندی سەربەخۆو ئازاد کرد، بازاڕی لە دەسەڵاتی داواکردنەوە گواستەوە بۆ دەسەڵاتی خستنەڕوو. پەیدابوونی ئەم جۆرە کڕیارە مانای کۆتایی هاتنی ئەو سەردەمەی کڕیار تیا بڕیاردەر بوو لە هونەردا.

ئەمە خۆی بۆ خۆی جیابوونەوەی هونەر بوو لە پیشەو جۆرێك لە سەرەتای سەرهەڵدانی خواستی (هونەر لە پێناو هونەردا)ی لە مناڵدانیدا هەڵگرتبوو.

جوڵەی کۆکەرەوە و کڕیارانی تابلۆو کاری هونەریی لە کۆتایی سەدەی پانزە و سەرەتای سەدەی شانزە دەستی پێکرد[٣٠].

مەلیك لۆرینزۆ خۆی لە کۆکەرەوەکانی بەرهەمی هونەریی بووە و شاعیر و فەیلەسوف و دامەزرێنەری یەکەم ئەکادیمیا بووە بۆ هونەر لە جیهاندا، کە هونەرمەندی پەیکەرساز برتۆڵدۆی کردۆتە بەڕێوەبەری ئەو ئەکادیمیایە. هونەرمەندانێکی زۆری لە خۆی کۆکردۆتەوە سەر بە ئەفلاتۆنیزمی نوێ بووە و دیدگای تێڕامانی پەتی بووە بۆ جیهان. سەردەمی ئەو بەراورد کراوە بە سەدەی مەزن[٣١].

جگە لە فلۆڕەنسا بنکەی تر سەریهەڵدا لە سەدەی پانزەدا بۆ چاودێری هونەر کە گرنگی خۆیان لە دەست نەدا هەتا کۆتایی ئەو سەدەیە وەك: تەختی فیرارا، مانتواو ئۆربینۆ کە بە شێوازی سەروی ئیتالیا کاریان دەکرد لە سەدەی چواردەدا و کاریگەریی شێوازی چینی ناوەندیشیان فەرامۆش نەکرد. لە فیرارا سۆزی کارکردن بەلای هونەری غوتی فەرەنسیدا زیاتر دەچوو. بەڵام لە مانتوا پەیوەست بوون بە هونەری لێکچوی سروشتی سەر بە خواستی ئیتالی زیاتر بوو. جیاوازی لە هونەری چینی ناوەند لە هەردوو بارەکەدا جیاوازی بابەت بوو نەك شێوە.

هونەرمەندان لەنێو کۆشك دادەنیشتن بە هەمان شێوە ی ئەدیبە هیومانیزمەکان، ئەمەش گۆڕانکارییەك بوو لە خودی تەختی کۆشکەکاندا. میرەکانی سەردەمی ڕێنیسانس لە پێناو هەڵخەڵەتاندنی میللەتدا مەبەستیان بوو لەگەڵ چەندانی توێژ و چینەدا هەڵسوکەوت بکەن و بە دەستێ لەگەڵ چینی پاوماقوڵان و بە دەستێ لەگەڵ دەوڵەمەند و بازرگانی سەرکەوتوو کەسانێکی سەرکێش بەبێ گوێدانە بنەچەو بنەماڵەیان. ئەمەش بە پێچەوانەی داب و نەریتی

باوی کۆشکەکانی سەردەمی سوارچاکی بوو، لە کۆشکی ئەم میرانەدا جۆرێك لە ئازادی ڕێژەیی لە ژیانی ساڵۆنەکان هەبوو کە لەسەر بنەمایەکی ئاوەزی دەچوو بەڕێوە. ئەم شێوازە لە ژیانی کۆشکدا بەردەوامی‌یەکی کلتوری کۆمەڵی بوو بۆ نێوەندەکانی چینی ناوەند لە لایەك و لە لایەکی تریش قۆناغێکی ڕێخۆشکەر بوو بۆ پەرەسەندنی ئەو ساڵۆنە ئەدەبیانەی کە ڕۆڵێکی مەزنیان گێڕا لە ژیانی ئاوەزگەرایی ئەوروپای هەردوو سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم. هەرچەندە ئافرەتان هاوبەش بوون لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەدەبی‌دا هەر لە سەرەتاوە بەڵام لە ڕێنیسانسدا نەبوونە خولگەی ئەم ساڵۆنانە تا هاتنی چینی ناوەند و پتەوبوونی پێگەی ئافرەتان ئەوجار بوونە سەنتەر بەڵام جیاواز لەو مانایەی لە سەردەمی سوارچاکی‌دا هەیان بوو. ئەم گرنگی پێدانەی ئافرەت و ئەو ڕۆڵەی بینی گوزارشتێکی ترە لە خواستی ئاوەزی ڕێنیسانس. ئەم هاوبەشی کردن و هاتنە ناوەوەی ئافرەتە بە ئاستێك بووە کە سەرپەرشتیاری هەندێ کۆشکیان کردووە[٣٢]. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ڕێنیسانس سەردەمێکی نێرینە بوو. گەر لە چێژوەرگرتن و هوشیاری هونەری بدوێین دەرئەنجامی ئەوەی لە پێشتر زانیمان دەربارەی ئەم سەردەمە، ئەوا ناکرێ میرەکان و بنەماڵەکان بە ئاستێکی پێودانگ دابنێین بۆ هونەرێکی ڕاستەقینە، چونکە ڕێکەوتی ڕووداوی سەیر دەکەین لە جۆری مامەڵەکردنی هونەریاندا بۆ نمونە سیجسمند و مالاتستا (SigismondoMalatesta) لە میرە زۆردارەکان بووەو کەچی بۆ کارە هونەری‌یەکانی بە مەزنترین هونەرمەندی سەردەمەکەی خۆی پیرۆردیلافرنشکا پشتی بەستووە، لە هەمان کاتدا دەبینین هونەرمەندێکی گەورە و گرنگی (نەوەی دوای ئەو) وەك مانتێنا Mantegna کاری بۆ لورینزۆ میدتشی مەزن نەکردووە بەڵکو بۆ ئەمیرێکی بچوکی ئاسایی بەناوی لودفیکو جونزاجا کردووە. ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی چێژوەرگرتن و هەڵسەنگاندنی باش لەلای میرەکان و تەختی کۆشکەکانیش نەبووە، ئەمە بێ لەوەی چەندان کاری هونەریی پلەدوو پلە سێ لە کۆشکی ئەم میرانەدا هەبووە، ئەم حاڵەتە لەلای چینی ناوەندی شارەکانیش لەمە باشتر نەبووە. بۆیە ئەو بیروباوەڕەی وا دەزانێت کە چێژوەرگرتنی هونەریی لە سەردەمی ڕێنیسانس دا گشت گیربووە، هەر بە هێندایی ئەو بیروباوەڕە ڕاستە کە هەموو بەرهەمە هونەری‌یەکانی ڕێنیسانس بە ئاستێکی باڵا بزانێت.

خۆ ئەگەر بارەکە لەلای چینە باڵاکان بەو شێوەیە بوبێت ئەوا لە چینە نزمەکاندا باشتر نەبووە[٣٣]. کەواتە دەبێت ئەو توێژەی گرنگی داوە بە هونەر کێ بوبێت؟ هەڵبەتە توێژی هەژار و کرێکاری برسی نەبووە، بەڵام ڕەنگە بەشێکی باشی ئەو توێژە لە بۆرجوازی‌یە بچوکەکان بوبێت. لێرەدا گرنگ ئەوەیە گرنگی دانی جەماوەری و گشتی بە هونەر لە پاڵپشتێکی ئاینی و

ناوچەیی‌یەوە سەرچاوە دەگرێت وەك ئەوەی زیاتر لە خودی هونەرەکە خۆیەوە بێت. زۆر ئیشی کۆمەڵی لەسەر شەقامەکان دەکرا بە ڕاددەیەکی زۆر، ئاهەنگێکی گشتی یاخود کەژاوەیەکی کەرنەڤاڵ یاخود پرسەی گشتی هیچی زیاتر نەبوو لە پیشاندانی تابلۆیەك لە لایەن لیۆناردۆوە کە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ خەڵکی سەرەیان گرتووە بۆ تەماشاکردنی یاخود دوکان و بازاڕ داخستنی خەڵکی و چونیان بۆ گوێ گرتن لە شاعیرێك کە شیعری خوێندۆتەوە بۆیان. بەڵام دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە زۆربەی ئەو خەڵکە جیاوازی نێوان هونەری لیۆناردۆ و هاوسەردەمێکی تریان نەزانیوە. هەرچەندە ئەو بۆشاییەی کەوتۆتە نێوان ئاستی کارە هونەرییەکەو میللی بوونی بە ڕاددەی ئەمڕۆ فراوان نەبووە. بگرە ئەو بۆشاییە ئەو ڕۆژگارە سەری هەڵدا. هەندێ جاریش بووە ئەو بۆشاییە تێپەڕێنراوە واتە ئەوەی بە بەها بووە لە هونەردا هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی تەنها خاوەن وشیارییەکانی هونەر بە بەهاکەی بزانن.

گومانی تیانییە هونەرمەندانی ئەو سەردەمە خاوەنی جۆرێك لەناو و ناوبانگ بوون. بەڵگەی ئەمەش ئەو هەموو چیرۆك و بەسەرهاتانەیە کە لەسەر هونەرمەندان بڵاو بوون لەو سەردەمەدا. بەڵام ئەم ناوناوبانگە لەبەر خاتری تواناو لێهاتویی هونەریی نەدراوە پێیان، بەڵکو لەبەر بەڕێوەبردنی ئەرکێکی گشتی و بەشداری پێشبڕکێ و پیشاندانی کارەکانیان بووە.. هتد لەگەڵ ئەمانەشدا هونەری شێوەکاری بە گشتی نەچۆتە ئاستێکی میللییەوە، هەرچەندە کاری هونەریی باڵا لە نرخیاندا بە پێی ئەو سەردەمە گران نەبووە و داواکارییەکی زۆر هەبووە لەسەر هونەر لە هەردوو شاری فلۆڕەنسا و سیینا بەڵام هێندەی میللی بوونی شیعر یاخود سرودە ئایینییەکان و چیرۆکە جەماوەرییەکان هونەر نەیتوانیوە جەماوەریی بە دەست بێنێت. بەرهەمێکی فراوان و بڵاو لە هونەرێکی ڕووکەشی ئاست نزم لە بەکارهێنانێکی میللیدا هەبووە بەڵام کارە جیدییەکان هەر دورە دەست ماوەتەوە لە خەڵکی گشتی. بگرە لە گەلێك لەو ماڵانەدا کە باری ئابورییان باش بووە کاری هونەریی شیاو بەرچاو ناکەوێت. ئەمانە گشت لە کاتێکدا گەر بمانەوێت وێنای ئەو خەرجییە زۆرەی بۆ هونەر کراوە لەو سەردەمەدا بکەین دەبینین لە فلۆڕەنسا لە نێوان ساڵانی ١٤٠٩ بۆ ١٤٩٩ لە لیستی دەستەی پیشەگەراکاندا ناوی چل و یەك هونەرمەند هاتووە و هەشتاوچوار نەخش سازی تەختە ئەمە لە کاتێکدا حەفتا قەساب هەبووە لەو شارەدا، لە لایەکی ترەوە هەموو ئەو هونەرمەندانەی دەناسرێن ناویان لە لیستی ئەو دەستەیەدا نەهاتووە ئەوانەش کە ناویان هاتووە هەموویان ناناسرێن[٣٤].

شارستانیەتی ڕێنیسانس شارستانیەتی پیشەگەر و چینی ناوەندی نیمچە خوێندەوار نەبووە بەڵکو شارستانیەتی "هەڵبژاردەیەکی ڕووناکبیری خاوەن ڕۆشنبیری لاتینی" بووە کە ئەم دەستەیە پەیوەست بوون بە بزاڤی هیومانیزم و ئەفلاتونیزمی نوێوە. مەبەست لێرەدا چینێکە لە ڕۆشنبیران کە ڕێك کەوتن و هاوشێوەییەکی ئاوەزی کۆی کردونەتەوە بە شێوەیەك کە هەرگیز لە پیاوانی ئاینیدا نەبووە. خەڵکیش بە گشتی یا هیچ زانیارییەکیان دەربارەی ئەم کارانە نەبووە، یاخود گەر زانیبێتیشیان هێند گرنگیان پێ نەداوە. ئەمەش بنەڕەتی ئەو دورییەیە کە لە نێوان کەمایەتییەکی هوشیار و زۆربەیەکی ناهوشیاردایە. کە لەوەوپێش هەرگیز لەسەر ئەم ئاستە نەبووە و ئەمەش بووە هۆکاری یەکلاکەرەوەی هەموو پەرەسەندنێکی دواتری هونەر. لێرەدایە گۆڕانکاری سەرەکی کە ڕوویدا لە ڕێنیساندا. هیومانیزمەکان بە لاتینی دەیانووسی چۆن ئەیانویست جیاببنەوە لە ڕێبازە جەماوەرییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و زمانە نەتەوایەتییە جیاوازەکان. ڕۆشنبیریی بۆ خۆیان قۆرخ بکەن، لەمەدا لە چینێکی قەشەیی داخراوی نوێ دەچون، هونەرمەندەکانیش خۆیان خستە ژێر باڵ و چاودێری ڕۆحانی ئەم کۆمەڵەوە. بە وتەیەکی تر خۆیان لە دەست کڵێسەو دەستە پیشەییەکان ڕزگار کرد و پشتیان بەست بە چاکی نیازی کۆمەڵێك بانگهێشتی هەردوو دەسەڵاتی کڵێسەو دەستە پیشەییەکانی بۆ خۆی دەکرد، بەو هۆکارەی ڕۆشنبیرانی هیومانیزم ببوونە دەسەڵاتێکی ڕەها لە گشت مەسەلە هونەرییە خاوەن بەها مێژوویی و ئەفسانەییەکاندا، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو دەستیان کردبوو بە تایبەتمەندێتی وەرگرتن لە چەندان مەسەلەدا خاوەن سیمای شێوە و تەکنیکی. ئەمەش ئەو نرخە بوو کە دەبوو هونەرمەندەکان بیدەن تا بەرزبوونەوە لە پلەی کۆمەڵایەتیداو ناوبانگ و سەرکەوتن بە دەست بێنن لە ڕێی بڕیاری ئەرێتی ڕۆشنبیرێکی هیومانیزمەوە لە سەریان کە لە بنەماکانی هونەر شارەزا بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو هیومانیزمێك ڕەخنەگرو لێزان نەبوو لە ڕێساکانی هونەر، بەڵام بیرۆکەیان دەرباری پێودانگە ڕاستەقینەکانی نێو هونەر بە شێوەیەك بوو کە توانای بڕیاردانیان لەسەر کاری هونەری هەبوو بە پێی بنەما ئیستاتیکیەکان. هەر لەبەر ئەم توانایەیان ئەوان بە سەرەتای جەماوەری هونەر ناوزەد دەکرێن بەو مانا نوێیەی ئەمڕۆ لەو چەمکە تێدەگەین.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە پێش ڕێنیسانس هەست و چێژوەرگرتن بەلایەنی جوانی کاری هونەریی نەبووە، بەڵکو ئەم هەست کردن و چێژوەرگرتنە بە ئاگاوە نەبووە، واتە (نەستی)

بووە. هەموو گرنگیەك لە سەدەكانی ناوەڕاستدا دراوەتە لایەنی بابەتی كاری هونەریی. بەڵام ئەو گۆڕانكارییەی بەسەر هەڵوێستی ڕێنیسانسدا هات دەربارەی هونەر و ئەدەبی كلاسیكی گۆڕانێك بوو لە گرنگی دان بە ناوەڕۆكی مادی بۆ توخمەكانی شێوە لە پرۆسێسی كاری هونەریدا. لە ڕێی ئەم گۆڕانكارییەوە جەماوەر لە گۆشەنیگای تایبەتی خودی هونەرمەندەكانەوە دەیان ڕووانییە هونەر (واتە لە دیدگای هونەر خۆیەوە) نەك بڕیار لەسەر كاری هونەری لە دیدگای ژیان و ئاینەوە بدات. هونەری سەدەی ناوەڕاست لە پێناو لێكدانەوەی ژیان و بەرزكردنەوەی مرۆڤ دا بوو، بەڵام هونەری ڕێنیسانس لە پێناو دەوڵەمەندكردنی ژیان و خۆشی بەخشین بە مرۆڤ دابوو. لە پێناوی بەدیهێنانی ئەم مەبەستەشدا بوونی هونەری سەربەخۆ یاخود هاتنەكایەی بیرۆكەی هونەری سەربەخۆ پێویستە بە دور لە كەڵك یاخود بە دوور لە بوونی مەبەستێك یا خزمەت كردنی مەبەستێك، بوونی ئەم هونەرەش كە بەدوربێت لە كەڵك پێشتر زانراوە هەر لە سەردەمی كلاسیكیەوە، بەڵام ئەوەی تەنها ڕوویدا ڕێنیسانس سەرلەنوێ تیشكی خستەوە سەر كە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لەبیرچوبۆوە. تا ڕێنیسانس بە بیر كەسدا نەدەهات ئەو ژیانەی بۆ چێژوەرگرتن لە هونەر تەرخان دەكرێت لە بەرزترین شێوەكانی ژیانەو باڵاترینیانە. ڕاستە ئەفلاتون و ئەفلاتۆنیزمی نوێ مەبەستێكی باڵایان دەبەخشیە هونەر، بەڵام لە هەمان كاتدا سەربەخۆییان لێ زەوت دەكرد و دەیان كردە تەنها كەرەسەیەك بۆ زانینی ئاوەزی.

بیرۆكەی ئەو هونەرەی پارێزگاری بە سەربەخۆیی سروشتی ئیستاتیكی خۆیەوە دەكات و دەبێتە هێزێكی فێركاری سەرەڕای جیایی لە جیهانی ڕۆحانی، ئەمەش تەنها بە هۆی جوانی ڕەهاوە -ئەمە بیرۆكەیەكە بترارك پێشتر ئاماژەی پێداوە- بیرۆكەیەكە بە دوور لە گیانی سەدەكانی ناوەڕاست بە هێندایی دوری لە گیانی سەردەمی كلاسیكییەوە.

لە ڕاستیدا خواستی ئیستاتیكی ڕێنیسانس سەراپا بە دوور بووە لە هەردوو سەردەمی ناوەڕاست و كلاسیكی. ئەمە سەرباری جێبەجێكردنی پێوەری هونەر و دیدە نیگا لەسەر خودی ژیان كە زۆر نامۆ نییە بە سەردەمی كلاسیكی كۆن، بەڵام ئەستەمە لە هیچ سەردەمێكدا نمونەی ئەو بەسەرهاتەمان چنگ كەوێت دەربارەی ئیماندارێك لە سەردەمی ڕێنیسانسدا دەگێڕێتەوە كە لەسەر پێخەفی مەرگ ڕەتی كردۆتەوە خاچێك ماچ بكات لەبەرئەوەی ناشیرین بووە و داوای خاچێكی جوانی كردووە.

دەبێت ئەوە بزانین چەمكی سەربەخۆی ئیستاتیكی لە ڕێنیسانسدا بیرۆكەیەك نەبوو بگەڕێتەوە بۆ خواستی هونەرێكی پەیت. هەرچۆن سەربەخۆیی هونەریان نەكردۆتە مەسەلەی

مەبدەء. بەڵام هەر لەم سەدەیەدا هونەر یەكەمین شارەزایيە زانستیيەكانی خۆی پەیدا كرد ئەمرۆ -تا ڕاددەیەكی باش- لەسەر ئەو سەرمایەیە دەژی كە لەو ڕۆژگارەدا بە دەستی هێنا.

## دەربارى ڕۆڵی هیومانیستەكان

ڕۆڵی گرنكی هیومانیستەكان لە ڕێنیسانسدا جێی مشت و مڕێكی زۆرە بە ڕاددەیەك هەندێ جار لێكدانەوەی هەڵوێستەكانی بەرامبەریان كەوتۆتە باری دژ بە یەك و جۆراو جۆرەوە. لە دوای ئەوەی ئاماژەی ئەوەیان پێ دەدرێت كە هەوڵی لەخۆگرتنی ڕۆشنبیری دەدەن لە ڕێگەی بە لاتینی نووسینیانەوە، لە هەمان كاتدا بەوە ناوزەد دەكرێن كە خاوەن خواستە هومانیستەكان یەكەمین نووسەرێك بوون ئاراستەی ووتاریان لە فراوانترین جەماوەر بووە. نووسین و كتێب و وتارەكانیان بە یەكەم شێوەی ڕۆژنامەگەری نوێ دادەنرێت. هەرچی نامەكانیان كە لە نێوان جەماوەرێكی پان و پۆڕدا هێنراوەو براوە لە بری ڕۆژنامەی ئەو سەردەمانە بووە.

پلەو پایەو موچەو خەلاتیان لە دەوڵەت وەرگرتووە لە بری شێوازە كۆنەكەی خانوو خواردن بەخشیش دەدرا بە نووسەر و ئەدیب و شاعیرەكانی كۆشك. خەرجییەكی زۆریان بۆ دەكرا لە لایەن دەوڵەتەوە، چون چینە باڵاكان وەك پێویستی پارێزگاری كردن لە ڕووكەشێكی خێزانی باڵا تەماشایان دەكرد. هەر خاوەن سامانێكی گەورە ئەدیبێك لە نووسەرەكانی خواستی هیومانیزمی لە خۆ گرتبوو لە ماڵەكەیدا. بەمە بۆرجوازیەتی گەورە ئەیویست هاوپەیمانیەكەی لەگەڵ ئەرستۆكراتیەتدا هەر هاوپەیمانیەكی ئابوریی نەبێت بەڵكو دەیویست بچێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ ئەرستوكراتیەتی ئاوەزی. هاوپەیمانی یەكەم بنەچەی باڵای پێ دەبەخشێ، بەڵام هاوپەیمانی دووەم پێگەی ئاوەزیی باڵا دەكات.

خاوەن بیروباوەڕی هیومانیستی، ئەوانەیان كە كاریان لەژێر سێبەری ئەو بیروباوەڕەدا دەكرد كە ئەوان ئازادن وەك ئاوەز، وەها بیریان دەكردەوە كە پشت بەستنیان بە چینی دەسەڵاتدار سەرشۆڕی دەبێت بۆیان. چاودێری و پاراستن (Patronage) ئەو یاسا كۆنەی كە شاعیر لە سەدەكانی ناوەڕاستدا وەك مەسەلەیەكی باوەڕپێكراو گرتبوی، مایەی كێشە و مەترسی بوو بۆ هیومانیستەكان. پەیوەندی نێوان چینی ڕۆشنبیران و خاوەن موڵك و دارایی شێوەیەكی هێجگار ئاڵۆزی لەخۆ گرتبوو.

ئەوان لە سەرەتاوە دیدگایەكی ئورفییان هەبوو، وەهاش دەیانڕووانیە خودی سامان و دارایی كە شتێكە بێ بەها. هیچ شتێكیش نەبوو ئەم بیروباوەڕەیان پێ بگۆڕێت تا قوتابی و

مامۆستا و ئەدیب بوون، بەڵام وەختێ تێکەڵاویان دروست بوو لەگەڵ چینی دەسەڵاتداردا بە ڕێگەیەکی پتەوتر، دژایەتی‌یەك دروست بوو لە نێوان بیرکردنەوە کۆنەکانیان و شێوازی ژیانی نوێیان کە بەسەریدا زاڵ نەدەبوون.

گەر بگەڕێینەوە سەر سوفستائی‌یەکی یۆنانیو وتاربێژێکی ڕۆمانی و قەشەیەکی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە بنەڕەتدا هەڵوێستیان لە ژیان تێڕامانی بووە، جگە لە کاری فێرکردن و بەرامبەر وەستانەوەی چینە دەسەڵاتدارەکان ئەرکێکی تریان مەبەست نەبووە. بەڵام هیومانیستەکان یەکەمین ڕۆشنبیرانێك بوون داوای پلەو پایەیان بۆ خۆیان کردووە. ئەو لە خۆباییە ئاوەزیەیان (کە دیاردەیەکی وا پێشتر نەبووە)، ئەو چەکە سایکۆلۆژیەیە کە بەرگری لەخۆ پێ دەکەن و وەك پەرچە کردارێك بەکاری دێنن بەرامبەر هەر کەوتنێك توشی ببن.

چینە دەسەڵاتدارەکان وەك سەردەمی ئەفلاتون چۆن هەستیان بە ترسناکی شێوازی بیرکردنەوەی سوفستائی‌یەکان دەکرد، هەستیان بە گومانێك دەکرد کە ناشارێتەوە سەرباری هەموو هاوسۆزی‌یەکیان لەگەڵ بزاڤی هیومانیستەکان.

هیومانیستەکان بەم هەڵوێستەیان خزمەتی بەرژەوەندی‌یەکی پارێزکاریان دەکرد بەبێ ئەوەی لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا بگونجێن، ئەو هەڵوێستە نەرێتی‌یەیان دەبووە مایەی هەرچی زیاتر بە تواناکردنی ئەوانەی دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتبوو.

خاوەن خواستی هیومانیستی پابەندی خۆی بە واقعەوە وون دەکات و دەبێتە ڕۆمانتیکی، نامۆبوونی خۆی لە جیهان ناودەنێت گۆشەگیریی و گوێ نەدانی کۆمەڵایەتی بە ئازادی ئاوەز ناودەبات.

هەروەك نووسەرێك لە ڕێنیسانسدا دەربارایان نووسیویەتی:

گرنگترین شتێك لای ئەوان ئەوە نی‌یە دەسەڵاتداران بڕووخێنن، بەڵکو باسێك دەربارەی دۆڕاندنیان بنووسرێ.. جوانی کردووە جێی خۆی بۆ جوانی شێواز چۆڵ کرد.

هونەرمەندەکان هێندی ئەوان لە هاوسەردەمەکانی خۆیان نامۆ نەبوون، بەڵام گونجاندنیان بۆ نەدەکرا لە نێوان دوریانی خواستی ئەرێتی‌یەکی کارا (activism) و خواستی ئیستاتیکی (aestheticism). ئەو پەیوەستی‌یەی سەدەکانی ناوەڕاستیان ون کرد کە لە نێوان شێوە هونەری‌یەکان و مەبەستەکانی دەرەوەی بواری هونەری‌دایە.

گرنگی‌دانی هیومانیستەکان بە لایەنی ئیستاتیکی و کاریگەریشیان لەم میانەوە لەسەر هونەرمەندەکان ئەوە ناگەیەنێت کە هیومانیستەکان تەنها بیرباری ئیستاتیکی بن و رامیاریی نەبن، قسەزانی تەوەزەل یان هەڵاتوی ڕۆمانتیکی بن، بەڵکو چاکسازێکی دڵگەرم بوون بۆ

جیهان، پێشـڕەوانێکی سەرسـەختی پێشکەوتن، سـەربارى ئەمانـەش مامۆسـتای ماندونـەناس و گەشبین بە دوارۆژ. نیگارکێشان و پەیکەرسازانی ڕێنیسانس قەرزاربارى ئەوانن، نـەك هـەر بـە خواسـتە جوانی‌یـە ڕووتـەکانیان و بـەس بـەڵکو بـەو بیروباوەڕەیـان کـە هونەرمـەند دەکاتـە پاڵەوانێکی ڕۆحانی و هونەریش دەکاتە مامۆسـتای مرۆڤایـەتی. ئـەوان یەکـەم کەسـانێك بـوون وایان لە هونەر کرد ببێتە پێکهاتەیەکی سەرەکی لە ڕۆشنبیری ئاوەزی و ئاکاریدا.

## چەمکی هونەری ڕێنیسانس

هونـەر بـە چەمکـە ئەوروپی‌یەکـەی لـە سـەردەمی ڕێنیسانسـەوە سـەرچاوە دەگرێـت، لـەم سەردەمەدا بوو مۆرکی کاری هونەریی و ئەفراندن لە پیناسازیی جیابۆوە.

نیگارکێشان و پەیکەرسازی چیـتر لـە خزمـەتی تەلارسـازیدا نـەمان وەك هونـەرێك. بـەڵکو سـەربەخۆیی خۆیـان وەرگـرت. بـەم شـێوەیە تـابلۆ و پەیکـەر دەرکـەوتن وەك خــودی خۆیـان، هەرچۆن هونەری نیگارکێشانی ڕۆنی (زەیتی) هاتە نێو کە پێشتر لە هونەری مەسیحی‌دا نەبوو کە هونەری نیگارکێشانی زەیتی  توانایـەکی فراوانـتر و زیـاتری بەخشی بـە کـاری هونـەریی لـە دەوڵەمەندی ڕەنگدا. هەر لەم سەردەمەدا پەیکەری گوزارشت کـەر لـە خـودی بابـەت دەرکـەوت وەك بابەتەکانی مەلیك و  پاڵـەوان و ئـافرەت. ئەمانـە گشت لـە میـانی سـنوری واقعیـەتێك لـە شێوازدا و لە میانی سنوری ڕووداوە مێژوویی و واقعی و ئەفسانەیەکاندا.

وەك پێشتر ئاماژەمـان پێـدا سـاتێ دێیتـە سـەر توێژینــەوە دەربـارى هونــەری ڕێنیسـانس یەکـەمین شـتێك کـە سـەرنجمان ڕادەکێشـێت ئەوەیـە کـە ئـەم هونـەرە مـیراتگری بـە ئەمـەکی هونەری یۆنانی کۆنـە کـە مـرۆڤ سـەرەکیترین بابـەت بـووە تیـایدا. هـەرچۆن جـەختی لەسـەر لاسایی سیمای مرۆڤ دەکردەوە لە نمایشکردنی نیگارکێشان و پەیکەرسازی‌دا..

بەڵام تەوژمی هونەری بێزەنتی  کـە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هـات و لەسـەر بینگـەی زەیـن ڕوونـی دامەزرابوو بۆ گـەڕان بـە شـوێن نـاوەڕۆکێکی جەوهـەریی نـەمردا و لەسـەر هێڵکاریی کـورت و پوخت و هێماگەرایی و لەسەر پەیوەستی‌یە ئەندازەیی‌یە  پەیبـەرەکان بـێ ڕێزگرتنێکی ئـەوتۆ بۆ شێوە واقعیەکان، ئەمانە گشت لە هونەری بێزەنتی‌دا ڕۆڵیان بینی لە دواکەوتنی دەرکەوتنی هونەری واقعی لە ڕۆژئاوادا. هەرچۆن پەلهاویشتنی ئیمپراتۆریەتی ئەسـکەندەر لـە ڕۆژهـەڵاتدا و کارتـێ‌کردنی ڕۆژهــەڵات لەسـەر هونـەری هلنیسـتی و درێژبوونــەوەی ئاسـەواری هونــەری ئیسـلامی تـا هــەندێ بەشــی ئــەوروپا، بــووە مایــەی ئاڕاســتەکردنی هونــەر بـــەرەو ئەبستراکت و گۆڕان.

بەم شێوەیە هونەری ڕۆمانسیکی دەرکەوت کە بنەچەیەکی ڕۆژهەڵاتیانەی هەیەو لەسەر نەخش (زەخرەفە) و سادەکاریی و ئەندێشە دامەزرابوو، هەروەها هونەری کورتوازیش. لەم کاریگەریانەی ڕۆژهەلات بێبەش نەبوو. ئەوەی لە دەست ئەم کاریگەریانە قوتار بوو تەنها هونەری غوتی بوو کە پێ دزکێ کردە نێو هونەری ڕێنیسانسەوە لەسەر دەستی هونەرمەندانی پیزانۆدا[٣٥] مۆرکی جێرمانی سەرویان بە تابلۆکانی جیوفانینۆ و بیزانیللۆ و بۆتشیللی بەخشی.

واقعیەتی نێو هونەری ڕێنیسانس شۆڕشێك بوو بەسەر خودی هونەری بێزەنتیدا کە تا سەدەی سیانزەش لە ئیتالیادا تاکە هونەری باو بوو، هەموو ڕووخسارەکان تەخت (فلات) بوون بەبێ پێوانە و بە هێڵی خێرا کێشرابوون، وەك لە تابلۆکانی برایانی برلینگیریدا دەیبینین. (Berlinghieri).

لە سەدەی چواردەدا جیۆتۆ لە فلۆرەنسادا نزیك بۆوە لە سیما واقعیەکانی ڕووخسارەکان، دواتر لە هەوڵدانیدا بۆ بەرجەستەکردنێکی پەیکەریانەی پێوانەکان گەیشتە ترۆپك، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ بوژاندنەوەی چەمکەکانی هونەری ئەغریقی. نیگارکێشانی سێ ڕەهەند (واتە گرنگی دان بە قووڵی) بە هێزێکی خێرا بلاوبۆوە تەنانەت لە پەیکەری ریلیفیدا، بەلام لە مەسینا نیگارکێشانی بەرجەستەیی چووە پێشەوە و ڕووناکی هاتە نێو تابلۆوە تا پشتی واقعی بوونی کاری نیگارکێشان بکرێت تا دورترین ئاست.

هونەری شێوەکاری هەنگاوێکی تر چووە پێشەوە بەرەو واقعی بوون لە قۆناغێکی نوێدا ساتێ هونەرمەند گرنگی دا بە چۆنیەتی جووڵە و وەستانی کەسایەتیەکانی و بە ماددە، دەبوو لە پەیکەر و نیگارکێشاندا چۆنیەتی جوڵەو وەستانێکی گونجاو هەڵبژێررایە تا گوزارشت لە حاڵەتە دیاریکراوەکانی پەرستن و پاڕانەوە و هاوسۆزی بکات یاخود گوزارشت لە بەرجەستەکردنی ماددەکان بکات وەك قوماش یا کاغەز یاخود کانزا.

هەڵبەتە ئاشکرایە ڕێنیسانس هاوشانی پەرەسەندنی ڕۆشنبیریی کلاسیکی دەڕۆیشت، و هەموو بوارەکانی گرتبۆوە، هەر بۆیە هونەر زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی لێ خڕبۆوە لەوانەی خۆیان تەرخان کرد بۆ دانانی بنەماکان بۆ جوانی و هزر. بیناساز ئەلبێرتی لە مەزنترین تیۆریستەکانی ڕێنیسانس ناوزەد دەکرێت لە پاڵ فیلیلفۆ (Filelfo)دا کە لە قوستەنتەنیە گەڕابۆوە لە سەردەمی (محمد الفاتح)دا و تۆقیبوو لەو وێرانکاریەی عوسمانیەکان بەسەر ئاسەواری خۆرئاوایدا هێنابویان. ناچار دەستی دایە نووسینەوە دەربارەی ئیستاتیکای دامەزراو لەسەر ڕێساکانی ئەغریقی کۆن، بە توندی دژ بە ڕێسا ڕۆژهەڵاتیەکانی پێشبینی

سەرکەوتنیان لێدەکرا لە ڕێگەی ئەو زاڵبوونە ڕامیارییەوە کە عوسمانییەکان خۆیان بۆ ئامادەکردبوو. بەم شێوەیە ئەم هونەرمەندە هاوبەشی کرد لەگەڵ ئەلبێرتی لە دانانی بنەما بیرکاری و ئەندازەییەکان بۆ هونەری بیناسازی و نیگارکێشان و پەیکەرسازی، ئەو بنەمایانەی لەسەر بیروباوەڕی ئەفلاتون دامەزرابو و لە ئیستاتیکادا. هەر لەمانیشەوە یاساکانی زانستی بەربینە (علم المنظور) و هێڵکاری و ڕێژەی زێڕین بەدەرکەوتن. لەگەڵ ئەوەشدا هونەری ڕێنیسانس ئاڕاستەیەکی ئایدیالیانەی گرتبووە بەر، بیرکاری دژ بەم ئاڕاستەیە نەبوو، بەڵکو پێشکەوتن و پەرەسەندنی بە قازانجی هونەر دەگەڕایەوە تەنانەت دیللا فرانشیسکا سروشی ئەوە پێیان دەوت (گونجاندنی خودایی) کە یاسایەکی ئەفسوونی بوو بۆ جوانی لەم پێشکەوتنەوە وەرگرت، هەرچۆن پاولۆئۆشیللۆ Uecello هەمیشە دەیوت (چەند پیرۆزە ئەم زانستی بەربینەیە) و بەردەوام ئەم وتەیەی دووبارە دەکردەوە.

جوانی ئایدیالی یاخود نموونەیی گەیشتە ئەوپەڕی لای لیۆناردۆ و ڕافائیلۆ ئەوەدەمەی لە هەوڵی ئەوەدا بوون باڵایی خودایی بەرجەستە بکەن لە میانی هونەرێکی باڵاوە کە دامەزراوە لەسەر یەکێتی شێوە و گونجاندن و ڕێککەوتنی بابەت. ئەم بناغانە بوونە یاساگەلێك کە خودی پاپا خۆی بڕیاری سەپاندن و پەیڕەوکردنی دا لە هەموو کارێکی هونەریدا لە بیناسازی و نیگارگێشان و پەیکەرسازی.

هەر لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمەوە (کواترۆشنتۆ) Quatrocento، فلۆرەنسا بە یەکجارەکی لە دەست تەرزی بێزەنتی ڕزگاری بوو، ڕێساگەلێکی نوێی کراوەی بە ڕووی هونەرێکی نوێدا کردەوە. گشت هونەرمەندان لە نیگارکێشکان و پەیکەرسازەکان و تەلارسازەکان لەگەڵ ئەدیبەکاندا یەکیان گرت بۆ ئەفراندنی ڕێبازهایەکی نوێ دژ بە بێزەنتی. لە نیگارکێشاندا لە تابلۆی سیمون مارتینی Martini و پیزانیللۆدا چیدی تایبەتمەندی نوێ دەبینین وەك بە سەلیقەیی لە جێبەجێ کردندا، و هەستی ناسك بە سروشت و هەڵوەدابوون بە شێوەی مرۆڤی و یەزدانی و پابەندبوون بە وردەکارییەوە ئەمانە گشت لە پێناو ئەفراندنی کەشێکی جوانی پڕ سۆزدا. شاعیرەکانی نموونەی ئەندریا کاپیلانۆ Cappellano هاوسۆز بوون لەگەڵ ئەم ڕێبازە نوێیەدا.

گەر سەیری کارەکانی پەیکەرسازان دۆناتێللۆ (Donatello)، و مازاشیۆ (Massacio) بکەین، دەبینین ئازادبوون لە ڕازاندنەوە بە شێوەیەکی ڕەگ و ڕیشەیی لە تەرزی غوتی قوتاربوون. بەڵام هونەر زیاتر ئاڵۆز بوو. تەنها وێنەو لاسایی کردنەوە نەما. جیبریتی Ghiberti داوای ئەوەی دەکرد کە هونەرمەند دەبێت لە بنەماکان و ئەندازە و فەلسەفە و پزیشکی و فەلەك و

بەربینە و مێژوو و توێکـاری (التشـریح) و تیۆریـەکان و نیگارکێشـان و بیرکـاری بزانێـت، واتـە نیگارکێشان و پەیکەرسازی بوون دوو زانستی پێك هاتوو لە زۆرێك لە زانینەکان.

چیدی جوانی لە سەرەتای ڕێنیسانسەوە جۆرێك لە ڕازاندنەوەی خۆشـی نـەما، بـەڵکو بـووە دیاردەیەك لە دیاردەکانی پەرەسەندن و بالآبوونی هونەریی و هزریی بەو مانایەی هونەرمـەند مەجبور بوو ئاوەز و ڕۆشنبیری خۆی بەکاربهێنێ، تا بنەما جێگیرەکان لە دانـان و گونجانـدن و ڕێککەوتن ببنە لەمپەرێك لە هونەرەکەیدا.

گەر فلۆرەنسا لەو سەدەیەدا بە ئاڕاستەی ڕۆشنبیری و زانست چوبێـت، ئـەوا ئـەم ڕێچکەیـە شێوەیەکی ئاینی لاهوتی لە هەمان کاتدا پەیوەست بە شێوازی کلاسیکی لەخۆگرتبوو.

لە تەلارسازیشدا برۆنیللیسکی (Brunnellesche) پـەیرەوی هونەرمـەندانی سـەردەمی خـۆی کرد، کە بیناسازی نوێ خۆی لە دو خاسیەتی سەرەکیدا دیەوە:

١)ڕیتمێکی ووردی دامەزراو لەسەر ڕێسا ئەندازەیی‌یە توێژراوەکان.

٢)گونجاندن Proportion لە بەشەکانی تەلارە توێژراوەکەدا بە ووردەکاری‌یەکی بیرکارییەوە، بەربینەو لێکچون و گونجاندن بوونە یاساکانی بینگە.

لەپاڵ ئەمانەدا شتێك لـە سـۆفیگەرایی دەبینـین لـە سـەراپای بیناسـازیدا کـە لـە کەنیسـەی پازی (Pazzi)دا بە ڕوونی دەردەکەوێت. (پیرۆزیـیەکی یـەزدانی تیـا بەرجەسـتەیە). سـەرباری ئەمانـە گـەر تەلارسـازیی لای برۆنیللیسـکی گۆڕانکاری‌یـەکی گشـت گیرانـە بێـت لـەچاو تـەرزی غوتـیدا. پارێزگـاریی دوو سـیفەتی سـەرەکی کـردووە تیـایدا یەکـەمیان سـادەیی لـە هێڵکـاریدا. دووەمیان یەکگرتویی توخمەکان.

بەڵام لە پەیکەرسازیدا دۆناتێللۆ Donatello ڕێچکەیەکی نێوەندی پـەیرەوکرد بـۆ خـۆی لـە نێـوان هونـەری غوتـی و کلاسـیکیدا. تەنانـەت ئـەلبێرتی دەربـارەی وتویـەتی: (دۆنـاتێللۆ بـە پارسەنگی هەر پەیکەرسازێکی کۆنە).

لە ڕاستیدا دۆناتێللۆ ئەو هونەرمەندە سادە و غەمبارەی هەڵکوڕماوی خودی خۆی بـوو، لـە چـەمکی ڕێنیسـانس لای نـەدا لـە بەخشـینی پلـەی یەکـەم بـە زانسـت، تەنانـەت هـەندێ وای لێکدەدەنەوە کە ڕۆڵی دۆناتێللۆ گرنگ بـووە لـە دووبـارە ئەفراندنـەوەی شـێوازی غوتـیدا دوای پیاچونەوەیەکی توێژراوە. لەبەرئەمە هەمیشە نەخشە بۆ دانان لای ئەو پێـش جێبـەجێکردن کەوتووە. دەق وەك برۆنیللیسکی، ئەو هەمیشە توانیویەتی کە پەیوەسـتی‌یەك بکـات لـە نێـوان ماددەی بابەتەکەی و ماددەی کارکردنەکەی، لـە پەیکـەری (سـان میشـیل)دا دەبینـین پێکهاتـەی کەللە سـەرەکە جیـاوازە لـە پێکهاتـەو سـاوی جلـەکانی. لـەم شـێوازە کارکردنەیـەوە کـە خـۆی

پابەندی شێوازێکی یاخود مامەڵەیەکی یەکپارچەیی نەدەکرد توانی خۆی بسەپێنێ بەسەر ماددەی پەیکەرسازیدا. جارێك زۆر بە وردەکاریی و ئاڵۆزی چرچەکانی بەرجەستە دەکرد جارێکیش زۆر سادە، هەندێ ڕووبەر ساف و لووس هەندێکی تر فەرامۆش کراوو تەواو نەکراو و.. بەم جۆرە.

لە سەرەتای سەدەی شانزەدا کە ئەو سەردەمەیە پێی دەڵێن پێنج سەدەکان شنکۆشینتۆ (Cinquecento). چیتر ڕاستی ئامانجی هونەرمەند نەما بەڵکو جوانی جێی گرتەوەو بۆوە ئامانجی ئەم سەردەمە لە هونەردا، ئەو جوانیی‌یەی ملکەچی هیچ جۆرە دەست نیشانکردنێك لە شێوەو بنەمایەکی تیۆریی نابێت، ئەوەش ئەو پەیڕەوەیە کە ئیتالیی‌یەکان پێی دەڵێن (Aliquid incorporeum). لە سایەی ئەم پەیڕەوەدا هەر شتێ ببوایەتە مایەی چونە پێشەوەی تەکنیکی یاخود بالاْبوونی لێزانی جێبەجێکردن جێی گرنگی پێدان و ستایش بوو. هەر ئەمە وای کرد ڕازاندنەوە لە شێوازی بۆتشیللیدا ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێت و ببێتە بەشێکی باش لە لایەنی هونەریی کارەکانی. ئیتر جوانیی‌یەکی شاعیریانەی دوور لە ماددی زالْ بوو بەسەر جوانیی‌یەکی دامەزراو لەسەر زانینێکی بابەتیی‌یانە بۆ سروشت بۆ مێژوو، ئەمەش لە تەلارسازی داسان گالوو و پەیکەرسازیی ڕۆسیللینۆ دا دەردەکەوێت. بەلاْم هەردوو بلیمەت لە بلیمەتەکانی مێژووی هونەر لیۆناردۆ داڤنشی بەو توێژینەوە زانستی و لێکۆڵینەوە تیۆریانەی پێشکەشی کردن. مایکل ئەنجیلۆش بەو پەیڕەوکردنە ئاکارییە توندوتۆڵەی هەیبووە. بە ڕاستی ئەم دوو مەزنە ڕاستگۆیانە چارەسەری ئەو قەیرانە ناوخۆیی‌یەیان کرد کە خواستی هیومانیزم پێوەی گرفتار بوو؛ بەلاْم لە ڕێی دانانی کێشەی جوانی و هونەرەوە لە قاڵبێکی نوێدا بەدەر لە مانا سواو و لاسایی کەرەوەکەی بلاْوبوو لە شێوازی کۆندا.

ئەودەمەی مانێریزمەکان بانگەوازی ئازادیەکی داهێنانیان دەکرد، کاراڤاچیۆ پایەکانی جوانیی‌یەکی گوزارشتی و فۆتابخانەیەکی ڕیالیزمی ڕاپۆرتی بوونیات دەنا. دوای ئەوەی هانیبال کاراشی بە ئاگا هێنا لە لادانەکانی ڕێبازی مانێریزم Manierisme کە یەکەم بەڵگە بوو لەسەر لاواز بوونی ڕێنیسانس، دواتر پەیوەندی کرد بە هونەری بارۆکەوە کە پەیکەرساز برنێنی و تەلارساز بورو مینی پێشڕەوایەتیان دەکرد، و دواتر بە هونەری ڕۆکۆکۆ کۆتایی هات.

هەڵبەتە ڕێبازی مانێریزم شتێك نەبوو نوێ، بەڵکو ئەم ڕێبازە شان بە شانی هەموو چونە پێشەوەیەك و سەرکەوتنێکی چەمکی جوانی ئاوەزیی ڕێنیسانس تا ڕاددەیەکی بێ سنوور (کە وەها دەزانرا و لێك دەدرایەوە) هەندێ سەرچاوەی سروش بەخشی دژ بە چەمکی ڕێنیسانس کارا بوون لە بلاْوبوونەوەیەکی خێرادا، ئەم دیاردەیە هەر هێندە نەبوو بەس بەڵکو هەندێ

کات کاریگەریی ئەم سەرچاوانە خودی بلیمەتەکانی ڕێنیسانسیشیان دەگرتەوە، ئەمەش لەو کاریگەرییە پڕ دڵەڕاوکێ و نامۆیانەدا خۆیمان پیشان دەدات کە لە کارەکانیاندا ناوبەناوێك دەردەکەوتن. خودی داڤنشی هۆکارێك بووە بۆ گەڕانەوە بەرەو عەدەم، سروشی ئەمەشی لە میانی ئەو گوزارشتانەوە داوە کە دەربارەی سەرچاوەی سروشتن و دەربارەی تواناو هێزە شارراوەکانن وەك لە تابلۆی (لافاو)دا دیارە، بەڵام مایکل ئەنجیلۆ ئەم دڵەڕاوکێیەی هەموو جارێك لەو کاتانەدا دەرئەکەوت کە تیایدا هەوڵی داوە نیگاری مرۆڤ بکێشێ کە یەزدان دەستبەرداری بووە. هەتا رافائیل کە خۆی تەرخانی خواوەندایەتی کردبوو زۆر نزیك بووەوە لە جیهانی جیرۆم بوش (Bosch) کە لێوان لێوە لە هەڵچون و کوڵان و سوتان و خودی دەوروبەرەکەیەوە، لە هەندێ نیگاری هەڵکەنراوی پارێزراو لە لۆڤەردا ئەمە بە ڕوونی دەرئەکەوێت لە کارەکانیدا.

ڕێچکەی ریفۆرمی ئاینی پرۆتستانی لە لایەکی ترەوە کاری خۆی کردە سەر هونەر، هەر لەو کاتەوە کە هەوڵە دەمارگیرییەکەی ساڤۆنارولا[٣٦] لە فلۆرەنسادا بەدەرکەوت و ڕەنگیدایەوە لە تابلۆی (ڕۆژی قیامەت)ی مایکل ئەنجیلۆ لە نوێژگەی سیکستین دا، مۆرکی سك هەڵگوشین (التقشف) لە ئایندا ڕاستبۆوە لەبەردەم کاسۆلیکیەتی ڕێنیسانسدا، لە ئەڵمانیا دواتر زاڵ دەبێت لەسەر دەستی لۆسەردا کە بانگەوازی دەکرد بۆ ئاسودەیی دەروون دوای دەرکردنی شەیتان لە گشت لایەکی. ئەمەش لە هونەردا بەدەرکەوتەوە بە دیاردەی جیاواز. لەوانە تەمومژاوی بوونی شێوە و زیادەڕۆیی لە بابەتە مۆسیقیەکاندا وەك لە کارەکانی جیۆرجیونی و فیرۆنێزەدا. خودی ڤینیسیا دەستپێشخەر بوو بۆ ئەم ڕێچکەیە کە دژ بە ڕێساکانی هونەری ڕێنیسانسە.

دەتوانین ئەم ڕێچکەیە زیاتر ڕوون بکەینەوە بە جیاوازی کردن لە نێوان شێوازی تەلارسازی لای برامانتی (Bramante) لەگەڵ شێوازی تەلارسازی لای پالادیۆ (Palladio).

لە میانی نیگارکێشانیشدا تیسیانۆ نمونەی ئەم ڕێچکە نوێیەیە. دواتریش تۆنتۆریتۆ دێت کە لە پێکهاتە ڕەقەکان تێکەڵەیەکی لە ئاویی بوونی ئینتباعی و دەستنیشانە کردنی تەعبیریی دروست کرد. ئەلگریکۆش لە ئیسپانیا جڵەوی بۆ ئەم ڕێچکەیە شل کرد، بەمەش بووە پردێك لە نێوان (تیسیانۆ)ی مامۆستای و (ڤیلاسکیوز)دا، لەبەرئەوەی ریفۆرمی ئاینی ئامانجی نەهێشتنی ڕابواردن و سرووتە نامۆکان بوو تا دەگات بە دوورخستنەوەی ئاین لە زەوتکردنی ڕامیاریی، هونەرێك هاتە کایەوە لە بابەتیا بە دور بوو لە مۆرکی ڕەسمی بڵاو لە سەردەمی ڕێنیسانسدا، کە بابەتەکانی تەرخانی ڕووداوە ئاینی و پیاوەکانی بوو یاخود بۆ سەرۆك و میرەکان.

کاریگەری‌یەکی تریش لە سەروی ئەڵمانی‌یەوە بوو، لە برۆگل (Brueghel) و قوتابی‌یەکانی‌یەوە ئەوانەی گرنگی‌یان بە ژیانی میللی ئەداو بەرجەستەیان دەکرد لە هونەرەکەیاندا، ئەم تەوژمە میللی‌یە پەرییەوە بەرەو ئیتالیا، دەرکەوتنی کاراڤاجیۆو کاراشی بەرەنجامی ئەم پەڕینەوەیە بوو، هەرچۆن لەلای ڤیلاسکیوز لە ئیسپانیاو لەلای ڕامبرانت لە هۆڵندە بە دەرکەوت کە ئەم هونەرە بە ناوی (بارۆك)ەوە ناوزەدکرا.

لە ڕاستیدا سەردەمی ڕێنیسانس خاوەن ڕێچکەیەکی زەیینی بوو، مرۆڤگەرایی بوو زیاد لە ئاینی و ئایدیالی بوو زیاد لە سۆفی و ئاوەزیی بوو زیاد لە سۆزیی. بەڵام ئەو مۆرکە ڕۆحانی‌یەی کە بڵاوبوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دیسان گەڕایەوە تا سەرلەنوێ دەرکەوێتەوە دوای بانگەوازیی ڕیفۆرمی. بابەتی پەرستنکاری و سۆفیگەرایی سەرلەنوێ بەدەرکەوتنەوە لە ئیسپانیا. لە کارەکانی (زۆرباران و ئەلگریکۆ). لە فەڕەنساش لە کارەکانی جۆفنیەو لینارد و دیلاتۆردا.

## بەرەبەیانی ڕێنیسانس لە زەویە نزمای‌یەکان(٣٧)

لەبەر گرنگی ڕۆڵی وڵاتی زەویە نزمای‌یەکان لەسەر ڕێنیسانس بە تایبەت لە میانی نیگارکێشان دا زۆرێك لە سەرچاوەکان پێش ئاماژەدان بە دەستپێکردنی کارکردنی هونەریی نوێ لە ئیتالیادا، سەرنجی خۆیان ئاڕاستەی هونەرمەندانی ئەم هەرێمە دەکەن لەم سەردەمەدا چونکە بەهاوشانی هەوڵ و داهێنانەکانی ئیتالیای هاوسەردەمی خۆیانیان بە زیاتر نەزانن ئەوا یەکسان دەیان بینن لەو میانەدا. بە تایبەت پێشینەی هەرکامێکیان جیاوازی دیار و بەرچاویان هەیە ئەمە بێ لەو دۆزینەوە زانستی و واقعی‌یانەی کە نیگارکێشەکانی ژووروی ئەورووپا خاوەنی بوون و دواتریش کاریگەریی گەورەی کردە سەر پەرەسەندنی ڕێنیسانس.

گەر وەك پێشەکی‌یەکی مێژوویی نیگامان ئاڕاستەی ئەو سەردەمەی ئەم هەرێمە بکەین دەبینین هەر لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمەوە تا ناوەڕاستی ئەو سەدەیە بەرەنجامی پاشکۆیی فەرمانڕەوایی ئەم هەرێمە بۆ فەڕەنسا و نەمسا و ئیسپانیا توشی دواکەوتویی هات لە بزاڤی ڕۆشنبیریی و هزریی‌دا، بەڵام لە دوا نیوەی ئەم سەدەیەوە ئەم ڕەق هەڵاتنە ڕۆشنبیری‌یە گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هات لە دوای دەوڵەمەندبوون و ناوبانگ وەرگرتنی هەندێ شاری بازرگانی‌یەوە وەك بروج Bruge و ئەنتورپ Antwerp.(٣٨)

هەرچەندە کازیوەی ڕێنیسانس لە ئیتالیادا بوو، بەڵام لە سەدەی پانزەهەمەوە لە دوای ڕزگاربوونی لە دەست فەڕەنسا شارەکانی ئەم هەرێمە بوژاندنەوەو چونە پێشەوەیەکی زانستی‌و ڕۆشنبیریی بەخۆوە دی، زانکۆی "لۆڤین Luvin" دامەزراو هونەری چاپەمەنی لە هارلم

بڵاوبۆوە ساڵی ١٤٢٣ و لە (ئەنتۆرب) ساڵی ١٤٧٢ و لە (ئەترخت Utrecht) ساڵی ١٤٧٣ لە بروج ساڵی ١٤٧٥. بێگومان هاوشانی ئەم پێشکەوتنە کلتورییە پەرەسەندنێکی دیار هونەریشی گرتەوە.

## هونەری ڕێنیسانسی زوو لە فیلمنك (سەدەی پانزەهەم)

وەك ئاشکرایە تەرزی هونەری غوتی لە سەرانسەری ئەورووپای ڕۆژئاوادا زاڵ بوو، کە لە فەرەنساوە دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد تا سەدەی چواردەهەم هیچ کاریگەرییەکی هونەری فلۆرەنسی پێوە نەبوو، هونەری تەلارسازی کە لە ڕێگەی بوونیاتنانی کڵێسەو کاتیدراڵەکانەوە بڵاوبۆوە پەرەسەندنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەدی لە وڵاتی زەوییە نزمەکاندا، چون ڕووحی خواستی غوتی ئەم هەرێمە لە تەلارسازیدا تا سەدەی شانزەهەمی خایاند. ئەوەش بە ڕوویەکی تایبەت لە بینا و خانووبەرەو کۆشکە دنیاییەکاندا بەدەردەکەوێت، گەر لە هونەری پەیکەرسازیش بدوێین ئەوا ئەو گۆرانکاری و چونە پێشەوەیەی هونەری پەیکەرسازی لە سەرەتای ڕێنیسانسی ئیتالیادا بە خۆیەوە دی لە پەیکەری دانراوی نێو قوربانگەی کڵێسەکان و نەخشی گۆڕستان و جێ نزرگەو مەزارەکاندا لە هەرێمی فیلمنك بەرچاو نەدەکەوت. بەڵام لە بەرامبەر ئەمانەدا تێبینی پێشکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرا دەکەین لە گۆڕەپانی هونەری نیگارکێشاندا[٣٩] کە هەڵقوڵاوی هونەری دەستنووسەکان و کاریگەریی تیژ تێپەڕی هونەری کورتوازییە و پشت بەستە بە سەرنجی وورد لە واقعی ژیانی ئاسایەوە.

تا ڕۆڵ و تایبەتمەندێتی هەر کامێك لە هەردوو هونەری فیلمنکی و فلۆرەنسی ڕوونتر بنوێنن ئەم بەراورد کاریە پێویستە.

١-بنەمای هونەری فیلمنکی هونەری غوتییە، بەڵام هونەری فلۆرەنسی دەگەرێتەوە بۆ هونەری بێزەنتی و پاشان کلاسیکی، هەر بۆیە دەبینین هونەرمەندی فلۆرەنسی پابەندی بابەتە ئاینییەکان و زۆرترینی بەرهەمەکانیشی لەسەر دیواری پەرستگەو کڵێساکان. بەڵام فیلمنکییەکان دنیایی تر بوون و ئاراستەیان زانستیانە، نیگاری بابەتە ئاسایەکانیان دەکێشا وەك نیگاری پیاوو کەسایەتییە دەوڵەمەندەکان جل و بەرگ و کەرەسەیان و ناوماڵیان.

٢-کەشی هەتاویی و ڕووناکی فلۆرەنسا هاندەر بوو بۆ نیگارکێشانی نێو کڵێسا ڕووناکەکان، بەڵام کەشی ژووروی تاریك لە هۆڵەندەو ئەڵمانیا وای کردبوو هونەرمەندەکان بایەخ بە ڕازاندنەوەو کارتیاکردنی شوشەی پەنجەرەکان بدەن لە جێی دیوارەکان.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بە پێشکەوتویەتی هونەری چنین و ڕستن بدەین لەم ماوەیەی هونەری فیلمنکیدا، بە تایبەتی هونەری چنین (Tapisserie) لە شاری تۆرنای پێشبڕکێی شاری

ئاراسی فەڕەنسی دەکرد لە ساڵی ١٣٩٠وە. بابەتی بەرهەمە چنراوەکانیان لە تابلۆکانی هونەرمەندانی وەك دیروایدان وەردەگرت. لە ساڵی ١٤٧٥وە برۆکسلْ پێگەیەکی شیاوی وەرگرت لەم پیشەسازی‌یەدا کە کارمەندەکانی دەزوی حەریر و ئاڵتون و زیویان لە چنراوەکانیاندا بەکاردەهێنا.

لەو هونەرە نوێیانەی گەشەی سەند لەم وڵاتانەدا هونەری هەڵکۆڵین بوو لەسەر قاڵبی تەختە کە بەکاردەهێنرا لە چاپکردنی تابلۆی کێشراودا ئەمە بێ لە چاپکردنی کتێب. کە ئەم شێوازە نوێیە لە ڕوونکردنەوەی زانیاری نێو کتێب لە ڕێی وێنەی چاپکراوەوە لەوێوە دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد بۆ هەموو وڵاتانی ئەوروپی.

ئێمە وەك لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدا هونەری نیگارکێشان بە تایبەتی لەنێو هونەرەکانی تردا هەرچی زووتر ڕووی لە واقعی بوون کرد لەم هەرێمەدا، لەم پێناوەشدا گرنگی تایبەت درا بە دەرخستنی قوڵیی (ڕەهەندی سێهەم) لە کارکردنی تابلۆدا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە مانای گرنگی دانە بە زانستی بەربینە (علم المنظور). هونەرمەندانی ئیتالی و فلاندەر پێکەوە لەم گرنگی دان و بەدواچونەدا هاوبەش بوون. هەرچی ئیتالی‌یەکانە لە ڕێی زەینەوە گەیشتن بەم زانستە، بە هێڵە ڕێکەکانی‌یەوە کە لە پنتێکدا لە یەك دەدەن یاخود یەکدەگرنەوە، ئەم زانستە لای ئەوان تۆڕێك بوو بەکاریان دەهێنا بۆ ڕاوکردنی واقع و دانانی هەر شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیدا بە پێوانەی ئەو دووری‌یە درۆینەی لەسەر ڕووی تابلۆکەوە هەیەتی، بەڵام هونەرمەندی فلاندەر، پشتیان بە هەست بەست بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵی کۆپی کردنێکی پڕ ئەمانەتی ئەوەیان دا کە بە چاو دەیبینن، بۆ سروش بەخشین بە ڕەهەندی سێ یاخود بە قووڵی پشتیان بە جیاوازی ڕەنگی بەست وەك لە پەنابردن بۆ زانستی بەربینە.

لە پەیکەرسازیشدا ئەمان وەك ئیتالی‌یەکان لە بیرۆکەی کارەکەوە دەستیان پێ نەکرد (پشت بە زانستی توێکاریی) تا بگەنە بەرجەستەبوونی بیرۆکەکە لە گەیشتن بە جوانی باڵای پەیکەرەکە، بەڵکو بە پەیکەرەکە دەستیان پێکرد و بەرەنجامی دەسکاریکردن دەیان گەیاندە جوانی‌یەکی زیندوی واقیعیانە.

جیاوازیش لە نێوان واقعیەتی ئیتالی زەینی و واقعیەتی فلاندەری هەستی، لە شێوازی جۆری مامەڵەکردنیاندا دەرئەکەوێت لە بەرجەسەتەکردنی سێبەردا، لە هونەری ئیتالی سەدەی پانزە هەمدا سێبەرەکان لە کاری هونەریدا سنوریان ئاشکراو دیارەو هەر دەڵێیت بەو جەستانەوە نووساوە کە دەریان دەخات، بە شێوەیەك لە نێوان جەستەکاندا هەست دەکەین دەڵێی بۆشایی‌یەك هەیە لە ڕووبەری تابلۆکەدا، بەڵام لای هونەرمەندانی فلاندەر سێبەرو

ڕووناکی زیاتر لە پلەی خەستی و ڕوونی پێك هاتووە، دێن و دەچن و شەپۆل دەدەن لـە میـانی بۆشاییەکدا کـەوا دەرئەکـەوێت بـێ سنوورە. ڤـان ئـایك بـە هەسـتی ناسـکی خـۆی پـەی بـەوە بردووە سێبەر تەنانەت لەو جێگەیانەشدا هەیە کە ڕووناکی تیا پرشنگ دەداتەوە و ڕووناکیش تەنانەت لە پڕبوونەوەی سێبەرەکاندا هەیە.

## هونەرمەندەکان:

### جان ڤان ئایك ١٣٨٥-١٤٤١ (Jan Van Eyck)

ئەم هونەرمەندەو بـرا گەورەکـەی لـە بـەناوبانگترین هونەرمـەندانی فلانـدەری دەژمـێرێن، هۆبرت ڤان ئایك کە برا گەورەی جانە لە ساڵی (١٣٦٥ تا ١٤٢٦) ژیاوە. لە نزیك شاری ماسترخت لە دایك بوون لە هەندێ پڕۆژەی هونەریدا پێکەوە کاریان کردووە، هەرزوو بە زوو ناوو تواناى بـرای بچووك زیـاتر دەرکەوتووەو ناسـراوە لـە وردەکـاری و تۆمـارکردنی هـەموو بچـووك و گەورەیەك لە کاردا ئەمە سەرباری فراوانی ئەندێشەی.

جـان ڤـان ئـایك لـە بەهرەمـەندی و پێشـڕەوایەتی دا بـۆ هونــەری سـەدەی پانزەهـەم بـە هاوشانی هونەرمەند (مازاتشیۆ)ی فلۆرەنسی دادەنرێت کە هەر هاوڕۆژگاری خۆی بووە. ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم هونەرمەندە بڵاوە و ناوبـانگی پـێدەرکردووە داهێنانیـەتی بـۆ بۆیـەی زەیتـی یاخود کارکردن بە بۆیەی زەیتی. (هەرچەندە بۆیەی زەیتی پێـش ئـەم هونەرمـەندەش زانـراو بووە) ئەم هونەرمەندە توانی شێوازێکی نوێ بگرێتە بەر لە بەکارهێنانیدا، وەك کەرەسـەیەکی گونجاو و خۆش دەست بۆ بەرجەستەکردنی هەر جۆرێك لە ئەندێشە و ڕووکەشی هەر شـتێك. ئـەوەی جـێی سەرسـامییە وەك ئـەوەی پێشـڕەوی ئـەم شـێوازەیە، لەگـەڵ ئەوەشـدا توانـی بـە یەکجار بگاتە لوتکەی ئوستادی تیایدا.

شاری جـان جـێی دەرکـەوتنی ڤـان ئـایك بـوو، بـەڵام ئـەو لـەم شـارەدا نەوەسـتاو لـە نێـوان وڵاتانی هەرێمی فیلمنك دا کەوتە گەڕان بۆ جێبەجێکردنی چەندان پـرۆژە لـە نێـوان ساڵانی ١٤٢٢ بۆ ١٤٢٤ لەسەر داوای دیوکی باڤاریا کەوتە کارکردن لە لاهای، دواتر لە شاری (لیل- Lille)ی فەڕەنسی گیرسایەوە سـاڵی ١٤٢٥ وەك نیگارکێشـی تـەختی پاشایەتی مـەلیك فیلیـپ، سـاڵێ دوای ئەوەی لە هاتوچۆی لیشبوونەی پرتوغالی و ئەراگۆنی ئیسپانیدا بردەسەر بۆ ئـەنجام دانـی ئـەو کـارە هونەرییانـەی گرتبویـە ئەسـتۆ، لـەوە دواتـر ناوبـانگ و خـۆش گوزەرانـی شـاری بـروج سەرنجی ڕاکێشاو بەلای خۆیدا برد لە ساڵی ١٤٣٠دا بووە مایەی جێگیربوونی لەوێدا.

هەرچەندە ئەو ئوستادێکی لێهاتوو بوو لە پیشەکەیدا، بەڵام کەسایەتی ئەو لە کەسایەتی پیشەگەرێك بە دوور بوو. کار و بەرهەمەکانی بەڵگەی ڕاستەقینەن بۆ شارەزایی و زانیاری‌یەکی کەم هاوتا لە زانستەکانی لاهوت و فەلەك و بەربینە و تویکاری. لە سەرنجماندا بۆ کارەکانی دەمان گەیەنێتە ئەو بەرەنجامەی بڵێین هیچ شتێك لە تابلۆکانی ئەودا نی‌یە بێ بەهاو بێ‌مانای تایبەت و قوڵی خۆی، ئەو گۆزەو پەرداخە بلوری‌یەی تیشك سەمای تیا دەکات بەبێ هیچ پەڵەو لەکەیەك، ئەوە هێمایە بۆ پاکێتی مەریەم، مۆمە داگیرساوەکەش هێمای مەسیحە، ئەو میوەیەی لەسەر قەراغی پەنجەرەکەشە مژدەی بەهەشتی بەڵێن پێدراوە، ئەو ڕووناکی‌یەش کە لە دەروازەکەوە دابەزیوەتە خوار نیشانەی نیعمەتی یەزدانی‌یە، ئاوێنەی کەوانەیی سافیش بێ‌گوناهیمان پیشان دەدات، سەگی بەردەمی هەردوو ژن و مێرد بە ئەمەکی و وەفامان بیردەخاتەوە، تەلارسازی ڕۆمانی هێمایە بۆ بەڵێنی کۆن واتە تەورات، تەلارسازیی غوتیش هاتنی بەڵێنی نوێیە بە مانای ئینجیل.. لەگەڵ هەموو ئەو زانیاری و هێما و ڕازانەدا، تابلۆکانی وەك یەکەیەکی کامڵ و تەواو دێتە بەرچاو لە وەستایی ڕێکخستن و لێکدانی جۆرەها توخم لە بوونیاتێکی پتەودا.

یەکێك لە بەناوبانگترین کارەکانی تابلۆی قوربانگەی پیرۆزمەند (باڤون Bavon)ە لە شاری (جنت Ghent) کە نمایشی بابەتی "پەرستنی بەران" دەکات. هەردوو برا پێکەوە کاریان تیاکردووە، وا دەزانرێت کە نەخشەی گشتی کارەکە لەلایەن (هۆبرت)ەوە دانرابێت و کارکردنی سەرەتایی تیا لە ساڵی ١٤٢٥وە دەست پێکردووە، جان لە جێبەجێکردنی‌دا هاوبەش بووە، بەڵام ساڵێ تێ نەپەڕیوەو دوای مردنی برا گەورەکەی خۆی بە تەنیا لە کارتیاکردنیدا ماوەتەوە، ساڵی ١٤٣٢ ئیمزای خۆی لێداوە دوای تەواوکردنی. ئەم بەرهەمە پێوانەکەی (٦٠) مەتر چوارگۆشەیە.

قوربانگەی جنت لە سێ بەش پێك هاتووە لە دولاوە نیگار تیاکێشراوە کە ژمارەیان ١٦ وێنەیە، لە خواروی بەشی ناوەڕاستدا بابەتی (پەرستنی بەران)ەکە دەردەکەوێت، سێ کەسایەتی لە سەروی ئەم دیمەنەوەن کە ئەوانیش (المسنح)[٤٠]، مریەم و یوحەننایە، وا دەزانرێت کە ئەم سێ‌کەسایەتی‌یە لە دروست کردنی برا گەورەکەیە، برای بچوکیش تابلۆی تەنیشتەکانی نەخشاندووە کە بابەتی ئادەم و حەوا لەمبەر و لەوبەر دەنوێنن، واقعیەتی کارکردنی برای بچووك لە شێوازی کارکردنی ئەم دوو کەسایەتی‌یەدا دەرئەکەوێت، کە ئەمە یەکەمین جار بووە جەستەی مرۆڤ بە ڕووتی تیا بەرجەستە بکرێت. بە بۆیەی زەیتی کارەکە

ئەنجام دراوە و دیمەنی سروشتی پشتەوەی تابلۆکانی خوارەوە زۆر بە وردیی و ناسکی دروست کراون کە بە بۆیەی تیمپرا نەدەتوانرا بەو ئەنجامە بگەیەنرێت.

جان ڤان ئایك بە یەکەم دامەزرێنەری نیگاری کەسایەتی بە بۆیەی زەیتی دادەنرێت لەم هەرێمەدا، بەم کارەش پێش وڵاتی ئیتالیا کەوت لەم بوارەدا، کە دواتر لە رێی هەندێ هونەرمەندی ئیتالییەوە ئەم تەرزی کارکردنە گواسترایەوە ئیتالیا، کە هاتبوون بۆ سودوەرگرتن لە شارەزایی هونەرمەندانی ئەم هەرێمە.

لە نمونەی زیندوی کاری وێنەی کەسایەتیدا تابلۆی (پیاوە سەرو پێچ سورەکە)یە ساڵی ١٤٣٣ و وێنەی ژنەکەیەتی ساڵی ١٤٣٩.

گەر بمانەوێت توانا و لێهاتویی ئەم هونەرمەندە ببینین لە ووردەکاریی کاری هونەریدا ئەوا بەهەرەمەندی ئەو لە تابلۆی "جیوڤانی ئارنۆ لیڤینی و ژنەکەی C. Arnolfini"دا بەدەردەکەوێت بە روونی، کە ئەم پیاوە یەکێکە لە پیاوانی دارایی ئیتالی لەگەڵ ژنەکەیدا، هەردو کەسایەتییەکە وەستاون لە ژوری نووستنەکەیاندا، بە سەلیقەیی هونەرمەند لە بەرجەستە کردنی وردی کەل و پەلی ماڵەکەدا دەردەکەوێت، هەرچۆن وردەکارییەکی بێهاوتای لە سەگی بەردەمی ژن و مێردەکەدا کردووە، لە ئاوێنەی سەرد دیواری پشتەوەی ئەم دو هاوسەردا لە کۆتایی ژورەکەدا، بە وریاییەوە هەموو شتێکی ناو ژورەکەی تیا پێچەوانە کردۆتەوە، و لە بەردەم دو هاوسەرەکەدا دو کەسایەتی وەستاون و وا پێدەچێت یەکێکیان خودی هونەرمەند بێت.

ڤان ئایك زۆرجار نیگاری مریەمی کێشاوە بەڵام بە جل و بەرگێکی ناسك و جوانی سەردەمەکەی خۆیەوە، هەر جارێکیش کاردینالێك یاخود راوێژکارێکی میریی لە بەردەمیا لەسەر چۆکن کە خودی ئەو تابلۆیانەیان پێشکەشی کڵێسە کردووە. پەنجەرەی پشتەوەی مریەم ئەرووانێتە سەر دیمەنێکی سروشتی دیاری کراو، زۆربەی جار دیمەنێکی نێو شاری بروجی هەڵبژاردووە، باخچەکان بە درەختەکانیانەوە دیارن، لە دوای ئەمانیشەوە شارەکەیە بە بیناو شەقام خەڵکەکەیەوە، پشت شارەکەش چیایەو بەفر دایپۆشیوە، لە پشت چیاکانیشەوە ئاسمانێکی درێژبۆوە بۆ بێکۆتایی. بەڵام ئەم دژایەتییە ئاشکرایە لە نێوان هێما ئایینییە هەتاهەتاییەکان و واقعیەتی وەسف کردنێك کە پەیرەوی سنوری شوێن و کات دەکات. ئەفسونی هونەر بێ ئاگامان دەکات لێ و چی دی هەست بە کات و شوێن ناکەین.

ڕەنگەکانی ڤان ئایك گەش و ڕوونن، توانای ئەفراندنی هەرچییەکی هەیە پێی کە خۆی بیەوێ: نەرمی قژ یاخود زبری ڕیش یاخود ساوی مەخمەڵی و بریسکەی کانزا گران بەهاو ئەڵماس و مت و مورووەکان.

هونەرمەند زۆر تابلۆی بابەتی دنیایی هەبووە، کە بابەتی هەندێکیان دیمەنی ڕاوشکارو (گەرماوی ئافرەتان)ن، بەڵام زۆرێك لەم تابلۆیانە فەوتاون و وون بوون، لە ئاسەوارەکانی لەپاڵ بەرهەمە ئاینییەکانیدا هەندێ وێنەی کەسایەتی (پۆرترێت) ماونەتەوە. لە کارەکانیدا هەست بە لێوەشاوەیی ئەو دەکەین بۆ کۆکردنەوەی نێوان دژەکان، وەختێ گرنگی تەواوی داوە بە وردەکارییە ڕووکەشییەکان تا دەگاتە نیگارکێشانی قژ موو بەموو، لە پاڵیدا هەست بە گرنگییەکی گەورە دەکەین کە ئاڕاستەی گوزارشت کردن لە کەسایەتی دانیشتوو کراوە هەتا دەرخستنی ڕووخساری سایکۆلۆجی یاخود باری دەروونی کەسایەتییەکە.

ئەم شێوازە ڕیالیزمییەی ڤان ئایك کاری کردە سەر هاوسەردەمانی سەرسامی کردن بە هونەرەکەی، پێگەی ئەو ئاسۆکانی بڕی و کێبڕکێ بووە لەسەر کڕین و پەیداکردن و گرتنەخۆی ئاسەوارەکانی لە لایەن میر و پاشا و دەوڵەمەندەکانی تەنانەت ئیتالیاشەوە، هەتا دیوك فیلیپی بەوەج کە دیوکی بۆرجۆنیا بوو لە خۆی نزیکیکردەوە و کردیە هاوڕێیەکی تایبەتی خۆی و وەك نێرراو نمایشکارێکی کەسایەتی خۆی دەینارد بۆ ئیسپانیاو ئینگلستان و پورتوگال.

ئەم گیانە بەخشندەیە زۆر نەژیاو لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا ژیانی بۆ تابلۆکانی بەجێهێشت.

## ڕۆبرت کامپن (Robert Campin) ١٣٨٠-١٤٤٤

ئەم هونەرمەندە لە شاری تۆرنای پەروەردە بووە و لە ساڵی ١٤٠٦وە کاری ئیمزاکراوی هەیە دەربارەی بابەتە ئاینییەکان کە بۆ هەیکەلی کڵێساکانی کردووە. هەندێ لە مێژوونووسانی هونەر ڕۆڵی ئەم لە پێشتر دەزانن وەك لە برایانی ڤان ئایك بۆ بەرەو واقعی چوون و بەکارهێنانی بۆیەی زەیتی. بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی هونەری نیگارکێشانی فلمنکی دادەنێن و ئاماژە بەوە دەدەن ئەوان سودیان لەم وەرگرتبێت لە سەرەتاوە، هەرچی چۆنێك بێت، تێبینی ئەوە دەکەین کە کامپن زیاتر کاریگەریی پەیکەری لەسەرە، هێڵەکان لە تابلۆکانیدا دیارترو یەکلاکەرەوەن و سنوردار، هەتا هەندێ جار نیگاری مینیاتۆریمان یاد دەهێنێتەوە، بەڵام ڕەنگ و پلەکانی ڕۆڵی گرنگ لای ڤان ئایك دەگێڕن.

لە سیماکانی کامپن بەکارهێنان و داڕشتنەوەی هێما پیرۆزەکانە لە وێنەیەکی واقعیدا، بۆ نمونە ئەو ڕووناکی‌یەی لە گڕی زۆپایەکەوە دێتە دەر بەکاری دێنێ بۆ دروست کردنی ڕووناکی هالەی سەر سەری پیرۆزمەندەکان، ڕووخساری پیرۆزمەندەکان بە شێوەیەکی ئایدیالی بەرجەستە دەکات، بەڵام لە تەنیشتیانەوە کەسانی تر دروست دەکات بە شێوازێکی واقعیانە، بۆ نمونە شوان و جوتیارەکان بە ڕووی هیلاك و چڵکنیانەوە و دیمەنی زبریانەوە لە تابلۆی (لەدایك بوونی مەسیح)دا بەدەردەکەون، کە لە جوانترین ئاسەوارەکانیەتی، پشتەوەی تابلۆکەشی بە هەمان شێوە پڕکردنەوەیە کە لای ڤان ئایك ئاماژەمان پێدا.

نمونەیەکی تری زیندوو لە بەرهەمەکانی کە وێنای ئەو شێوازە بکات، کە ئاماژەمان بۆ کرد تابلۆی (هەیکەلی میرۆد)ە کە لە میانی ساڵانی ١٤٢٥ بۆ ١٤٢٨دا دروستی کردووە و داهێنانێکی جوانی بەسەر بابەتی مزگێنیدا هێناوە و لە ئاستە سواوەکەیدا نەهێشتۆتەوە، تابلۆکە سێ بەشەو لە ناوەڕاستدا مریەم فریشتەیەك بەدیاریەوەیەتی و لەلای چەپ لەبەردەم دەرگای کراوەی ژوری مریەم دا چەند کەسێك لەسەر چۆکن و چاوەڕێی مزگێنی دەکەن، لەلای ڕاستی تابلۆکەش یوسفی دارتاش وەك دارتاشێکی ئاسایی نێو بازاڕی ئەوکاتە سەرقاڵی کاری خۆیەتی و پەنجەرەکەی پشتی کراوەتەوە و ناوبازاڕ و گۆڕەپانێك دیارەو خەڵکی لە ژیانی ئاسایی خۆیان سەرقاڵن، هونەرمەند ئەم بابەتەی بە بیرۆکەیەکی میللی‌یانە بەرجەستە کردووە بە دوور لە تەرزی ئاینی یان ئۆرستۆکراتی. لەم کارەیدا بۆیەی تێمپراو زەیتی تێکەڵ کردووە.

چەردەیەك لە ناوازەترین تابلۆ تا کاتێکی نزیك بێخاوەن بوون و هونەرمەندەکەیان نادیاربوو، بە ئوستاد فلیمال ناوزەد دەکرا (Maitre de Flemalle) بەڵام ئەمڕۆ ڕای زۆربەی نێوان مێژوونووسەکانی هونەر لەگەڵ ئەوەدایە کە ئاسەواری (ڕۆبیر کامپن)بن بەرەنجامی هێندایی لێکچونی زۆر لە نێوان شێوازی کارکردنی ئەو تابلۆیانە و شێوازی کارە ناسراوەکانی ئەم هونەرمەندە.

## ڕۆجەر ڤان دیرودین "R. Van Der Way den" ١٤٠٠-١٤٦٤

ئەمە سێ هەم ئوستادی گەورەی هونەری نیگارکێشانی فلمنکی‌یە، قوتابی کامبان بووەو لەسەر دەستی ئەودا پەروەردە بووە، لە کەسایەتی‌یە گەورەکانی مێژووی هونەری ئەوروپی‌یە. ئەم وەك ڤان ئایك و کامپن سەوداسەری دیمەنی سروشتی سەرنج ڕاکێش نەبووە، جیهانی ئەم جیهانی درامای مرۆڤایەتی و سۆزێکی ئاینی قووڵ بووە، هەرگیز هیچ شتێکی لە پێناوی خودی ئەو شتەدا بەرجەستە نەکردووە و زیادەڕۆیی لە کەشی تابلۆکانیدا نەخەملاندووە وەك ئەو

کەشە شانۆگەریانەی ئەودەمە بۆ تابلۆیان دەفراند. نە هێڵێك و نە ڕەنگ و نە شێوە بوونی نەبووە لەلای بەبێ ڕۆڵێکی درامی پتەو.

هەر لەبەر ئەم وردبینییە درامییەیە دەبینین بە دیوارێکی ساف ڕازییە لە جێی دیمەنێکی سروشتی زانراو و ناسراو لە تابلۆی لە خاچ دانی مەسیح دا، تەنانەت لەسەر شێوازی سەدەکانی ناوەڕاست ئاسمانی تابلۆکەی بە ڕەنگێکی ئاڵتونی کردووە. تابلۆکە بەو ڕەنگە سپیانەی کە فیگەرە پەیکەرییەکانی گرتۆتەوە و دەربازبوونی لە هەموو هەستێکی شوێن و کاتی، لە گوزارشتێکی ئەبستراکتی دەچێت، نە چیرۆکێ دەگێڕێتەوە و نە دەرباری دیمەنێ دەدوێت، تەنها بە زمانی ئازار و ئەشکەنجەیەکی قووڵ دێتەگۆ.

ئەم شێوە پەیکەریی فیگەرانەی لە مامۆستاکەیەوە وەرگرتووە و وەك ئەو شێوازی بێهاوتای لە تیژی و دەست نیشانکراوی هێڵدا هەیە.

جیاوازییەکی سەرەکی هەیە لە نێوان ڤان ئایك و ڤان در ڤیدن دا، یەکەمیان بینگەی نیگارکێشی هەیە بۆ شتەکان بەو ئۆرتە (اعتبار)ی بەهایەکی ڕەنگییەو جیاوازە لە روونی و خەستیدا، بەڵام دوهەم هونەرەکەی بە هێڵ و سێبەرە دیاری کراوەکانی هەر لە پەیکەری ریلیفی دەچێت، بەمەش لە هونەری غوتی نزکیترە، و هەرچۆن لە بینگە ئایدیالییەکەشییەوە لە ڕۆحانی سەردەمی ناوەڕاست.

تابلۆی (داگرتنی مەسیح) لە جوانترین ئاسەوارە هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندەیە. کە تیایدا سێ پیاو لاشەی مەسیح دادەگرن لە ساتێکدا پیاوێك و ئافرەتێك دەستیان بە مریەمەوە گرتووە کە لە تاوا کەوتۆتە سەر زەوی، ئەو ئاڵتونییەی لەسەر زەوی تابلۆکەیە دیسانەوە بەخشینی باڵایی و پیرۆزییەکە بە تابلۆکە، جوڵەکان لە جوڵەیەکی بالیەوە نزیکن، بە دانانی جوڵەی کەللەسەری کەسایەتییەکان هێڵێکی ئارابیسکیانەی بەرجستەتەکردووە. ئەم تابلۆیە ساڵی ١٤٣٥ دروست کراوە. سەرباری ئەم کارانە ڤاندرڤیدن لە کاری وێنەی کەسایەتیدا باڵادەست بووە و لەپاڵ گرنگیدان بە ڕووخساری کەسایەتییەکە گوزارشتی لە کەسێتی بەرامبەری کردووە لە پاڵ فەرامۆش نەکردنی ئەندازەی هێڵ و جوانی کۆمپۆزشن دا.

### جیرۆم بوش (J Bosch) ١٤٥٠-١٥١٦

ژیانی ئەم نیگارکێش و گرافیکییە هێند ڕوون و ئاشکرا نییە و بەشێکی باشی وونە، لەوە ئەچێ شاری (هارتوگن بوش Hertogenboch)ی بەجێ نەهێشتبێ کە مانای (دارستانی دیوك)ە. کڵێسای ئەم شارە هەندێ لە بەرهەمەکانی ئەم هونەرمەندەی لەخۆگرتووە، کە بە بەرهەمە

سەرەتایەکانی مەزەندە دەکرێت. لە کارەکانی شتێکی ئەوتۆ نەماوەتەوە و بەشێکی باشی وون بووە، سی و شتێ نەبێت، بەڵام هەندێ کۆپی کارەکانی دۆزراونەتەوە.

کارەکانی گوزارشت کردنە لە جیهانێکی ئەفسوونی یاخود بابەتی میللی ئاست نزم بە شێوازێکی تەعبیریانە، ئەم هونەرمەندەش یەکێکە لەوانەی پێ بەپێی شێوازی ڕێنیسانسی باو نەڕۆیشت بەڵکو تایبەتمەندی کارکردنی خۆی هەیە، کارەکانی بەڵگەن بۆ توانای پتەوی ئەو لە نیگارکێشاندا سەرباری داچونی بەرەو گۆڕانکارییەکی ڕەخنەیی و تێکدانی ئافەریدەکراوەکان لە پێناو بابەتە گاڵتەجاڕییەکانی تەنانەت ئەوانەش کە بابەتی ئاینین، زیاتر کەشی تابلۆکانی لە خەونی سەیر و نامۆ دەچێت، هەربۆیە هونەرەکەی بە پێشەنگی ڕێبازی سوریالیزم لە سەدەی بیستەم دا دادەنرێت.. لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی "دوا دادگایی"، کە لە مۆزەی ڤیەننایە، تابلۆی (بەهەشتی لەزەتەکان) مۆزەی برادۆ.

## لە هونەرمەندانی تری هەرێمی فلاندەر:

گەر بە شێوەیەکی خێراش بێت ئاماژە بە چەند هونەرمەندێکی تری ئەم هەرێمە بدەین لە دووتوێی ئەم سەردەمەدا لە دوای ئەو چوار هونەرمەندە دیار و پێشەنگ و خاوەن کاریگەریانە. دەکرێت باسی هونەرمەند پترۆس کرستۆس (Petrus Christus) بکەین کە ساڵی لە دایك بوونی نەزانراوە و لە ساڵی ١٤٧٢ یاخود ١٤٧٣دا کۆچی دوایی کردووە، لای هونەرمەند ڤان ئایك قوتابی بووە لە ئەتێلەکەیدا لە بروج، کۆمەڵێ تابلۆی ئەنجام داوە گرنگترینیان "هێنانە خوارەوە لە خاچ" و "ڕۆژی دواین" و "لە دایك بوونی مەسیح" و "مزگێنی" زیاتر گرنگی بە لایەنی گوزارشتی داوە، هەرچۆن لە کاری پۆرترێت دا جێی سەرنجە کارەکانی لەوانە "پۆرترێتی ئیزابیل بۆربۆنی" و "قەشەیەك".

ئەوەی جێی ئاماژەیە هیچ هونەرمەندێکی نیوەی دوهەمی سەدەی پانزە لەم هەرێمەدا نەیانتوانی لە داهێنانەکانی (ڤان ئایك و ڤان درڤیدن و کامپن)ی تێپەڕێنن.

## هونەرمەند دیریك بوتس (Dieric Bouts) ١٤١٥/١٤٢٠-١٤٧٥.

لە بنەچەدا هۆڵەندییەو لەژێر کاریگەریی ڤاندرڤیدن دا کاری کردووە بە ڕادەیەك هەندێ جار جیاکردنەوەیان ئاسان نییە بەڵام لە پێگەیشتنی کارکردنیا بەرەو شێوازێکی جیاو دەرکەوتوو چووە تابلۆکانی (دابەزین لە خاچ) و (دواشێو) لە کەشێکی درامی تایبەتدا بەرجەستە کراون، لایەنی دەروونی کەسایەتی ناو تابلۆکانی ئامانجێکی سەرەکی بووە لە کارکردنیا.

## هوجۆڤانەدر جوز (Hugo Van der Goes) ١٤٤٠-١٤٨٢

لە دوای مردنی دێریك بوتس هونەرمەندانی قوتابخانەی جان ڕێڕەوەکەیان گرتۆتە بەر لەوانە (جوست دی جاندی) Justede Gand و هوجۆڤاندر جوز بوون. ئەم دوانە پێکەوە پەروەردە بوون و یەکەمیان چووە ئیتالیا و لەوێ تابلۆی (دواشێو)ی دروست کرد کە سودی لە فرائەنجیلیکۆ وەرگرت و کاریگەریی هونەری ئیتالی لەسەر بزر نەبوو بەڵام بە ئەمەکی بۆ ڕۆحانی هونەری فیلمنکی ون نەکردبوو. لە دوا ئەم گەشتەیەوە هیچ شتێك دەربارەی جوست نازانرێت. بەڵام ڤاندر جوز تابلۆی زۆر دەدرێتە پاڵی بەڵام ئەوەی دڵنیایە تابلۆی (پەرستنی شوانەکان)ە کە ئەم تابلۆ گەورەیە کێشەیەکی زەقە لە نێوان ڕیالیزمی و ئایدیالیزمی یاخود تێبینی و ئەندێشە، جوتیارەکان زۆر بە کەشێکی ریالیزمی بەدیار مریەم و لە دایك بوونی عیساو یوسف و فریشتەوەن، سەرسەریان هەموو فریشتەیە، هونەرمەند هاوسەنگییەکی سەیری لە نێوان ڕاددەی ئایدیالیەت و ئەندێشەی نیگارکێشانی مریەم و فریشتەکانی بە جلی شۆڕوو درێژەوە کردووە لەگەڵ کێشانی نیگاری شوان و جوتیارەکان بە شێوەیەکی ریالیزمی و وردی تێبینی بەجلە سادەو ڕووخسارە میللییەکانیانەوە، سەری تاشراو یاخود قژی زۆر، دەستی چڵکن و ئاوساو ڕیشی نەتاشراو. پشتینەی تابلۆکە لەسەر شێوازی ئیتالی بە دیمەنێکی سروشتی پڕکراوەتەوە. کاریگەریی جدیەت و زیندوێتی و توانای دەربڕینی ئەم هونەرمەندە سنوری فلاندەری بڕی بۆ فەرەنسا و ئەڵمانیا بە کاریگەرییەکی توند و بەهێزەوە.

## هانس مملنك (Hans Memlinc) ١٤٣٣-١٤٩٤

بە یەکێك لە هونەرمەندە مەزنەکانی فلاندەر دانراوە لە لایەن ڕەخنەگرانی سەدەی نۆزدەهەمەوە، بەڵام ئەمڕۆ لە دوا دەرکەوتنی کاری پێشینەکانی واتە هونەرمەندانی پێش ئەم ئەو پێگەو بایەخەی نادەنێ. لە بنەڕەتدا ئەڵمانییە و هەر بە گەنجێتی هاتۆتە بروج لەوێ نیشتەجێ بوو، هانس مملنك کاری هونەریی زۆرە بەڵام لە دیارترینیان تابلۆی (ئاهەنگی ڕۆحانی سانت کاترین)ە کە لە ئاسەوارە دەگمەنەکانیەتی، تابلۆکە لە سێ بەش پێك هاتووە کە دولای بۆ یوحەننا معمدان و یوحەننای خاوەن بینگەیە، ناوەڕاستیش بۆ پاکیزە تەرخان کراوە بە پاڵتۆیەکی ئیرجوانییەوە و پشتی هەمووی کۆڵەکەیەو فریشتەو پیرۆزمەندەکانی تیا وەستاوە. ئەم هونەرمەندە تازەگەر بووە لە دیمەنی سروشتیدا و کردویەتیە پشتێنەی کارە (پۆرترێت)ەکانی بە شێوەیەکی ناسك و هێمن بەرجەستەی سروشتی کردووە.

## سپێدەکانی ڕێنیسانس لە فەڕەنسا

فەڕەنسا بەپێی ئەو پێگەیەی هەیەتی نێوەندێکی وەرگرتووە لە کاریگەریی هونەری سەروو واتە لە فلاندەرەوە بە لایەك، لە لایەکی تریشەوە لەو کاریگەریانەوە کەلە خوارو (ئەلب)ەوە دێن، واتە لە هونەری ڕێنیسانسی ئیتالیەوە، ئەمە بێ لەو کاریگەرییە ناوخۆیانەی کە لە هونەری غوتییەوە ئامانجی خۆیان دەپێکا، گەر هەردوو ناوچەی ڕۆژهەڵات و سەروی فەڕەنسا بە زەبری لەژێر تیکل (تاج) بوونی دیوکی بۆرجونیا هونەرمەندەکانی هەر کارێکیان کردبێت و هەر ئاسەوارێکیان بەرهەم هێنابێت شتێك نەبووە تەنها کۆپییەکی بێئاستی ئەو هونەرە مەزنە نەبێت کە دەسەڵاتی هونەری فلمنکی پیادەی کردووە لەو دوو ناوچەیەدا، بەڵام دوو ناوچەکەی تری فەڕەنسا واتە نێوەند و ڕۆژئاوای سەر بە مەلیکی ڕەند و پەروەردگاری هونەر و ئەدەب "رينيه دانجو" بوو، هەروەها ناوچەی خواروی فەڕەنسا لەژێر فەرمانڕەوای پاپادا بوو، هەردوو ناوچەکە هونەرێکیان ئەفراند فەڕەنسی ڕەسەن خاوەن بنەمایەکی تایبەتی وا کە چەندێ کاریگەریی هەردوو هونەری ئیتالی و فلاندەری لەسەر بێت نەگاتە ئەوەی ڕەسەنایەتی و تایبەتمەندێتی خۆی لە دەست بدات.

وەك لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدا جەنگی سەد ساڵە بووە مایەی ڕمانی قوتابخانەی پاریس، هونەرمەندەکانی دەستیان بە کۆچ و ڕەو کرد بەرەو خواروو بەرەو ناوچەی ڕووباری ئەللوار، بەم شێوەیە بوو بنکەی نوێ بۆ هونەری فەڕەنسی دامەزرا لە بورج (Bourges) و تۆرس (Tours) و ئەنجیە (Angers) و مۆلان (Moulins)، لە پاڵ ئەفینیۆنی پایتەختی بروفانس بەرامبەر تۆرنیە و دیجۆن کە پایتەختەکانی هونەر بوون لە فلاندەری ئەو سەردەمە.

هونەری فەڕەنسی ئەم سەردەمە بە مەبەستگەرا و یەکسانی دەناسرێتەوە، زیاتر ئاراستەی ساتە دەروونییەکانە وەك لە گوزارشت کردن لەو هەڵچوونانەی جووڵە دیارەکان نمایشی دەکات. بۆیە دەتوانین بڵێین هونەرێکە نزیك لە ژیان، بەڵام کام ژیان پەسەندە لای ئەو ژیانەی مەبەستەو بەرجەستەی دەکات کە دارێژراوەتەوە پشت بە بنەمایەکی ڕوون لە شێوازێکی کەشخەدا. بەرەنجامی نزیکی لە ژیان واقعیەتییەکی هەستی تیا بەرهەڤ بوو، لەبەرئەمە لەم لایەنەوە دەتوانین پێوانەی بکەین بە هونەری فلاندەر. بەڵام بە زەبری پابەندبوونی بە بنەماوە و بێگەردیی شێوازەوە زیاتر نزیکی دارشتنەوەی هونەری ئیتالی بوو.

هونەرمەندە فەڕەنسییەکان چەندان تابلۆی ئاینی و دنیاییان بەجێ هێشتووە، دوانیان لە شاکارەکانی هونەری ئەورووپی ناوزەد دەکرێن لە سەدەی پانزەدا، کە ئەوانیش (کیلیلەی

پاكیزە) و (بیتای ئەڤینۆن). بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ناوی زۆرێك لە هونەرمەندانی ژیاو لەم سەردەمەدا نازانین، لەبەرئەوە خاوەنی ئاسەوارەكە بە ناوی گرنگترین لە ئاسەوارەكانی بانگ دەكرێت، یاخود بە ناوی ئەو شارەی تیا دەركەوتووە، بۆ نمونە ئەوترێت "نیگاركێشی بەختی ڕووهان" بە بۆنەی دەستنووسی "بەخت گرەوەی مەزنی دیوك ڕۆهان" كە هونەرمەند ئەم بەخت نامەیەی بە تابلۆكانی ڕازاندۆتەوە ، یان هەروەك چۆن ئەوترێت "نیگاركێشی مۆلان" بە هۆی شاری مۆلانەوە كە هونەرمەندەكە لەو شارە ئاسەوارە هونەرییەكانی بەجێهێشتووە. یاخود "نیگاركێشی مزگێنی ئێكس" بە هۆی تابلۆی مزگێنییەوە كە لە شاری ئیكس دۆزراوەتەوە.

## نیگارکێشی بەختەکانی ڕووهان (Le Maitre des Heures de Rohan)

تا ئێستا بنەچەی ئەم دەستنووسە كە بە یەكێك لە دەستنووسە مەزنە جیهانییەكان ئاوزەد ئەكرێت و هونەرمەند بە شەست و پێنج كاری مینیاتۆری ڕازاندویەتییەوە -كە یانزەیان گەورەن- ڕازێكی نادیار و وون مێژوونووسانی سەراسیما كردووە. ئەوەی دیارە ئەم هونەرمەندە پەیوەستی بە مەلیك ڕینیە دانجۆوە هەبووە كە خودی ئەم مەلیكە هونەرمەند و ئەدیب بووە. وەنەبێت لە فەڕەنسادا پێش ئەم دەستنووسە دەستنووسی تر نەبوبێت و ڕازاوە بێت بە مینیاتۆر و دەرباری بەختەكان نەبوبێت بەڵكو كارە مینیاتۆرەكانی ئەم دەستنووسە جیایە لەوانەی بەر لە خۆی بە شێوازی داهێنەرانەی و مۆركی مەبەستگەراییانەی هەر ئەمەشە هەندێ كەسی وا لێكردووە پێوانەی بكەن بە شێوازی جرونڤاڵد هونەرمەندی ئەڵمانی كە لە سەدەی شانزەهەمدا دەركەوت.

هەمو كارە مینیاتۆرەكان خاوەن یەكەیەكی پێكهاتەیی پتەوو بەهێزن، توخمە تەلارسازی و دیمەنە سروشتییەكان تەنها وەك دیكۆرێكی هێمایی بۆ جەخت كردنەوە لە گوزارشت بەكارهاتون، هەروەك مەبەستی بەكارهێنانی جوڵەی قاچ و جوڵەی دەستەكان. كەشە گشتییەكەی لێوان لێوە لە جوڵەی توندوتیژ، لەشەكان پێچیان خواردووە جلەكان كەوتووە و چوەتە سەریەك وەك بڵێی بەكاریگەریی خولە فەلەكییەكانەوە بێت. هەست بە هیچ بۆشاییەك ناكەین لە پانتایی تابلۆدا، ئاسمان باڵی فریشتەكان تەنیویانە و زەویش سەوزەگیا ڕووپۆشی كردووە.

## نیگارکێشی موژدەی ئێکس (Le Maitre de l'Annonciation dAix)

ناوی مەلیك ڕینیە دانجو پابەندە بە ڕازێك لە ڕازەكانی مێژووی هونەری سەدەی پانزەهەم، مەبەست لێرەدا سیانەیی (موژدەی ئێكس)ە. ئەم سیانەیە لێك جیاكراونەتەوە،

تابلۆی ناوەندیان لە کاتیدراڵی مریەمی مەجدەلیە لە شاری ئیکس، ئەمە لە ساتێکدا بەشی ڕاستی لە مۆزەی (بروکسل)ە، بەشی چەپی لە مۆزەی ئەمستەردامە. دیمەنی نێوەند هێنانی موژدەیە لەناو کەنیسەیەکی غوتیدا، ڕیزی کۆڵەکەکانی لەسەر بنەمای زانستی بەربینە دروست کراوە. سیمای پاکیزە سەراسیمەیە و ڕووخساری فریشتەش هەڵگری موژدەیە، دەستەکانیان ناسك، ڕووناکییەکی هێواش دەشەکێتەوە لە سەرانسەری تابلۆکەدا، ئەمانە گشت وامان لێ دەکات بکەوینە بەراوردکاری ئەم تابلۆیە بە ئاسەوارەکانی ڤان ئایك کە پێ دەچێ خاوەن ئەم سیانییەیە سەرسام بوبێ پێی.

## ئەنجیراند شارونتون (Enguerrand Charonton) ١٤١٠-١٤٦٦

لەبەر ناوناوبانگی تایبەتی ئەم هونەرمەندە لەم قۆناغەدا باسی دەکەین چون نازناوی بەناوبانگترین هونەرمەندی ئەڤینۆنی ئەو دەمەی خۆی پێ بەخشراوە، شێوازی کارکردنی جیاواز بووە لەگەڵ ئەو کار و هونەرمەندانەی لە سەردەم و پێشتر لەودا کاریان کردووە، زۆرێك لە هونەرمەندانی هاو سەردەمی ئەم یاخود پێش ئەم شێوازی فلاندەری زاڵ بووە بەسەریاندا بەڵام شارنتۆن نزیکی خۆی لە هونەری غوتی و بەرجەستەکردنێکی مینیاتۆریانەدا بەدی کردووە. لە بەناوبانگترین کارەکانی تابلۆی "تاجە گوڵ خستنە سەر مریەم"ە، سیمایەکی گشتی نەخشاندنی هەیەو لە کۆمپۆزشنی گشتیدا کارە پەیکەرە ریلیفییەکانی کەنیسەی غوتی دێنێتەوە یاد. ناوەڕاستی تابلۆکە تایبەتە بە مریەم و سێکوچکەی پیرۆزیش لە دانانی تاجە گوڵی زێڕین لەسەر سەری بەشداران، ئەویش پاڵتۆیەکی شینی لەبەردایە کە ئاماژەیە بۆ پاکێتی مریەم، لە هەردوو لاکانی ئەم دیمەنەش کۆمەڵێکی زۆر لە فریشتەو پیرۆزمەند و قەشە و جۆرەها لە چینەکانی کۆمەڵ بە پێشڕەوایەتی پاپا دەبینرێن، پشتێنەی کارەکەی کردۆتە دیمەنێکی سروشتی ڕەنگە ئەوە تەنها خاڵ بێت کە سودمەند بوبێت تیا لە هونەری فلاندەریی، دەنا شارنتۆن گوێی نەداوەتە گەورە و بچوکی کەسایەتییەکانی بەپێی دورو نزیکیان یاخود بەپێی زانستی بەربینە، ئەو لایەنە مانەوی یەکەی مەبەست بووە و بەپێی ئەوەش پێکەوە پێوانەی داوەتە کەسایەتییەکانی.

## جان فوکیە (Jean Fouquet) ١٤٢٠-١٤٨٠

ئەودەمەی هونەرمەند شارونتون لە هەرێمی بروفانس بەدەرکەوت، لە شاری (تور) لە حەوزی ئەللوار هونەرمەندێکی تری بەناوبانگ کە ڕۆحی سەردەمی ڕێنیسانس تیا ئەژیا زیاتر لەهەر هونەرمەندێکی تری فەرەنسی هاتە نێوەندی کارکردنی هونەرەوە. پێدەچێت بچێتەوە سەر هەمان بنەماڵەی ئەو میرانەی هاوسۆز بوون بەرامبەر هیومانیزم، ئەو بنەماڵەیەی جان

ڤان ئایك و دیلا فرانشسکای تیا بەدەرکەوت، ئەم هونەرمەندە جان ڤوکیەیە کە دەرکەوتنی ڕێکەوتی کۆتایی شەڕی سەد ساڵەی دەکرد. وەك ئەوەی ئەو لە دوای هەموو کارەساتەکان نێررابێت تا بە هونەرەکەی گوزارشت لە ڕووناکی نێو ڕۆحی مرۆڤ و ئاشتی بکات کە لە سەرانسەری وڵاتدا دەشەکایەوە.

فۆکیە سەردانی ئیتالیای کردو چەند ساڵێ لە ڕۆما مایەوە، ئەم سەردانە خاوەن کاریگەرییەك بوو لەسەر هونەرەکەی کە فەرامۆش ناکرێت ئەمەش بە ڕوونی لە تابلۆی "جوتەی میلان"دا خۆی دەنوێنێت وەك لەو تابلۆیەی بۆ مەلیك شارلی حەوتەمی کێشا لە پاش گەڕانەوەی دەمودەستی لە ئیتالیا. جیاوازییەکی بەمەبەست هەیە لە نێوان هەردوو کارەکەدا، تابلۆی میلان وا دەرئەکەوێت کە لە ژیانێکی تردا بێت و لە جیهانێکی تر، بەو فریشتە ڕەنگاوڕەنگە خەیاڵاویانەوە و ئەو ڕووناکییە سپییە بێگەردەی لە سیمای مریەمدا لێوان لێوە لە گەورەیی ئاسمانی، بەڵام تابلۆی شارلی حەوتەم کە بە مۆرکێکی فەڕەنسی سوا و بەرجەستە کراوە نزیکترە لە شێوازێکی واقعی چ وەك مامەڵەی لەتەك ڕووناکیداو چ وەك سیمای دوو ڕووخسارەکە.

بەڵام گەر لە کاریگەری ڕێنیسانس بە شێوەیەکی دیارتر بگەڕێین ئەوا لەو سەدان کاری مینیاتۆرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە هونەرمەند بۆ دەستنووسی "بەختەکانی ئیتین شیفالیە" و دەستنووسی "لە کلتوری سەردەمی کۆنەوە[٤١] "ی دروست کردووە، ئەمە بێ لە چەندان دەستنووسی تر.

نیگارەکانی دەستنووسی دووەم لە هەموویان بە بەهاترن چون خاوەن باڵاییەکی کۆمپۆزشن و یەکگرتویەکی شێوازی و بەتواناییەکی پیاهەڵدانن بەدەر لەهەر نەخش کاریەك کە سەرنجی چاو بەلای خۆیدا بەکێش بکات و بەر لە ڕامانی ئاوازە سەرەکییەکەی بگرێت.

کاریگەریی هونەری ڕێنیسانس لە میانی بەکارهێنانی زانستی بەربینەو گرنگیدان بە دانانی دیمەنی سروشتی بۆ پشتێنەی تابلۆکە بەدەردەکەوێت. بەڵام هەرچی چۆنێك بێت فوکیە هەر فەرەنسییە لە ڕەڤان و پاکێتی و هێمنی و هاوسەنگی و کەشخەیی و کۆششی بۆ وتنێکی زۆر لە چەمکێکی پوخت و کورتدا.

لە دوای ئەم هونەرمەندانە دوو هونەرمەندی نەناسراو دێن کە بە نیگارکێشی پیەتای ئەڤینۆن و نیگارکێشی مۆلان بەناوبانگن، ئەمەی دواییان وا دەزانرێت چالاکی هونەریی لە نێوان ساڵانی ١٤٨٠ بۆ ١٥٠٠دا بووە، بەڵام دەربارەی دانانی مێژوویەك بۆ یەکەمیان شتێك نازانرێت و ناوەکەشی لەو تابلۆیەی حەزرەتی مریەمەوە هاتووە کە لە شاری ئەڤینۆن سەرە

ڕێگای ئیتالیاو ئیسپانیا و بورجونیا و فلاندەر دا دروستی کردووە. ئەم بەرهەمە بە ئایەتێکی تراجیدیای هونەری نیگارکێشان ناوزەد دەکرێت. زۆر کەس دەیانەوێت خاوەنی ئەم تابلۆیە بە ئەنجیران شارنتون دابنێن یاخود یاریدەدەرەکەی کە لە خۆی بچوکترە پییر ڤیات (Pierre Villate). بەڵام هەموو هەوڵەکان نەگەیشتۆتە ئەنجام و تا ئێستا ئەم نیگارکێشە نادیارەو بەم ناوبانگە دەناسرێت.

دووەمیشیان بەناوی شاری مۆلانەوە ناوبانگی دەرکردووە و تا ئێستا ناوی نازانرێت کارکردنی لە قوتابخانەی فلاندەری نزیکە بە تایبەت ڤاندەرجوز، کە تا ماوەیەکی زۆریش کاری ئەم هونەرمەندەش بەهی ئەو دەزانرا، بەڵام ڕەڤانیەتی فەرەنسی بە ڕوونی لە کارەکانیدا دیارە، ئەو بنەما تەلارسازییە پتەوەی لە تابلۆی (سیانەی مۆلان) دایە کە بێگومان هونەرمەند لە وێنەی ئەو شوشە ڕەنگینانەوە هێناویەتی یا وەریگرتووە کە لە پەنجەرە گوڵێنەکانی کاتیدراڵە غوتی‌یەکاندایە، شتێکی وەك ئەمە لە هونەری فلاندەردا بێ نمونەیە. تەنانەت ئەو تابلۆیەی بە ناوی (لە دایك بوونی عیسا)وەیە گەر بەراورد بکەین بە تابلۆیەکی ڤاندەر جوز کە بە هەمان ناونیشان، تێبینی ڕووتبوونەوە دەکەین لە هەمو زیادەڕۆییەکی پیاهەڵدان و نزیك بوونەوە لە سادەیی سروشتی لە بەرجەستەکردنی شوان و فریشتەو بەخشەری تابلۆکەدا، لەگەڵ پەیت کردنەوەی گوزارشت لەسەر کەسایەتی مریەم کە ڕووی سپی بێگەردی لە نێوەندی تابلۆکەدا بەدیارخستووە.

## سەرەتاکانی ڕێنیسانس لە ئەڵمانیا و نەمسا و ئیسپانیا و بورتوگاڵ

هونەرمەندە ئەڵمانیەکان یەکەم کەسانێك بوون سودیان لەو نوێکردنەوانە وەرگرتبێت کە کامپن و ڤان ئایك بە دەستیان هێنا، بۆ یەکەمین جار ئەم سوودلێوەرگرتنە لە تابلۆی ژیانی مریەمی مەجدەلی‌دا بەدەرکەوت کە لوکاس موزیر (Lucas Moser) نیگاری کێشا ساڵی ١٤٣١. هەر لەوکاتەدا هونەری مینیاتۆریی شێوە تەخت ڕوو لەناوچون بوو، پێشوازی لە هونەرێکی خاوەن توانای بەرجەستەکردنی واقعی لە زیادبووندا بوو. بەڵام ئەم واقعیەتە لکابوو بە خواستی تەعبیریی‌یەکی تیژەوە لای ئەڵمانی‌یەکان، بەرەنجامی ئەمەش شێوازێ ئەفرا کە بەدەر نەبوو لە جیدیەت و خۆشی، سەرەڕای هەموو قەرزار باریەکی بۆ هونەرمەندانی فلاندەر و هونەرمەندە ئیتالی‌یەکان.

کاریگەریی ئیتالی‌یەکان بەهێزتر بوو لە ناوچەی تیرۆل و خوارووەدا، بەڵام لە سەروو و خۆرئاوادا هونەرمەندانی ئەڵمانی وابەستەی قوتابخانەی تۆرینە بوون، واتەبە هونەری کامپن

و ڤاندەر ڤیدن و بوتس سەرسام بوون، لەبەر نزیکی شێوازیان لە خواستی تەعبیریەتەوە. سەرباری ئەمانە گشت ناتوانین بڵێین گۆڕانکاری گەورە لە هونەری ئەڵمانیدا ڕوویدا لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەهەمەوە نەبێت، لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا هونەرمەندهایەکی کەم بەدەرکەوتن- گرنگترینیان کۆنراد ڤیتز و ستیڤان لوخنەر- کە پێشەنگی ئەم ڕێڕەوە نوێیە بوون.

## کۆنراد ڤیتز (Conrad Witz) نزیکەی ١٤٠٠ بۆ ١٤٤٧ ژیاوە.

هیچ هونەرمەندێك بە هێندایی ئەم بەو نوێگەرایەتی‌یە سەرسام نەبوو کە کلاس سلوتر (Class Sluter) بە دەستی هێنا لە هونەری پەیکەرسازیدا. لە تابلۆکانیدا نیگاری لەشەکانی بە شێوەی پەیکەری تاشراو دەکێشا و هێندەی سەرڤاڵی دەرخستنی بوو هێندە گرنگی بە نیگاری کەسایەتی‌یەکان نەدەدا. سەرباری ئەمەش لە هەموو هونەرمەندانی ئەڵمانی زیاتر تێگەیشتنی بۆ بەهای ئەو نوێکردنەوانە هەبوو کە هونەرمەندانی فلاندەریی هێنایانە نێو هونەری نیگارکێشانەوە.

کەسایەتی بەهێزی ئەم هونەرمەندە وای کرد هونەرەکەی خاوەن مۆرکێکی سەربەخۆ بێت. تابلۆکان لە هەموو توخمێکی بی ئەرك ڕووت دەکردەوە، لەبەرئەوە لە بەرهەمەکانیدا ئەو کەشانە نابینین کە لە تابلۆی هونەرمەندانی فلاندەریدا پێی ڕاهاتوین.

لەگەڵ ئەمانەشدا کۆنراد ڤیتز تابلۆیەکی هەیە کە بە یەکەمین دیمەنی سروشتی لە هونەری ئەوروپیدا (بە مانا نوێیەکەی) دادەنرێت، ئەویش تابلۆی "ڕاوی سەیر"ە لە میانی ئەم تابلۆیەدا نیگاری دەریاچەی لیمان و شاری جنێڤی کێشاوە بە شێوەیەکی ڕیالیزمی وردەکارانە، گردەکان و دارودرەخت و ماڵەکان بەرجەستەکراون هەرچۆن ئەو ئافرەتانە دەبینین کە لە ڕۆخی ئەوبەری ڕووبارەکە خەریکی جل شتنن، هەست دەکەیت بە شلی ئاوەکە و ڕوونی‌یەکەی، یاری کرنی شەپۆلەکان و سەختی بەردەکان و جوڵەی هەور لە ئاسمان. دیمەنە سروشتی‌یەکە زیاترین پانتایی تابلۆکەی گرتووە، هەتا بابەتە ئاینی‌یەکەیمان وەختە لەبیر بچێت کە مەسیح بۆ هەندێ لە ڕاوچی‌یەکانی نێو بەلەمێك لەسەر ئاوەکە دەرکەوتووە و وەستاوە. ئەم جۆرە کارکردنە و مەزنی دان بە دیمەنە سروشتی‌یەکە شتێکی نوێ بووە بەلای هونەری ئەڵمانیەوە نەك هێندە و بەس بەڵکو بۆ خودی (کۆنراد ڤیتز)یش کە هەموو کارێکی لەوەوپێش دژ بە هەموو هێمادانێك بە سروشت بووە، تەنها لە یەك تابلۆدا نەبێت -کە تابلۆی پیرۆزمەند کریستۆفە- وێنەی دیمەنێکی سروشتی تیاکێشاوە، بەڵام دیمەنێك بوە زیاتر نزیك لە نەخشاندنێکی زاراوەیی‌یەوە وەك نزیکی لە واقعێکی سروشتی.

## مارتن شونجاور (Martin Schongauer)[٤٢].

(ساڵی لە دایك بوونی ئەم هونەرمەندە نەزانراوە بەڵام لە ساڵی ١٤٩١دا کۆچی دوایی کردووە). کاریگەریی هونەری فلاندەری لە زیادبووندا بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەهەمەوە، چەندان قوتابخانەی هونەریی چونە ژێر باڵی ئەم هونەرەوە، بەڵکو ببووە ئەرکێکی پێویست و پیرۆزی قوتابی کە سەردانێکی فلاندەر بکات بۆ کامڵ کردنی فێربوونی. لەم میانەدا ڤاندەر ڤیدن بەرزترین پێگەی هەبوو لایان، بە شێوازەکەی -کە خاوەن بوونیات نانەوەیەکی ئارابیسکی چنراو بوو- نمونەی باڵا بوو، بەڵام لەگەڵ هەولێ یەکسان ڕاگرتنی نێوان شێوازی ئەم هونەرەو شێوازە نەتەوەییەکەیاندا کە تا ئەوکاتە لێوان لێوی ڕەڤانیەتی سەردەمی غوتی بوو.

یەکەم تەوژمی نوێ بە مارتن شونجاوەر دەستی پێکرد کە لە کۆڵماری نزیك و پەیوەست بە فلاندەر پەروەردە بوو، بەڵام ئەم چارەسەرهایەکی تری نوێی لە بابەتەکاندا دۆزیەوە کە هونەرمەندانی پێش خۆی بەو شێوەیە نەیان کردبوو، هەمان کات توانی هێوری هەڵچوونی خواستی جێرمانی بکاتەوە، لەم نێوانەدا توانی بە شێوازێکی نێوەندیانەوە بێتە دەرێ، نە بەدەرە لە ڕەڤانیەت بەڵام وەختە ببێتە هونەرێکی لاتینی لە مەبەست و هێمنیدا و لە گرنگی دانیدا بە جوانی و ڕێککەوتن زیاد لە گرنگیدانی بە توانای گوزارشت.

شانزە تابلۆی بۆ شەهیدبوونی مەسیح و ژیانی پاکیزە دروست کرد، هەرچۆن هەندێ کاری کرد کە "پەرستنی مەجوسی" و "خێزانی پیرۆز"ی دەنواند. سەرباری ئەمانەش زۆر نیگاری هەڵکەنراوی هەیە (Gravures) کە تیایدا لە وردەکارییەکانی لەشی مرۆڤ و توخم و شێوەهای ڕووەکی دەتوێژێتەوە بە شێوەیەك کە لە کۆتاییدا لە تابلۆکانیدا تەنها جەوهەری شتەکان دەهێڵێتەوە. ئەم وردەکارییەشە مۆرکێك لە باڵایی دەبەخشێتە کارەکانی هەچەندە بچوکن لە پێوانەشدا. شێوازی شونجاوەر خاوەن دەنگدانەوەی خۆی بووە لە سەرپای ئەڵمانیاو نەمسا و بگرە هەتا ئیتالیا و ئیسپانیاش.

## لە هونەرمەندانی تری ئەڵمانیا و نەمسا

### ستیڤان لۆخنەر (Stephan Lochner)

لە میانی ساڵی ١٤٠٥ بۆ ساڵی ١٤٥١ ژیاوە لە کۆلۆنیا و لە قوتابخانەی بروج نزیك بووە کارەکانی سەرەتای نەخشەسازییەکی بڵاوبووە و دواتر بەرەو بەرجەستەی کەسایەتییەکانی چووە لە ڕێی پەنابردن بۆ ڕووناکی و پارێزگاری کردن لە مۆرکی نەخشاندنی ناسك و

زەمینی ئاڵتونی بە چڵ و گوڵەوە. لە تابلۆ دیارەکانی "ڕۆژی دوایی" کە دوو پۆل لە خەڵکی تیا بەرجسەتە کردووە، مرۆڤە چاکەکان کە فریشتەکان ڕێنمایی کەریانن لەگەڵ پیاوخراپان کە نەفرەت لێکراوەکان پێشڕەوایەتیان دەکەن. هونەری لۆخنەر پڕ لە ئەندێشەی بیژۆکی سەمەرەیە بەم شێوازەشی ڕێخۆشکەریی دەرکەوتنی ئەو تەعبیریەتە ناواقعییەیە کە لە سەدەی شانزەهەمدا بووە تایبەتمەندترین سیمای هونەری ئەڵمانی. هونەرمەند میخائیل پاخر (Michael Pacher) (١٤٣٥-١٤٩٨) لەو هونەرمەندە نەمساویانەیە کە پەیوەستییەکی توندوتۆڵی بە هونەری مانتێناو بیللینییەوە هەبووە ئەمەش لە میانی کارە هونەرییەکانەوە بەدیارکەوتووە، لە گرنگی دانیدا بە زانستی بەربینەو توێکاری کە پێشتر لە هونەری ئەم ناوچەیەدا نەزانراو بووە، زەمینەی ئاڵتونی نەماو گۆڕرا بە هەیکەلی بیناسازیی. چرچ و لۆچی پێچ خواردوی نێو جل و بەرگەکان جوڵەیەکی کارەبا ئاسا بەناو تابلۆکەدا دەگێڕێ، ناوی ئەم هونەرمەندە بۆتە قوتابخانە و چەندان هونەرمەندی وەك ڕوویلاند فرولوف (باوك) (Rueland Frueauf) و فوڵجمۆت (Wolgemut) و هانز هۆڵبنی باوك. (کە ڕێخۆشکەری هاتنی دیورەر (Durer)ی مەزن بوون و بەو مەزنە ڕێنیسانسی ئەڵمانی دەست پێدەکات) لە دەوری کۆبوونەوە.

دەرباری هونەر لە ئیسپانیاو پورتوگال لە سەرەتاکانی ڕێنیسانسدا، بەرەنجامی پەیوەستی پتەوی ئیسپانیا بە ئیتالیاوە و درێژبوونەوەی دەسەڵاتی هونەری فلاندەری تا ئەم دوو وڵاتە وەك وڵاتانی ئەڵمانیا و نەمسا. چون شارەکانی ناپۆلی و سقلیە سەر بە مەلیکی ئەراگۆن بوون. ئەم مەلیکە لە دوای سەردانی ڤان ئایك وەك نێرراوی دیوکی بۆرجوانیا بۆ وڵاتەکەی بڕیاریدا ژمارەیەك پیشەساز و هونەرمەند بنێرێت بۆ وڵاتی فلاندەر بۆ توێژینەوەی هونەر و پیشەسازی لە نێوان ئەوانەدا هونەرمەندی نیگارکێشا (لویس دالماو) (Luis Dalmau) بوو کە ماوەیەك لە ئەتێلەکەی ڤان ئایك دا کاری کرد، لەو تابلۆیانەشدا کە بۆ مریەمی دروست کرد پاشان هەست بە کاریگەری ئەم هونەرمەندە دەکەین لەسەری.

کاریگەری هونەری فلاندەری باش دەرنەکەوت لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەوە نەبێت کە تێکەڵ بە میزاجی ئیسپانی ئەندەلوسی بوو کە پشت بەستە بە کلتورێکی مەزن لە باق و بریق و دەوڵەمەندی نەخشاندن.

بەڵام لە پورتوگال، بزاڤی نوێخوازی لە کۆتایی سەدەی پانزەدا بەدەرکەوت بەرەنجامی ئەو دۆزینەوە مەزنانەی لە دەریاوە کراو وڵاتی لە پرێکدا بردە بارێکی نوێوە.

لە هونەرمەندە ئیسپانیيە دیارەکان خایم هوجیە (Jaim,e Huguet) یە بە باشترین هونەرمەندێ ناوزەد دەکرێت کە بەرشلۆنە بەخۆیەوە دیبێ لەوودەمەدا. بە ناسکی دەستی پێکرد و هونەرەکەی دواتر گۆڕڕاو چووە پێشەوە، پشتی بە هێڵ ئەبەست هێند وابەستەی ڕەنگ نەبوو، خاوەن بەرهەمێکی زۆر بوو لە بەناوبانگترین تابلۆکانی ئەوانەن کە بەرجەستەی ژیانی پیرۆزمەندان ئۆغستین و فنسان و برناردان دەکات. تەنها ساڵی مردنی زانراوە کە ساڵی ١٤٩٢.

## بارتولومیو برمیخو (Bartolomeo Bermejo) ١٤٧٠-١٤٩٨

دەرباری ژیانی ئەم هونەرمەندە شتێکی ئەوتۆ نەزانراوە کە لە هونەرمەندە مەزنەکانی ئەو سەردەمە بووە، هەمیشە وابەستەی سەفەر بووە و تابلۆکانی لە ئیتالیاو خۆرهەڵاتی ئیسپانیا و هەرێمی ئەراگۆن دۆزراوەتەوە. کارەکانی سەرەتای لەژێر کاریگەری (ڤاندرڤیدن)دا بووە و دەرباری پیرۆزمەندەکان، بەلام تابلۆکانی دوایی وەك (ڕۆژی دواین، بیتیا، مریەم)ە خاوەن دیمەنی سروشتی باڵایە بە سیمایەکی درامیانەوە. لەم دیمەنە سروشتیانەدا کاریگەریی هونەری ئیتالی لەسەرە، بە تایبەتی هونەری مانتینا، لە دوا ئەم هونەرمەندە فرناندو گالیجۆ (Fernando Gallego) دێت لە میانی ساڵانی ١٤٦٧ بۆ ١٥٠٧ ژیاوە و چالاکی نواندووە.

بەرەنجامی تێکەڵی زیاتری ئەم وڵاتەو وڵاتی فلاندەر لە ڕێگەی دەریایەوە و سەربەخۆبوونی وڵات لە یەکگرتنی قەشتالەو ئەراگۆن و لێکدانی ئەم دوو تەختی فەرمانڕەوایەتیيە. قوتابخانەیەکی نوێ لە هونەردا دروست بوو کە بە ناوی قوتابخانەی ئسپانی فلاندەری ناوی پەیدا کرد، لە دیارترین هەڵکەوتوانی فرناند و جالیجۆیە کە چەندان تابلۆی ئاینی لە کاتیدراڵە ئیسپانیەکاندا بەجێهێشتووە. لە شێوازیدا دەچێتەوە سەر کۆنراد ڤیتز، هەندێ جاریش لە پێچ خواردنی جوڵە و خواستی تەعبیریدا لە شونجاوەر نزیك دەبێتەوە. بەڵام بۆ خۆی نوێخوازی لە دیمەنە سروشتیيە پڕ تاوێرە بەردیيە کەوانەیی و شێ دارەکاندا کردووە. لە دوای ئەم هونەرمەندە لە ئیسپانیادا تەنها بەس لە هونەرمەند پیدرۆ بیرۆجویت دەکرێت (Pedro Berruguete) کەلە چەمکەکانی سەدەی ناوەڕاست یاخی بوو و هونەری لەسەر شێوازی فلاندەری خوێند و بەڵام سەفەری کرد بۆ ئیتالیا لە دوا کارەکانیدا کە ئۆربینۆی شاری رافایل کردی مەیلی بەلای شێوازی جیرلاندایۆدا چوو.

لە پورتوگالیش هونەرمەند نونیو جونسالفیز (Nuno Goncalves) لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەوە وەك نیگارکێشێکی بە توانا بەدەرکەوت و بە جارێك ئاستی هونەری وڵاتەکەی گەیاندە ئاستی هونەری فلاندەری. بلیمەتی ئەو لە چوار تابلۆی گەورەدا خۆیمان پیشان دەدات

بە تایبەتی کە تیایدا پیاهەڵدانی خێزانی فەرمانڕەوای مەلیکی و پیاهەڵدانی میللەت بۆ پیرۆزمەند فنسان شوانی وولات بەرجەستە دەکات، هێند بەسە کە لە بالآیی کۆمپۆزشنەکانی ڕامێنین و وریایی وەسفکردنی و زەنگینی ڕەنگی تا ئەم هونەرمەندە لەنێو هەڵکەوتواندا هەژماربکەین، سەرباری ئەمانە گشت نیگارکێشێ بووە لە کاراترین نیگارکێشانی هونەری پۆرترێت، ئەو چوار تابلۆیەشی لە ڕاستیدا لە دەیان وێنەی پۆرترێتی پێك هاتووە کە هەرکامێکیان بۆ خۆی کارێکی هونەریی بالآیە.

## هونەری ڕێنیسانسی ئیتالی سەدەی پانزەهەم
## یاخود هونەری چوارسەدەکان "کوانترۆ شنتۆ"

ئیتالیای بەرەبەیانی سەدەی پانزە، ئیتالیایەك بوو دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەوروپا. لە شەش دەوڵەتۆکەی بچوك پێك هاتبوو، ئەو خێزانانە فەرمانڕەوایەتییان دەکردن کە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

دەوڵەتەکان کۆماری ڤینیسیا و کۆماری فلۆڕەنسا، کە لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی میدتشیدا بوو (١٤٣٤-١٤٩٤). دیوکی میلانۆ کە خێزانی سفورتزا لە ١٤٥٠ وە گرتبویانە دەست. دیوکی فیراراو سافویا و شانشینی ناپۆلی بوون. ئەمە جگە لە چەند میرنشینێکی بچووك. لە نزیکی ساڵی ١٤٠٠دا زۆربەیان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی دیوکی میلانۆوە بەرەنجامی تواناو بەهێزی دەسەڵاتی، تەنها فلۆڕەنسا نەبێت کە لێهاتوی سەرۆکەکانی بووە لەمپەر لەبەردەم ئەو دەسەڵاتەدا. هەر ئەم سەرۆکە لێهاتوانەش کردیانە پێگەی ڕووناکی شارستانیەتی ڕێنیسانس بە تایبەت ڕۆشنبیری و هونەریان گەیاندە چلەپۆپەی سەردەمەکەی خۆی.

ئەم چالاکی و چونە پێشەوەی ڕۆشنبیری بە گشتی و هونەر بە تایبەتی لە فلۆڕەنسادا نەوەستا و بەرەو بیزاو جنواو ڤینیسیا بۆوە. هەرچۆن لە سایەی ئەو پاپایانەوە کە دەسەڵاتی ڤاتیکانیان دەبرد بەرێوە بزاڤی هونەریی پەرەی سەند لە سەرو هەموویانەوە نیکۆلای پێنجەم و جولیوسی دووەم و سکتوسی شەشەم و لیۆی دەهەم کە سەر بە خێزانی میدتشی بوو. ڤاتیکان بۆ خۆی بووە سەنتەرێك بۆ توێژینەوە کۆنەکان، کتێبخانەکەشی ڕۆڵی ئەکادیمیایەکی دەگێڕا لە پێناو ئەو مەبەستەدا.

بڵاوبوونەوەی چاپ و چاپەمەنی ڕۆڵی بەرچاوی خۆی گێڕا لەو سەردەمەدا لە پەرەوکردنی بزاڤی ئەدەب و نووسین و دانانی تیۆری لە میانی هونەردا. بۆ یەکەمین جار لە مێژووی هونەردا ئەندازیاری ئیتالی لیوباتیستا ئەلبێرتی (Leo Battista Alberti) (١٤٠٤-١٤٧٢) نامەیەکی لەسەر هونەری

بیناسازی دانا و کتێبەکانی دەربارى نیگارکێشان و پەیکەرسازی و تەلارسازی نووسی، بەڵام بۆ خۆی چێژی لەبیرکردنەوە و هەوڵی زەینی وەردەگرت بۆیە ئەم بیریارە ناوازەیە بنەماکانی ئایدیالیەتی نوێی بۆ ڕێنیسانس دارشت، جێبەجێکردنی زۆربەی پرۆژەکانی بۆ کەسانی تر بەجێهێشت بە تایبەت برامانت لە سەدەی شانزەدا. هەرچۆن جیبرتی کتێبێکی دەرکرد و دیلافرانشیسکاش توێژینەوەیەکی دەربارى بەربینە (المنظور) نووسی.

هەندێ لە مێژوونووسان دەستپێکی ڕێنیسانس لە ئیتالیادا بۆ پەیکەرسازی دەگێڕنەوە بە پێچەوانەی هونەری ڕۆمانسك و غوتی کە دەستپێکیان بە هونەری تەلارسازی بوو. هەرچی چۆنێك بێت گەر هونەری ڕێنیسانسی ئیتالی سەدەی پانزە بە پەیکەرسازی دەستی پێ کردبێت ئەوا بە تەلارسازیدا گوزەری کردووە و باڵایی خۆی لە دواجاردا بە نیگارکێشان بەخشیوە.

ناکرێت گەر باسی هونەری سەدەی پانزەی ڕێنیسانس بکەین و لە فلۆرەنساوە سەرچاوە نەگرین چون ئەم شارە پێشڕەوایەتی ئەم بزاڤە نوێیەی دەکرد کە وشیاری بەرامبەر مێژوو پەیداکرد وەك بەسەرهاتێکی بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی، نەك تەماشای مێژوو بکات تەنها وەك چیرۆکێکی گوناهکردن و چیرۆکێکی ڕزگار بوون. بەڵکو پەی بەوە برد کە ئەم بوونە مرۆڤییە بریتییە لە کێشەی نێوان چەندان هێز نەك کێشەیەك بێت لە نێوان چاکەو خراپەدا. ئەم کێشەیە لەناو مرۆڤ خۆیدا ڕوودەدات نەك لە نێوان مرۆڤ و هێزێکی دەرەکی ئەودا، هەر بۆیە لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەم کێشەو جەنگە بگێڕێ تەنها پشت بە زیرەکی و لێهاتویی و توانای کەسایەتی خۆی نەك تەنها پشت بەهێزی ئیمان.

## بەرەبەیانی هونەری ڕێنیسانس لە فلۆرەنسا و نێوەندی ئیتالیا

فلۆرەنسا لە مەزنترین هونەرمەندەکانی ئەم سەدەیەی بەرهەم هێنا کە لە شارەکانی ترەوە داوایان لێدەکرا تا پرۆژەی هونەریان بۆ ئەنجام بدەن، شێوازێکی نوێیان ئافەریدە کرد کە هەڵقوڵاوی شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانی بوو، ئەم دەستپێشخەریەی فلۆرەنسا لە هونەری پەیکەرسازییەوە سەرچاوەی گرت، هەر بۆیە دەکرێت دەستپێکردنمان لە پەیکەرسازی و پەیکەرسازەکانەوە بێت ئەویش یەکەم لەبەر ئەو پێگە تایبەتەی لە مێژوودا هەیانە. دوهەم لەبەرئەوەی بە چارەکە سەدەیەك پێش نیگارکێشەکان کەوتن لە بەرجەستەکردنی ئەو ڕۆحە نوێیەی بزاڤی هیومانیست داوای دەکرد.

لە دیارترین و گرنگترینیان جیبرتی و دیلاکویرشیاو دۆناتێللۆ بوون.

## پەیکەرسازی:

ئەو پێشبڕکێیانەی سەرکردەکانی فلۆڕەنسا سازیان دەکرد لە میانی ساڵانی ١٤٠١ بۆ ١٤٠٢ ڕۆڵی خۆی گێڕا لە چونە پێشەوەی میانی کارکردن و توێژینەوەی لە پەیکەرسازیدا، هەرچەندە سیمای گشتی کارکردنەکانی ئەم ماوەیە لە دیزاینێکی غوتی تێپەڕی نەدەکرد بەڵام کاریگەریی هونەرە کلاسیکییەکان لە گرنگی دانیاندا بە جەستەی مرۆڤ و جوانکاری تیایدا ناشارێتەوە. یەکێك لەو پێشبڕکێیانە دروست کردنی دیزاینێکی تایبەت بوو بە کۆمەڵی تابلۆی برۆنزی تا دەرگاکانی شۆردنگەی فلۆڕەنسای پێ برازێننەوە، هونەرمەندە لاوەکانی ئەوکاتەی فلۆڕەنسا پێشبڕکێیان بوو لەگەڵ یەکتردا بۆ دیزاینێکی گونجاو سەبارەت بە بابەتی هەڵبژێرراو کە دەربارەی چیرۆکی پەیامبەر ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕیەتی ئەو ساتەوەختەی یەزدانی مەزن جبرائیلی فریشتە دەنێرێت تا بەرانێك بکاتە قوربانی لەجێی کوڕەکەی. لە دیارترینی ئەو هونەرمەندە گەنجانەی بەشداری ئەم پێشبڕکێیە بوون (لۆرنز و جیرتی) و (فیلیبو برۆنیلسکی) و (دۆناتێللۆ) بوون. پرۆژەکەی جیبرتی هەڵبژێررا بەرەنجامی بەپێزی دیزاینەکەی و جوانی هێڵەکانی. بەڵام دۆناتێللۆ و برۆنیلسکی سەفەریان کرد بەرەو ڕۆما. یەکەمیان سەرقاڵی توێژینەوەی شاکارەکانی هونەری پەیکەرسازی کلاسیکی بوو لەوێ و دووەمیان گرنگی دا بە توێژینەوەی تەلارسازی ڕۆمانی کۆن.

### لۆرینزۆ جیبرتی (Lorenzo Ghiberti) ١٣٧٨-١٤٥٥

جیبرتی بە بازنەی گەیەنەر یاخود پەیوەستی نێوان هونەری غوتی و هونەری ڕێنیسانس دادەنرێت. چونکە ئەو چڕییە فۆرمییەی لە دیزاینی گشتی هونەری غوتیدایە هەمیشە وەك هێڵێکی گشتی لە کارەکانیدا بەردەوام لە درێژبوونەوەدا بوو هەرچۆن بۆ چارەسەری جوڵەی فیگەرەکانی و بەرجەستەکردنی چرچ و لۆچی جل و بەرگەکانیان و چارەسەری بۆ پشتینەی کارەکانی بە تەلاری ڕۆمانی و بەکارهێنانی زانستی بەربینە لە بچوکردنەوەی پێوانەی کەسایەتییەکانی دواوەی تابلۆکانی لە چاو کەسایەتییەکانی پێشەوەیدا ئەمانە گشت بە ڕوونی کاریگەریی هونەری کلاسیکی کۆن و ڕێخۆشکەری هاتنی هونەری ڕێنیسانس بوون.

ئەودەمەی برونیلسکی و دۆناتێللۆ لە فلۆڕەنسا نەمابوون جیبرتی لە کۆمەڵە تابلۆی دەرگای دوەمدا کاری دەکرد کە لە بیست و هەشت پارچە پێك هاتبوو لە کارکردنیدا بیست ساڵی خایاند، ئەم دەرگایە خرایە جێگەی دەرگاکەی ئەندریا پیزانۆ نەخشاندبوی بۆ ئەو شۆردنگەیە کاتی خۆی پێش سەدەیەك. دواتر گوێزرایەوە ڕووی خوارو. تێبینی جیاکاری و

پەرەسەندنێکی هونەریی دیاردەکرێت لە دیزاینەکان و شێوازی چارەسەرکردنی هونەریدا لەچاو ئەو دەرگایانەدا کە ئەندریا پیزانۆ نەخشاندبوونی. نزیك تەواوبوون و کارکردنی دەرگای دووەم، دۆناتێللۆ گەڕایەوە فلۆرەنسا بەڵام ببووە خاوەنی شێوازێکی پەرەسەندوی کلاسیکی ناوناوبانگی خێرای پێ دەرکرد، کاریگەریی ئەم شێوازە نوێیە زوو بە زوو بڵاوبۆوە. بە ڕوونی ئەم کاریگەرییە لەسەر شێوازی چارەسەرکردنی هونەریی دەرگای سێهەم دەبینین لای جیبرتی کە لە میانی ساڵی ١٤٢٥دا نەخشاندویەتی و مایکل ئەنجیلۆ ساڵی ١٤٥٢ بینیویەتی و هێند پێی سەرسام بووە وتویەتی "ئەم دەرگایە هەر بۆ ئەوە باشە بکرێتە یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت" هەر لەسەر ئەم وتەیەشەوە ناوی دەروازەکانی بەهەشتی لێنراوە.

دەرگاکان بە ماددەی برۆنزکراوەو دەرگای سێهەم لە دە پارچە پێك هاتووە لە پەیکەری ریلیفی هەندێ بەسەرهات و چیرۆکی ئاینی دەگێڕێتەوە هەر لە ئەفراندنی ئادەم و حەواوە. ئەم دەروازەیە خاوەن زیندوێتییەکی ڕازاوە و ناسکییەکی هێڵەکانی و نەرمیو نیانیەك لە کەوانەو چەمانەوەکانی و وریایی و وردبینییەك لە دیزاینەکانیدایە، ماددە برۆنزیەکەشی لە لایەکی ترەوە سروشێکی ئاڵتونی دەبەخشێ بە ڕاددەیەك هێندەی وا هەست دەکەین لە دەستکردی زەڕەنگەرێکی داهێنەرو هونەرمەندو لێزانە، هێند هەست ناکەین لە دەستکردی پەیکەرسازێك بێت. جیبرتی سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە لە سروش دان بە ڕەهەندی سێهەم لەم تابلۆیانەدا کە زۆربەی پشتی کارەکانی بە بیناو تەلاری ڕۆمانی کۆن ڕازاندۆتەوە، ساوی جەستەو فۆرمە دوورەکانی زۆر نەرم کردۆتەوە ئەمەش بۆ خۆی شێوازێکی نوێ بوو لە پەیکەری ریلیفیدا بەدی هێنا و پێی دەوترا "سکیا تشاتۆ" (Schiacciato).

## جاکوپۆ دیلاکویرشیا (Jacopo della Quercia) ١٣٧٤-١٤٣٨

دیلاکویرشیا لە نێوان پەیکەرسازە هاوسەردەمەکانیدا تاکە هونەرمەندە کە خەڵکی شاری فلۆرەنسا نەبێت، لە شاری سینا (Sienna) لە دایك بووە و هونەرمەندێکی گەورەی بە توانایە، وریایە لە گوزارشت دا، هونەرەکەی بەپێزی و پوختەیی تیا دیارە، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە گەر بە مەزنترین هونەرمەندی بزانرێ کە هەرێمی تۆسکانیا بەخۆوەی دیوە لە سەدەی پانزەهەمدا.

جەستەی پەیکەرەکانی بەخۆو گەورەن بە پێچەوانەی جیبرتییەوە نزیك لە شێوازی مایکل ئەنجیلۆ، هەڵچونی گەرم و سیمای پڕ لە حاڵەتی دەرونی و چاوی کراوە کە هەموو توانایەکی تیا دیارە، لە پەیکەرە ریلیفییەکەیدا بەناوی "دەرکردن لە بەهەشت" کە لە شاکارەکانیەتی، هەست بە گیانی یاخی بوون دەکرێت لە دەموچاوی ئادەمدا، بەڵکو هەست بەو

یاخیبوونە دەکرێت لە گەشت بەشێکی لەشیدا بەرامبەر بەو هێزەی پاڵی پێوە دەنێت بۆ دەرکردنی لە باخچەکانی بەهەشت.

## دۆناتێللۆ (Donatello) ١٣٨٦-١٤٦٦

دۆناتێللۆ بەدیارترین و بە تواناترین هونەرمەندی پەیکەرسازی ئەم قۆناغەی ڕێنیسانس ناوزەد دەکرێت، پێگەی گرنگی ئەم هونەرمەندە و بەرهەمەکانی ڕۆڵێکی وایان گێڕاوە مێژوونووس و توێژەرەوەکان ناتەبابن لە پۆلاندنی بەپێی پاشکۆیەتی بۆ هونەری غوتی یاخود پەرەپێدەرێکی هونەری کلاسیکی. لێکدانەوەیەك دەڵێت هاتنی دۆناتێللۆ واتە جیابوونەوەی یەکجارەکی لە هونەری غوتی، و پاش گەڕانەوەی دۆناتێللۆ لە سەفەرەکەی شەیدایی پێوە دیاربوو بەوەی کە دیبوی لە ئاسەوارە ڕۆمانییە کۆنەکان، تا ماوەیەکی باش لە پەیکەرەکانیدا بە باڵاو جەستەی جوانی مرۆڤدا هەڵیدەدا، ئەو ساتەی پەیکەرسازی لە سەرودا (مەبەست سەروی ئیتالیاو ئەورووپایە) لەگەڵ شێوازی فلامبۆیاندا یەکانگیر بوو کە قوتابخانەی کلاس سلوتر نمایندەی دەکرد. (فلامبۆیان و ئیزابیلی و مانویلی سێ شێوازی دوا دوایی هونەری تەلارسازی غوتین) پەیکەرسازی خرابووە خزمەت دروست کردنی سروتە ئاینییەکانەوە بۆ گوزارشت کردن لە سۆزێکی ئاینی هەڵچوو و بەتین. ئەو ساتانە دۆناتێللۆ لە ئیتالیادا بە برۆنیللسکی هاوڕێیدا نووسابوو وەك سێبەرەکەی و لێی نەئەبۆوە لە توێژینەوەی ئاسەوارە ڕۆمانییە کۆنەکان دا، هەرچۆن هاوهەڵوێستی بوو لە شۆڕشکردن بەسەر ڕێسا غوتییەکاندا، بەسەر جوانی کلاسیکیدا هەڵیدەداو، سروشی لە سروشت وەردەگرت و جەختی لەسەر وێنەی مرۆڤ دەکردەوە لە پەیکەر و ریلیفەکانیدا.

لێکدانەوەکەی تر دەڵێت دۆناتێللۆ نموونەیەکی باڵایە بۆ هونەرمەندێکی سروشتیی کەم هاوتا لە پەیکەرسازی پیرۆزمەندەکاندا کە لە پۆرترێت و وێنە ریلیفییەکاندا پێشکەشی کردون. سروشتی دۆناتێللۆ لە هەوڵدانیدا دەرئەکەوێت بۆ ژیان کردنەوە بە بەری نموونە ئایدیالییە فلۆڕەنسییەکاندا، بە دەرخستنی ماسولکەکان و گوزارشت کردن لە هێز هەر لە بەری پێوە تا تەوقی سەر، ئەم ئایدیالیەتە گوزارشتییە نزیکە لە هونەری مۆدێرنەوە، لەبەر ئەمەشە (ڕۆدان Rodin) و (قوستەنتین مۆنیە Meunier) بە میراتگری دۆناتێللۆ دادەنرێن کە زیاتر پەیوەستە بە ڕێساکانی غوتییەوە وەك لە پەیوەستی بە هونەری ڕۆمانی و گریکییەوە.

لێرەدا بە سانایی هەست بە جیاوازی هەردوو لێکدانەوەکە دەکەین ئەمەش شتێکە ئاسایی هونەرمەندێکی گەورە چەند لێکدانەوەیەك هەڵگری بەرهەمەکانی، هەمیشە هونەرمەندە مەزنەکان کە خاوەن ڕۆڵی مێژووین لە پێوانگ کردنیاندا دڵەڕاوکێیەك هەیە. گەر بێینە

سەر بەرهەمەکانی ئـەم پەیکەرسازە، داوای لێکـراوە بـە دروست کردنـی چـەند پەیکـەرێك بـۆ هـەندێك لـە پیـاوانی پیرۆزمـەندی ئـاینی تـا لـە کەنیسـەی پیرۆزمـەند میخـائیل لــە فلۆڕەنسـا دابنرێت، هەرچۆن شاری بادوا لە ساڵی ١٤٤٣دا پەیکـەری پاڵـەوانی شـارەکەیان پـێ سـپارد (جاتـا میلاتا Gatlamelata) تا لە مەیدانی سەرەکی شارەکەدا دابـنرێت. ئـەوەی تێبینـی دەکرێـت لـەم پەیکـەرەدا بیرۆکەکـەی لـە بیرۆکـەی پەیکـەری ئیمـپراتۆری ڕۆمـانی (مـارکۆس ئۆلیبــۆس) وەرگیرابێت کە لە ڕۆما دانراوە.

لە بەناوبانگترین کارەکانی پەیکەری برۆنـزی (داود بەسـەر جولیـات دا سـەردەکەوێت) ئـەم پەیکەرە ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنە دەنوێنێت کە بەسـەر هونـەری پەیکەرسـازی سـەرەتای ڕێنیسانسـدا هـاتووە، ئـەم کـارە یەکـەمین هەوڵێکە بـۆ پەیکـەری ڕووتـی جەسـتەی مـرۆڤ لــە سـەردەمە کۆنەکانــەوە. هــەرچۆن یــادی ئــەو لارکردنەوەیــەی نێــو جەســتەی پەیکــەرە گریکیـیەکانمان دەخاتەوە. لەبەرئەوەی ئەم پەیکەرە بە مەبەسـتی دانـانی کـراوە لـە گۆڕەپـانی کۆشکی خێزانی میدتشی، دەبینین وەها دیزاینی کراوە و دروست کراوە تا لە هـەموو لایەکـەوە ببینـرێت.

دۆناتێللۆ خاوەن بەهرە و داهێنان و سەلیقەیەکی ورد بووە بۆ هەست کردن بە واقعیەت و وردەکاری لە لاسایی کردنەوەدا، ئەم توانایەی وای کردووە لە کۆزیمۆمیدتشـییەوە نزیـك بێـت. کاری پیشەسازی کانزای لای هونەرمەند جیبرتی فێربووە، بەڵام لە مامۆستاکەی باڵاتر بووە لـە نەخشی سەر کانزادا ئەمەش لەو کارانەیدا دەرئەکـەوێت کـە لـە سـاڵی ١٤٢٠دا ئـەنجامی داون و گرنگی داوە بە تۆمارکردنی قووڵی. ڕەنگە جیـبرتی کاریگـەریی فوتابـییەکـەی لەسـەر بوبـێ لـە گرنگیدانیدا بە توێژینەوەی مرۆڤ لە تابلۆکانی دەرگای سێهەمدا.

سـەرباری پەیکـەری (داود) کـە نمونـەی سەرسـامی ئـەوە بـە جوانـی جەسـتەی مـرۆڤ لــە هەرەتی لاویدا، پەیکەرەکانی (خۆشەویستی و یوحنا مەعمەدان) بە هەمان خواست بەرجەستە کراون، بەڵام خواستی درامی ئەو لەو کارە ڕیلیفییانـەدا دەردەکـەوێت لـە کەنیسـەی سـانتۆ لـە بادۆڤایـە. هـەمان ئـەو شـارەی پەیکـەری پاڵـەوان جاتامیلانـای تیـا بەرجەسـتە کـردوە وەك هێمایەك بۆ گەورەیی و سەرکەشی مرۆڤ و سەرکەوتنی ئاوەز بەسەر هێزی دواکەوتویدا. ئـەم هەستکردنە بە باڵایی لە پەیکەرەکانی "پیرۆزمـەند جـۆرج" و (مـارجرجیس)دا دەرئەکـەوێت، بەڵام لە پشت ئەم هەموو سەرکەشی و بـاوەڕ بەخۆبوونـەوە، هـەموو ئـەو ووزە و توانـا لـە بـن نەهاتووەوە کە ئاسەوارەکان دەکاتە خاوەن سیمایەکی زیندوی بێڕاددە، هەسـت بـە جۆرێـك لـە دڵەڕاوکێ و ناجێگیریەکی قووڵ دەکەین شاراوە. هەندێ جاریش ئەم دڵەڕاوکێیە دێتە سـەرەوە

و خۆیمان پیشان دەدات وەك لە پەیکەری (لوزوکونی)دا لە سیمای دێوەزمەیەکی زلی ترسناك دا دەردەکەوێت.

دۆناتێللۆ گەلێ جار پابەندی ئەو جوانی‌یە ئایدیالی‌یە نەبووە کە لە سەردەمەکەیدا باوبووە جا بەهەر هەنجەتێك بوبێت، لە نمونەی ئەو کارانەی پەیکەری واقعی (مریەمی مەجدەلی)یە کە وەك نمونەیەکی پەیکەری ڕیالیزمی لەم ڕۆژەوە سەیر دەکرێت. هەرچۆن شارەزایی ئەو لە زانستی بەربینە داوای کردووە لە پەیکەرە ریلیفی‌یەکانیدا پشتێنەی کارەکانی بە دیمەنی بیناسازی بڕازێنێتەوە، بەمەش جیهانێکی سێ ڕەهەندی دەخوڵقاند نزیك بە دنیای نیگارکێشان.

ئەم داگیرکردنە هونەرییەی دۆناتێللۆ کاریگەرییەکی قوڵی نەك هەر لەسەر پەیکەرسازەکانی دوای خۆی بەجێهێشت لە فلۆرەنسادا بەڵکو کاریگەرییەك بوو سەراپا لەسەر هونەری ئیتالی.

### ڤیرۆکیو (Verro Chio) ١٤٣٥-١٤٨٨

ڤیرۆکیۆ نیگارکێش و پەیکەرساز بووە و سەرباری ئەم دوو بەهرەیەشی لە هونەری کانزای برۆنزی‌یدا دەستی هەبووە. گرنگی ڤیرۆکیۆ سەرباری کارو بەرهەمەکانی لەوەدا لە لایەك قوتابی دۆناتێللۆ بووە و لە لایەکی تریش مامۆستای لیۆناردۆ داڤنشی بووە. هونەرمەندانێکی وەکو لۆرانزودی کریدی پێگەیاندووە.

زیاتر کارامەیی ئەم پەیکەرسازە لە کارکردنی‌دا لەسەر بەرد ڕەنگی داوەتەوە، جگە لە پەیکەری برۆنزی و قوڕی برژاو (کاشی). لە جوانترین کارەکانی پەیکەری برۆنزی کیوبیدە ماسی‌یەکی بە دەستەوەیە کە لە گۆڕەپانی کۆشکی سەرکردە دانراوە.

لە پەیکەری (داود لەسەر سەری جالوتی دوژمنی دەوەستێت) بە ڕوونی کاریگەری دۆناتێللۆی مامۆستای پێوە دیارە. لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانیشی کە لە برۆنزە پەیکەری پاڵەوان (بارتلیمۆ کولیونی Colleone)یە لە گۆڕەپانی شاری ڤینیسیا، ئازایەتی و مەزنی تیا بەرجەستە کراوە.

## بیناسازی:

دوابەدوای هاتنی شێوازی غوتی لە بیناسازی‌دا ماوەیەکی باش تێپەڕی و هیچ گۆڕانکاری و نوێکردنەوەیەك لە هونەری بیناسازی ئەوروپی‌دا ڕووی نەدا. بیناسازی غوتی تاکە شێوازی باو بوو لە فەرەنساو فلاندەر و ئەڵمانیاو ئیسپانیاو پورتوگال تەنانەت لە هەرێمی لۆمبااردی ژووری ئیتالیاش، ئەم شێوازە لە ڕۆژەکانی دواییندا زیاتر ئاڵۆز بوو بە هەرسێ شێوازەکەیەوە

کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، وای لێهات لە ناوەوە هەر لە دارستانێکی چڕی تەنگەبەر و باریک دەچوو، خاوەن چەندان ئێسکی درێژبۆوە بەرەو ئاسمان کە ئەو لقانەی لێی دەبۆوە هێند زۆر و بە یەکدا چوو بوون، چاو وون دەبوو لە چڕیاندا، لە دەریشەوە لە تۆڕێکی ناسکی پێك هاتوو لە سێگۆشەی هەڵتۆقیو دەچوو. بازنە و نەخشی سەرەو هەڵگێڕراوی هەڵچوو وەك هەڵچونێکی گڕ یاخود کلپەکردنێکی ئاگر، هەر لە سروش بەخشینی ئەم کلپەو گڕەوە بوو نازناوی (فلامبویان)یان بڕی بەسەریدا.

دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆژئاوایی بۆ یەکەمین جار، هونەری بیناسازی مۆرکێکی نائاینی وەرگرت ئەویش لە بنیات نان و دروست کردنی کۆشکە فلۆرەنسی‌یەکان کە پێك هاتبوو لە بینایەکی سەنتەری دەوری گۆڕەپانێکی خڕی داوە بە دالآنی کۆڵکەو پایەدار، بەلآم ڕووکەشی بیناکە هەر لەسەر تەرزی سیفاتی هونەری سەدەکانی ناوەڕاست بوو، بە پێچەوانەی ناوەوەی کە بە لێکچووی لەگەڵ هونەری کلاسیکی‌دا مایەوە. هەندێك لەم ڕازاندنەوەیە فۆرمێکی سروشتی پەتییان لەخۆ نەگرتبوو، بەڵکو گۆڕانکاری و دەسکاری‌یەکی زۆری فۆرم و هێماکان کراوە. کە لە گۆڕانکاری ڕۆمانی‌یەوە وەرگیراوە وەك ناولێنانیش لە خودی Grottes ئەو پرۆسێسە پێی دەوترێت گرۆتسك Grotesque. لە هونەردا ئەم زاراوەیە وا ناسراوە بە مانای هەندێ ڕازاندنەوە دێت کە ئەفرێندرەکەی هەڵدەستێ بە جوڵاندن و دەسکاری کردنی فۆرمەکان و شێواندنیان.

شێوازی تەلارسازی نوێ بەرامبەر بە تەرزی غوتی ڕاوەستا پشت بە دەرکەوتنی شێوازێکی زانستی بنیات نراو لەسەر جوانیەکی جەستەیی کە ئەفلاتون دایناوە. ئەوانەش کە خاوەن بیروڕای جوانکاری بوون لە تەلارسازی‌دا دەستیان کردە پێشکەش کردنی تیۆرە نوێیەکانیان، سانزۆفینۆ و باللادیۆ و فینۆلا و ئەلبێرتی نووسینەکانی خۆیان نووسی پشت بە کاریگەریی بیروڕاکانی تەلارسازی ڕۆمانی فیترۆفیۆس. لە گرنگترین خەسڵەتەکانی تەلارسازی نوێ، ئەو دیوارانە بوون کە لە زۆربەی جاردا بە خشت دروست دەکرا و هەندێ مەرمەڕی ڕازاوەی بەبەرد بۆ زیاد دەکرا. ئەو بنمیچانەش کە بە (قرمید)[٤٢] داپۆشرابوون، هەرچۆن تەرزە کۆنەکان هەندێ جار بۆ نەخشاندن و ڕازاندنەوەی ڕووی بیناکان بەکاردەهات، هەرچی پەنجەرەکانیشە کەوانەیی بوون بە کۆڵەکەی بچووك. پاشان ڕووی بیناکان بە هەندێ کۆڕنیش‌و تەناف دەڕازێنرایەوە.

لە بینا ئاینی‌یەکاندا ڕووی بیناکان یاخود ناوچەوانی بیناکە (فرونتون) هەر گرنگی تایبەتی پێدەدرا تا جوڵە و زیندویەتی ببەخشێتە بیناکە بە گشت. بە شێوەیەکی گشتی بینا

مەدەنی و ئاینی‌یەکان چیتر بە تێکەڵەیەك لە نیگاری دیواربەندی چوارچێوە بۆ کراو بە مەڕمەڕ و بەرد دادەپۆشرا.

## فیلیبو برونیلسکی (FilippoBrunelleschi) ١٣٧٧-١٤٤٦

تەرزی قۆناغی سەرەتایی ڕێنیسانس لە تەلارسازیدا پەیوەستە بە ئەندازیار و پەیکەرسازو زەڕەنگەر (برۆنیلسکی)یەوە، ئەم پیاوە بەهرەمەندە توانی لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمەوە لە هەموو ئەو ئالۆزکاریانە دەرچێت کە سیمای ڕاستەوخۆی تەلارسازی غوتی بوو، ئەویش بە سروش وەرگرتن لە ئاسەواری ڕۆمانی بۆ ئەفراندنی شێوازێکی نوێ لە بیناسازیدا کە بە هاوسەنگی و پتەوی و جێگیریی و گونجاندن و ڕوونی ئەندازەیی و تەختی و هاویەکی ڕووەکانی و کراوەیی و فراوانی بۆشایی ناوەوەی و جێگیریی بوونیاتی بەناوبانگ بوو، تیایدا هێڵە ئاسۆیی‌یەکان بە هێندایی هێڵە ستونی‌یەکانی نێو تەلارسازی غوتی‌یە. بەرەنجامی ئەم ئەفراندنە نوێیانە ڤازاری دەرباری وتویەتی (زەمان، هەر لە سەردەمی یۆنان و ڕۆماوە هەتا ئەمڕۆمان ئەندازیارێکی مەزنی وەهای بەخۆوە نەدیوە).

بلیمەتی برونیلسکی لە ئەفراندنی شێوازە نوێیەکەیدا پەیوەستە بەو گومەزە گەورەیەی کە ساڵی ١٤٢٠ دروستی کرد و بنیاتی نا لەسەر بنەواچەیەکی هەشت لا لە کاتیدراڵی فلۆرەنسا (سانتا ریادیل فیوری) ئەوەدەمە لەمێژ بوو گومەزە گەورە و زەبەلاحەکان دیارنەمابوون لە سەردەمە ناینی‌یەکانەوە. خودی ئەم کاتیدراڵە لە دیزاینی دی کامبیو بوو تاوەرەکەشی جیۆتۆ دیزاینی کێشابوو. تێکەڵێك لە شێوازی ڕۆمانی کلاسی و شێوازی ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتی لەخۆگرتووە.

لە ڕاستیدا برونیلسکی پەرجوی سەردەمەکەی خۆی بووە، ژیانی هونەری خۆی وەك زەڕەنگەرێك دەست پێکرد، پاشان دەستی دایە کارکردن لە پەیکەرسازیدا، هێندەی نەبرد وازی لەم هونەرەش هێنا ئەوکاتەی جیبرتی پێشبڕکێی دەروازەکانی شۆردنگەی فلۆرەنسای بردەوە. چوو بۆ ڕۆما بۆ توێژینەوەی تەلارسازی ڕۆمانی کۆن. دوای ئەوەی توێژینەوەی زۆر وردی دەربارەی دیزاینەکانی کرد، لەسەر کاغەز نیگاری کێشان دوای توێژینەوەی بۆ یاسا زانستی‌یەکانی بەربینە.

دوای ئەوەی گەڕایەوە فلۆرەنسا دەستی دایە نەخشاندنی دیزاینی پرۆژەی گومەزی کاتیدراڵەکەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە پرۆژەکەیدا.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەم کاتیدراڵە کە قۆناغی یەکەمی سەردەمی ڕێنیسانس دەنوێنێت چەندان تەرزی جیاواز دەگرێتەخۆی: بینای کڵێسەکە کە (دی کامبیو) کردویەتی سیمای

هونەری ڕۆمانسکی تیا بەدەردەکەوێت، تاوەری کڵێسەکە کە کاری جیۆتۆیە خواستی غوتی تیا بەرجەستەیە و گومەزە زەبەلاحەکەشی کە برۆنیلسکی بوونیاتی ناوە ئاماژەیەکە بە سەردەمی ڕێنیسانس.

ئەو ساتەوەختەی برۆنیلسکی دوا کارەکانی لە دیزاینی گومەزەکەدا دەکرد، دەرفەتێکی بۆ لوا بۆ کێشانی دیزاینی کارێکی کامڵ ئەوەش ئەو کارە بوو کە خێزانی میدتشی پێیان بەخشی بۆ دوبارە بوونیات نانەوەی کلێسای لورینزۆی ڕۆمانسکی لە ساڵی ١٤٢١دا.

لە ناوەوەی ئەم کلێسایەدا کۆڵەکەی کۆرنثی کلاسیکی بەکارهێناوە، هەرچۆن گومەزێك لەسەر خاڵی لێکدانی دوباڵی خاچەکەیەتی کە بلیمەتی و توانای برۆنیلسکی پیشان دەدات لە کۆکردنەوەی هێز و جوانی و ناسکی لە یەکەیەکدا. لەو پەرستگایەشدا کە بۆ خێزانی (باتس)ی دروست کرد لە کلێسەی (سانتا گروش) Sant Groce لە میانی ساڵانی ١٤٣٠-١٤٣٣، ئەم پەرستگەیە نمونەی گرنگترین سیماکانی تەلارسازی ڕێنیسانسە.

بلیمەتی ئەم هونەرمەندە تەنها بواری بیناسازی ئاینی نەگرتەوە، بەڵکو لێهاتویی ئەو بەدی دەکەین لە بیناسازیە دنیایەکانیشیدا کە داوای لێکراوە دیزاینی بۆ بکێشێ. لە بەناوبانگترینیان کۆشکی پیاوی سەرمایەدار "بیتی"یە ساڵی ١٤٤٠ کە هەردوو ئەندازیار فانشیلیو ئامانتی جێبەجێیان کردووە و ئەمڕۆ بۆتە مۆزەخانە. تەلارساز میکیلۆزۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەم دیزاینەوە لە دروست کردنی دیزاینی کۆشکی میدتشی ڕیکاردی کە ساڵی ١٤٤٤ دروست کراوە.

## نیگارکێشان:

ساتێ لە جوڵەی نیگارکێشان دەدوێین، گەر بە خێراییش بووە ناکرێت باسی هەردوو مامۆستای لێهاتوی ئەم بوارە بەبیر خۆماندا نەهێنینەوە کە بوونە بنەمایەکی پتەو بۆ بنیات نان و خستنە سەری هونەری نیگارکێشان لە قۆناغەکانی پاش خۆیان ئەوانیش کە چیمابۆی و جیۆتۆی مەزنن.

پێش ئەوەی ڤازاری لە پەرتوکی (ژیانی بەناوبانگترین نیگارکێشەکان)دا ناوی چیمابۆی بێنێت، گومان چووبوە دڵی زۆرێك لە خەڵکەوە دەرباری بوونی ئەم هونەرمەندە. ئەو منداڵی ئەم هونەرمەندە وەك سواڵکەرێکی کۆڵانەکان باس دەکات و دواتریش کە گەورە دەبێت و سەرنجی کاری هونەرمەندەکان دەدات لە کلێساکاندا هەمیشە دەیپرسی (هونەر کارێکی مەزنە بەڵام بۆچی ئەم خەمۆکییە لەسەر سیمای مەسیح و دایکی، بۆچی دوورکەوتنەوە لە ژیانی ڕۆژانە؟). لە دوای فێربوونی سەرەتایی لە هونەردا و کاری مۆزایکی. چیمابۆی فێری شێوازێکی

نوێ بوو لە نیگارکێشان دا کە تیایدا گرنگی بە دەرخستنی سێبەرو ڕووناکی و بەربینــەدا. ئـەو دەمەش کە تابلۆی (مریــەم و کورەکـەی) تـەواوکرد، حـاکمی هـەرێمی ئـانجۆ هـاتبووە سـەردانی فلۆڕەنسا و چاوی بەم کارەکەوت گەلێك سەرسام بوو پیێ وەك پێکهاتەو ڕەنگ لەچاو کارەکانی پێشتردا، دانیشتوان ئاهەنگیان گێڕا لە خۆشی ئەم تابلۆیەو ئەم سەرکەوتنە، زیاترین شتێك کە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاو دڵیان پیێ خۆش بوو لێکچونی دەموچاوی مریەم و کورەکەی بوو بـە دەموچاوی ژن و منالەکانی خۆیان و بە شێوەیەکی سروشتی بەرجەســتە کرابـوون. هەرچـەندە گەر لە ئەمڕۆوە بڕووانینە ئەم کارە هەڵەی زۆری تیا بەدی دەکـەین بـەڵام دەبێـت وێنـای ئـەو ڕۆژە بکەین کە ئەو کـارەی تیـا دروسـت کـراوە کـە بـە کرانـەوە و سـەرکەوتنێکی بـێ هاوتـا لـە هونـەردا دادەنرێـت. سـاتێ چیمـابۆی مـرد، لەسـەر گۆڕەکـەی وەهـا نووســرابوو: چیمـابۆی لـە ژیانیدا گەورەی هونەرمەندان بوو لە مردنیشیدا جـیێ خـۆی لـە نـاو ئەسـتێرەکاندا دەگرێـت. ئەودەمەش چیمابۆی جیۆتۆی مەزنی ناسی جیۆتۆ شوانێك بـوو یـاری بـە نیگارکێشـان دەکـرد، بانگی کردە ئەتێلەکەی خۆیەوە و لە نێوان هونەر و ئەرسـتۆکراتیەتدا پـیربوو، شـاعیری مـەزن دانتی ناسی و بوون بە دوو هاوڕێ، لە نوێژگەی بودستای فلۆڕەنسی نیگارێکی دانتـی هەیـە کـە جیۆتۆ دروستی کردووە لەگەڵ چەند کارێکی تردا.

مامۆستای سەرەکی و ڕاستەقینەی جیۆتۆ سروشت بـوو. دەگێڕنـەوە ئەوکاتـەی جیۆتـۆ لای چیمـابۆی مامۆسـتای قوتـابی بـووە لـە ئامـادە نـەبوونی مامۆسـتاکەیدا جیۆتـۆ نیگـاری هـەندێ مێشی لەسەر تابلۆکـانی چیمـابۆی دروسـت کـردووە، سـاتێ مامۆسـتاکەی هاتۆتـەوە لێی بووەتـە ڕاسـتی، وەختـێ دواتـر پـیێ زانیـــوە مێشـی ڕاسـتەقینە نـین زۆر بـە جیۆتـۆیدا هـەڵداوە و ستایشی کردووە.

ئەوکاتەش کە لە دیواربـەندی کڵێسـەی سـان فرنشیسـکۆدا کاریـان دەکـرد پێکـەوە بلیمـەتی قوتابی لە ئاستی مامۆسـتاکەی ڕەتـی کـرد. وەك باسـی لێوە دەکرێـت پاپـا بوونیفیـس هەشـتەم وەختـێ دەیـەوێت کڵێسـەی سـان بـیر (پیرۆزمـەند بطـرس) بڕازێنێتـەوە، جـۆرە پێشـبڕکێیەکی سازدا بـەو مەبەسـتە لـە نێوان هونەرمـەندەکاندا، بـەڵام جیۆتـۆ هیچی نـەکرد تـەنیا دروست کردنــی بازنەیــەك نــەبێت بــە قەڵەمەکــەی زۆر بــە خــێرایی و لــە هــەمان کـــاتدا زۆر بـــە وردەکارییـەوە، لیژنـەی هەڵسـەنگاندنەکە ئەمـەیان بـە سـوکایەتی پـێکردنێك زانـی لـە لایــەن جیۆتۆوە بەوان، بەڵام ساتێ ئەم کارە بەرزکرایەوە بۆ پێش چاوی پاپـا. ئـەم وردەکاریو توانا خێرایە سەرسامی کرد و داوای لە جیۆتۆ کرد تا کڵێساکەی بۆ بڕازێنێتەوە.

ئەم هونەرمەندە لە بادۆڤا بیست ساڵ مایەوە و دانتی لەوێ ناسی و پەیوەستییان توندوتۆڵ تر بوو، زیاتر بەکاری دیواربەندی فریسکۆ بەناوبانگ بووە بەڵام بە داخەوە زۆربەی کارەکانی لە نەزانییەوە داپۆشراون.

شارەزایی و توانای ئەو وای نەکردووە زۆر کەموکورتی لە لایەنی بەربینەو ڕێژەوە نەبێت بەڵام کاریگەرییەکی باشی کردۆتە سەر هونەرمەندانی دوای خۆی، پاڵی پێوە ناون. بۆ توێژینەوە و گەڕان بە شوێن بنەما و ڕێساکانی زانستی بەربینەو توێکاریدا. ساڵی ١٣٣٤ لە دوای ڕێزلێنانی گەورەی میرو خانەدانەکان کرایە گەورەی ئەندازیارانی بیناسازی دەوڵەت، ئەرکی بوونیات نانی تاوەری زەنگۆڵەکانی کاتیدراڵی فلۆرەنسی پێ سپێردرا، خەڵکی ئاهەنگێکی جوانیان بۆ گێڕاو ئەندریە پیزانۆ یاریدەدەری بوو.

لە ساڵی ١٣٣٧ دوای نەخۆشییەکی کورت خایەن مەرگ ئامادە بوو لەسەری و بە ئاهەنگێکی پرشکۆ نێژرا. دوای سەد ساڵ لەسەر گۆڕەکەی پەیکەرێکی نیوەییان بۆ کرد کە لە سەری نووسرابوو (بوەستە و هەڵوێستەیەك بکە لە بەردەم گۆڕەکەمدا. من ئەو کەسە بوم گیانم کردەوە بە بەری هونەردا سەرلەنوێ و دەستی ڕاستم توانای هەموو شتێکی هەبوو، هونەری بە سروشت ئاوێتەکرد، کەسێك نییە بە بارتەقای من لە بە پێزی و زۆری بەرهەمیدا، تاوەری زەنگۆڵەکان سەراسیمەی نەکردویت؟، ئەوە من بووم بەرەو ئاسمان هەڵمکێشا، من جیۆتۆم، ناوەکەم بەسە تا کارو بەرهەمەکانم لە یادەوەریتا بن، ئەو کارو بەرهەمانەی بە نەمری دەمێننەوە هەتا هەتایە).

لە دوای دوا ماڵئاوایی جیۆتۆی هونەرمەند و بلیمەت ماوەیەکی زۆر تێپەڕی، نیگارکێشی ئەوتۆ دەرنەکەوت بەشداری بکەن لە بردنە پێشەوەی هونەری نیگارکێشاندا، سەرەڕای ئەوەی نیگارکێشان لە قۆناغی زوی سەردەمی ڕێنیساندا سەرەتاکانی لە ساڵی ١٤٢٠وە سەرچاوە دەگرێت واتە دوای دەرکەوتنی هەردوو بلیمەت دۆناتێللۆی پەیکەرساز و برۆنیلسکی ئەندازیار، بەڵام ئەو دەسکەوتە پێشکەوتوانەی لە بواری نیگارکێشاندا بەدەرکەوت خاوەن پەرەسەندنێکی خێراو گورجوگۆڵی وابوو شتێك بوو نائاسایی بە بەراورد لەگەڵ ئەو پەرەسەندنانەدا کە لە هەردوو بواری هونەری پەیکەرسازی و تەلارسازیدا ڕوویدا. هەڵبەتە سەروەری ئەم پەرەسەندنە لە ڕێنیسانسدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو داهێنانانەی جیۆتۆی بلیمەتی فلۆرەنسا پێشکەشی کردن لە سەدەی چواردەدا، ئەو یەکەمین کەسێ بوو دەرگای لەسەر شێوازی کارکردنی نوێ والاکرد، کە تیایدا گرنگی درا بە تابلۆ وەك ڕوو وەك قوڵی، هەرچۆن ڕیخۆشکەری یەکەمە بۆ شێوازی واقعیەت کە لە نیگارکێشانی نوێدا سەری هەڵدا.

گەر جیۆتۆمان بە پێشڕەوی سەرەکی هونەری ڕێنیسانس دانا، ئەوا ڕۆڵی مەزن بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی نیگارکێشانی ڕێنیسانس دەگەڕێتەوە بۆ نیگارکێشێکی لێهاتوو لە فلۆڕەنسا بە ناوی ماساتشۆ.

## ماساتشۆ Massacio (١٤٠١-١٤٢٨)

ئەم هونەرمەندە سەرباری کورتی تەمەنی کە بیست و حەوت ساڵ ژیاوە بەڵام بە داهێنەرێکی بە توانای شێوازی نوێ دەزانرێت لە هونەری نیگارکێشاندا، هەرچەندە سودمەند بووە لە تازەکارییەکانی جیۆتۆ و تیۆرییەکانی برۆنیلسکی و ڕۆشنبیری هیومانیستەکان، بەڵام توانی لەوانە گشت شێوازێکی نوێ بئەفرێنێ. کە تیایدا جەستەی مرۆڤ جێی شیاوی خۆی وەرگرێ لە تابلۆدا و زیندویەتی بنوێنێ. چون ئەو پشتی بە پەیبردنی تایبەتی خۆی دەبەست بۆ مێژوو هەرچۆن تێگەیشتنی تایبەتی هەبوو بۆ هێما پیرۆزەکان و گوناهکردن و بەرپرسیارێتی مرۆڤ و ڕزگاربوون. ئەمانە گشت لای ئەو بەشێك نەبوون لە مێژوو و شتێك نەبوون پابەند بە جیهانی ئەفسانەیی و باڵایی، بەڵکو چنراوی بوون و گەوهەری کەسایەتی مرۆڤن. هەر لەبەر ئەم بیرکردنەوەیەش بوو داوای چونە دەرەوەی نیگارکێشانی دەکرد لە ڕێسا ئاینییەکان.

بۆ ئەم مەبەستەشی سودێکی باشی بینی لە ئەزمونەکانی پێش خۆی لە پەیکەرسازی و تەلارسازیدا، ئەو هەموو کاتێك وای بیردەکردەوە کە نیگارکێشان بواری نمونەییە بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجانە ی دۆناتێللۆ لە پەیکەرسازیدا هەوڵی بۆ دەدا. لە کارەکانیدا ڕووناکییەکی بەهێزی دەدا لە فیگەرەکانی تا هەرچی زیاتر وەك پەیکەرێ دەردەکەون، سیمای پیرۆزی لە ڕووخساری مەسیح و ئادەم و حەوای سەندۆتەوە، وەك مرۆڤێکی ئاسایی مامەڵەی لەتەك سیمایاندا کردووە. یەکەمین کەس بووە لە ئیتالیادا. جەستەی حەوای بە ڕووتی دروست کردووە. لە دیارترین کارەکانی کۆمەڵێ دیواربەندی نیگارکێشانە لە نوێژگەی برنکاتش لە کڵێسەی سانتا ماریادیل کارمن لە فلۆڕەنسا ساڵی ١٤٢٧. بابەتەکانی لە (ئینجیل)ەوە وەرگرتووە کە دەرباری مەسیح و بەخشینی سەرانەیە. لە دیارترینیان تابلۆی ئادەم حەوایە و دەرکردنیان لە بەهەشت. کە تیایدا بە گەورەیی هەردوو فیگەرەکەی بەرجەستە کردووە و جوڵەیەکی جوانی پێبەخشیون لە دەست و قاچیاندا. پشتێنەی تابلۆکانی بە دیمەنی سروشتی پڕکردۆتەوە.

ئاسەواری مازاتشیۆ لەو کۆمەڵە تابلۆ فریسکۆیانە تێپەڕ ناکات کە کڵێسەی برانکاشی فلۆڕەنسی ڕازاندۆتەوە، بەڵام ئەم تابلۆیانە بوونە قوتابخانەیەك و هەموو هونەرمەندە

ئیتالییەکان تیا فێر بوون لە دوای خۆی تەنانەت داڤنشی و رافائیل. مەرگی زووی ئەم هونەرمەندە بۆشاییەکی بەجێهێشت لە نێوەندەکەدا تا ماوەیەك، دوای ئەو ماوەیە هونەرمەندانێك پەیدابوون کە نیگاریان بۆ بابەتە ئایینییەکان بە شێوازێکی پیرۆز دروست دەکرد.

## فەشە ئەنجیلیکۆ "Fra Angelico" ١٣٨٧-١٤٥٥

ناوی بنەڕەتی فەشە جیوڤانی دافیتسولی "C. Daflesole"یە بە ئەنجیلیکۆ ناوبانگی هەیە، ژیانی بە فەشەیەتی دەست پێکردووە و وەختێ فەشەکانی هاوڕێی هەستیان بە توانا و بەهرەی کردووە لە دێری کرتونا ساڵی ١٤٣٠ ڕازاندنەوەی دیواری دێرەکەیان پێ سپاردووە بە تابلۆهای ئاینی و لە جوانترینیان تابلۆیەکە بۆ مریەم.

ئەو دەمەی پاپا دێری پیرۆزمەند مەرقەسی لە فلۆرەنسا بەخشییە پەیڕەو کەرانی پیرۆزمەند دۆمونیك، نەخشاندنی دیوارەکانی دوای چاکردنەوە بەخشرا بە ئەنجیلیکۆ، ژمارەیەکی زۆر بابەتی ئاینی مەسیحی تیا بەرجەستە کردووە لە جوانترین و دیارترینیان تابلۆی هەڵاتن لە میسر و مزگێنییە. تابلۆکان و شێوازی کارکردنی سیمایەکی ئاینی ڕۆحانی پێوە دیارە هەست بە ئامادەبوونەوەی هونەری غوتی دەکرێت تیایدا، کەمتر پابەندی خۆی بۆ زانستەکانی بەرببینەو توێکاری تیا بەرجەستە کردووە، کەشی گشتی کارەکانی زیاتر ڕۆحانییە وەك واقعی. لە تێکەڵ کردنی ڕەنگەکاندا توانایەکی گەورەی هەبووە تا چەندان پلەی ڕەنگی دەست کەوێت لە تەنها ڕەنگێك.

هەرچەندە سەرسام بووە بە کارەکانی مازاتشۆ بەڵام لە کەشی گشتی کارەکانیدا هەرگیز ئەو خۆشەویستییەی مازاتشۆی تیا بەدی ناکرێت بۆ بە واقعی کردنەوەی بابەتەکانی. بەڵکو زیاتر بەلای هونەرێکی شاعیری و ڕۆحانیدا شکاندویەتەوە چون خۆی پابەندی واقعێك بووە کە دەگەڕێتەوە بۆ دوادوایەکانی هونەری غوتی و "سروشتگەرای ڕۆحانی" زیاتر لەوەی پابەندی واقعی ڕێنیسانس بووبێت.

هونەر لای ئەنجیلیکۆ جۆرێك لە بڵاوکردنەوەی ئاینی بووە. هەرچەندە ئەو دەیزانی گەر بچێتە فلۆرەنسا ئەوا بە هۆی توانایی هونەرییەوە ژیانێکی پڕ ناوبانگ و سەروەریی بەدەست دێنێت، بەڵام سەرباری ئەو خاڵەش هەر لە کۆرتونا مایەوە و ژیانێکی سك هەڵگوشینی دەبردە سەر و هەمیشە دەیوت (ئەوەی دەیەوێت وەك مەسیح بێت دەبێت وەك ژیانی ئەو بژی). هەر لەبەر ئەمەش بوو لە نێوان خەڵکیدا پێگەیەکی ئاینی مەزنی هەبوو، تەنانەت هەمان نازناوی (تۆما ئەکوینی)یان داوەتێ کە نازناوی ئەنجیلیکۆیە. لە دوا ساڵانی ژیانیدا پاپا ئۆجینی چوارەم

بانگهێشتی دەکات بۆ ڕۆما لەوێ چەند تابلۆیەك دەکێشێت. لە کێشانی نیگاری درەخت و گوڵ و سروشتدا کارامە بووە چون زیاتر لە پەنجا ساڵ ژیاوە لە نێوان سروشتی دێ کۆرتونادا. بە ئاراستەی بەرجەستەکردن و نیگارکێشانی دروون کاری کردووە، هەتا پێی وتراوە تابلۆکانی بەهێندەی نوێژی بێ دەنگی منال کاریگەریی هەیە. لە گرنگترین کارە دیواربەندەکانی لە دێری سان مارکۆیە لە فلۆرنسا کە دەربارەی داگرتن لە خاچ و خاتوو مریەمە.

## فیلیپۆلیپی (FilippoLippi) ١٤٠٦-١٤٦٩

فیلیپۆلیپی کە بە فیلیپۆلیپی برا بەناوبانگیشە هاوسەردەمی ئەنجیلیکۆ بووە و هەروەك ئەو قەشە بووە بەڵام بە قەشە بوونی ئەم نەگەیشتۆتە ئەوەی وەك ئەنجیلیکۆ ببێتە لاهوتی، ئەم سەرکەوتوانە تیۆریی زەینی تیکەڵ بە ئەزمونی هەستی کردووە. زیاتر ناو و پێگەی هونەریی لە لایەنی بەرجەستەکردنی لەشی مرۆڤەوە بووە بۆ ئەم مەبەستەش ویستویەتی لێکدانێك لە نێوان شێوازی نیگارکێشانی ماساتشۆو شێوازی پەیکەرسازی دۆناتێللۆدا بکات. لەبەر ئەمە ئەو مامەڵەیەی ئەم لەگەڵ جوانی لەشی ئافرەتدا کردویەتی پێشتر لای هیچ هونەرمەندێك نەبووە. ئەوکاتەش کە داوایان لێکرد وێنەی مریەم بکێشێت، پەنای بۆ ئەندێشەی خۆی نەبرد، بەڵکو سروشی ڕووخساری مریەمی لە دەموچاوی کچە ڕاهیبەیەکی جوانی دێرەکەیانەوە وەرگرت.

لە گرنگی دانیدا بە پشتینەی تابلۆکانی کە زیاتر بە دیمەنی سروشتی و تەلاری جوان چارەسەر دەکرد وا پێ دەچێت لەژێر کاریگەریی هونەری هەرێمی فلاندەردا بوبێت، چونکە سەردانی ئەو هەرێمەی کردووە ساڵی ١٤٣٠. لە دیارترین کارەکانی تابلۆ فریسکۆکانی سەر دیواری پیرۆزمەند (ستیڤن)ە لە فلۆرەنسا. یەکەم تابلۆ لەسەر جەنگ لە مێژووی ڕێنیسانسدا لە دەستکردی ئەم هونەرمەندەیە، دوای خۆی کوڕەکەی (فیلیبینۆلیبی) لەسەر دەستی باوکی و ئۆتشێلۆ کاری کردووە و بەرهەمی هەبووە[٤٤].

## پاولۆ ئۆتشێلۆ (Paolo Uccello) ١٣٩٧-١٤٧٥

هاوسەردەمی (ماساتشۆ) بووە و هیچ هونەرمەندێك هێندەی ئەم ئارەزومەندی زانستی بەربینە نەبووە و گرنگی پێ نەداوە لە کارەکانیدا، چەندان هەفتەی بەسەربردووە لە ژوورەکەیدا بێ ئەوەی بێتە دەرەوە و چاوی بە کەس بکەوێت تەنانەت خێزانەکەشی، لە دوای گەڕاندا بە شوێن ڕازەکانی ئەم زانستەدا. زانستی بەربینە لای ئەو کلیلی ئاوەزە بۆ پەی بردن بە وێنەی گەردوون، گرنگی بە بەها ئاینییەکان و مرۆڤی و مێژووییەکان نەداوە. بەڵکو هونەرەکەی تەرخانی جۆرە جێبەجێکردنێکی ئەبستراکتی کردووە بۆ تیۆرییە زەینییەکانی تا دەستبەرداری ڕەهەندی

سێهەم بووە. سێ تابلۆ مێژوویەکەی کە بۆ کۆشکی میدتشی دروست کردووە لە میانی ساڵانی (١٤٥٤-١٤٥٧)دا کە "جەنگی پیرۆزمەند ڕۆمانۆ" نمایش دەکات ئێستا بە سێ پارچە دابەش بووە بەسەر مۆزەی لۆڤەر و ئاوفتزی فلۆرەنسی و مۆزەی ئەهلی لە لەندەن. بە هیچ سۆزێکی مرۆڤی پابەندی بۆ واقع نییە، هەرچۆن پەیوەست نییە بە هیچ ماددەیەکی مێژوویەوە، بەڵکو نمایشی جیهانێکی ئەندێشەیی دەکات لە داهێنانی زەین، سەرباری ئەو توخمانەی سروشتین ئەوەی ئەم بەرهەمە دەخاتە ڕیزی هونەرەوە، جوانی ئەندازەیی و دیزاینیی و، کارایی لە ڕەنگ بەکارهێنان دا تا ئاستی پرشنگ دانەوەیەك بە تیشکی ناوەکی.

## پیرۆ دیلا فرانشسکا (Piero della Francesca) ١٤١٦-١٤٩٢

دیلافرانشسکا وەك لە سەرەتای ڕێنیسانسی ئیتالیدا ئاماژەمان پێدا لە تیۆریستەکانی زانستی بەربینە بووە و بە گەورەترین فەیلەسوفی نێو هونەرمەندانی سەدەی پانزە هەژمار دەکرێت. سەرقاڵی هاورێکی کردن و هاوسەنگکردنی نێوان بەها مرۆڤایەتییەکانی نێو هونەری مازاتشیۆ و هزری ئەلبێرتی و نێوان بەها ڕۆحانییە گوزارشت لێکراوەکانی فرا ئەنجیلیکۆ بووە. ئەمەش نە بە گۆڕینی مرۆڤگەرایی بۆ ڕۆحانی، نە بە ڕوحانیەت بۆ مرۆڤگەرایی، بەڵکو بە پشکنین و هەڵوەدا بوون بە دوای ڕاستی" باڵادا، کە هەردوکیانن پێکەوە.

ئەم (ڕاستی)یە باڵایە ئاماژەی بە کامڵی ئەو قاڵبە پتەوانە پێ کردووە کە تابلۆکانی تیا داڕشتووە، کەسایەتییەکان هەر لە کۆڵەکەیەك دەچن کە لەبەرد داڕێژرابن، وەك بڵێی لە دەرەوەی سنووری زەمەن بژین و دەستی گۆڕانکارییە مێژوویی و ڕووداوەکانی نەگەیشتبێتێ. کەشێکی بێگەردو بێ دەنگییەکی نامۆ دەستی بەسەرا گرتوون، وەك ئەوەی لە جیهانێکی وشیاریی ڕەهادا بین. ڕەنگ و ڕووناکی لە یەك ماددەن.

بۆشایی چواردەور بەشێکە لە چنینی تابلۆکە، نە چوارچێوەیەو نە دیکۆری شانۆگەری. لە هونەری ئەم هونەرمەندەدا بۆ یەکەمین جار دوو تەوژمی فەلسەفی بە یەك گەیشتن کە لە زەینی هاوسەردەمانیدا لە بیرمەندەکان لە کێشمەکێشمدا بوون، تەوژمی ئەرستۆتالیسی کە بە زانینی هەمەکی ڕەهادا هەڵدەدات لە دوتوێی زانینی تایبەتی دەست لێدراوەوە و تەوژمی ئەفلاتونیزمی نوێ کە بە زانینی تایبەتدا هەڵدەدات لە دوتوێی زانینە هەمەکییەکانەوە. ئەو ئەزمونە هەستییەکان ڕەت ناکاتەوە چون لەهەر سوچێك لە سوچەکانی تابلۆکانییەوە ئەوەمان پیشان دەدات. بەڵام ئەم ئەزمونە هەستییە پوخت دەکاتەوە لە پێوەلکانە هەستییە جێگەیی و کاتیەکانی، تا بیگۆڕێتە سەر ڕێسایەکی ئەندازەیی گشتگیرو وشیاری پەیت، ئەو وشیارییەی کە پەی بە هەموو شتێك دەبات، گەر لە ڕووداوێك لە ڕووداوەکاندا هاوبەشی

نەکات، ئەمە ئەو بەها بالآیەیە کە لەلای ئەم جێ درامامرۆڤایەتییە گوزارشت لێکراوەکانی مازاتشیوی گرتۆتەوە و هەرچۆن جێ بەها لاهوتییە گوزارشت لێکراوەکانی فرائەنجیلیکۆی گرتەوە. دیلافرانشسکا لە ناسراوەکانی هونەرە لە نێوەندی ئیتالیادا و قوتابی مازاتشیۆ بووە، لە فلۆرەنسا و نێوەندی ئیتالیادا گەشتی کردووەو کاری کردووە. زۆرێك لە کارەکانی کە بە جێ هێشتون لە کاری دیواربەندن لە گرنگترینیان مریەم و مەیسح لەگەڵ فریشتەکاندا، هێڵەکانی بە وردبینیەوەو ڕەنگەکانی بە ڕوونی بەکارهێناوە لە شێوازی کارکردنیدا.

## ساندرۆ بۆتشللی (Sandro Botticelli)

ئەم هونەرمەندە بە زەرەنگەریی دەستی پێکردووە لە فلۆرەنسا، دواتر چووەتە ئەتێلەی قەشە (لیبی) کە کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر کارە سەرەتاییەکانی، هەرچۆن کەوتۆتە ژێر کاریگەری (پۆلایولۆ)وە، خۆی و ئوستادەکەی لیبی) لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیاری لۆرینۆز میدتشیدا کاریان کردووە، ئەوساتەش کە لیبی فلۆرەنسای بەجێهێشت بۆ تشللی بووە دیارترین کەسایەتی هونەریی ئەو سەردەمەو ئەتێلەیەکی تایبەتی بە خۆی کردەوە. بۆ تشللی بووە نیگارکێشی تایبەتی خێزانی میدتشی و کۆمەڵێك لەو ئەدیب و رۆشنبیرانەی کە لە دەوری لۆرینزۆ بوون. لۆرینزۆ ئەو دەمە سەرۆکی خێزانەکەی واتە بنەماڵەکەی و فەرمانڕەوای شاری فلۆرەنسا بوو، لەو تابلۆیانەی بۆ ئەم بنەماڵەیەی دروست کردووە کە لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانیەتی ساڵی ١٤٨٠ تابلۆی "لە دایك بوونی ڤینۆس"ە، کە سروشی بیرۆکەکەی لە ئەفسانەکانی یۆنانەوە وەرگرتووە. چون گەڕان و بەدواداچون لە هونەری کلاسیکیدا لە گرنگترین دیاردەکانی هونەری زووی ڕێنیسانسە. ئەمەش دیارە لەژێر کاریگەری هزری ئەفلاتونیزمی نوێدا بووە کە سەرەتاکانی قۆناغی هونەریی ئەم هونەرمەندە کەوتۆتە ژێر کاریگەرییەوە، لە دوای بەرجەستەکردنی تابلۆی (بەهار) بۆ بنەماڵەی میدتشی کە لە کەشێکی زۆر شاعیریدا ئەفراندویەتی چەند کەسایەتییەکی ئەفسانەکانی یۆنانی تیایە وەك کیوبید و پەرییەکانی جوانی کە ژمارەیان سێ پەرییە. جوڵەی کەسایەتییەکان وەك لە هەوادا بێت وایە و سەما بکەن. ناوناوبانگێکی گەورەی بە دەست هێنا و بووە مایەی ئەوەی پاپا بانگهێشتی بکات بۆ ڕۆما تا بابەتە ئایینییەکانی بۆ دروست بکات بۆ ڤاتیکان. بەڵام ساڵی ١٤٨٥ وەختێ گەڕایەوە فلۆرەنسا بەسەر شۆڕشی (سافۆنارولا)دا هاتەوە بەرامبەر بە بابەتە کلاسیکییە بێباوەڕەکان و بزاڤی هیومانیزم. بۆ تشیللی کەوتە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی ئەم قەشەیەوە و هەندێ لە تابلۆکانی و کتێبەکانی سوتان و کارەکانی دواتری بە دوورە لە

ئەفسانەکان و هێڵەکانی تیژو یەکلاکەرەوەن بەرجەستەی ئازار دەکەن وەك ئەوەی تەنها ڕێگەی ڕزگاربوون بێت.

نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کاریگەریی هەرچی زیاتر بوونی زەبردەستی بنەماڵەی میدتشی لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزەدا بووە مایەی تێك شکانی هیوای دیموکراتیو، کەم بوونەوەی باوەڕی مرۆڤ بە بەها مرۆڤایەتیەکان کە بیریار و هونەرمەندان لە نیوەی یەکەمی ئەو سەردەمەدا بانگهێشتیان بۆ دەکرد. ئازاردانی قەشە ساڤونارولاو سوتاندنی لەبەردەم خەڵکیدا ئاگاداری کردنەوەیان بوو بۆ کۆتایی ئازادیە مەدەنییەکان، بەڵکو ئاگاداری کردنەوەیەك بوو بۆ کۆتایی پێهاتنی فلۆڕەنسا. لە کۆتاییدا بۆتشیللی بە هونەرە ڕیتمییەکەی ڕیخۆشکەری پەیدابوونی هونەرمەندو بلیمەت داڤنشی بوو.

## بەرەبەیانی هونەری ڕێنیسانس لە ڤینیسیا و سەرووی ئیتالیا

لە چەند خاڵێکی پێشودا لە باسەکەماندا ئاماژەمان بەوە دا کە هەرگیز سەرووی ئیتالیا هاوشانی نێوەند و (فلۆڕەنسا) خوارووی ئیتالیا نەڕۆیشتووەتە پێشەوە. لە بواری هونەریدا. چون وەك ئاماژەمان پێداوە سەرووی ئیتالیا هاوکات لەگەڵ وڵاتانی سەرووی ئەوروپا لەژێر یەك جۆر کاریگەریدا بوون، ئەم کاریگەریەش کە لە تەرزی غوتی و بە تایبەت قوتابخانەی فەڕەنسی فیلمنکی و شێوازی کورتوازیدا خۆی دەدیەوە بە درێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی پانزەهەم.

گۆڕان بەرەو شێوازی نوێ سەرەتای نەگرت لەم ناوچەیەدا تا دوای گەشتی هەندێ لە هونەرمەندانی فلۆڕەنسە- لەوانەش دۆناتێللۆ و ئۆتشێلۆ و ئەندریا دیل کاستانیۆ و میلیبولیبی- بۆ هەندێ شاری هەرێمی ڤینیسیا. کاریگەریی ئەم گەشتانە هاوزەمانە لەگەڵ دەنگدانەوەی توێژینەوە مرۆڤایەتیەکان کە فەیلەسوفە ئەرستۆتالیسیەکان گرنگییان پێدەدا لە زانکۆی بادۆڤا، ئەمەش بووە مایەی دەرکەوتنی قوتابخانەیەکی هونەریی نوێ لەم شارەدا، بە پێشڕەوایەتی فرانشسکو سکوار تشیونی، لە دیارترین ناسراوەکانی ئەندریا مانتێنایە لە بواری نیگارکێشاندا.

### تەلارسازی:

لە دوای مردنی برۆنیلسکی لەساڵی ١٤٤٦دا هونەرمەند و ئەندازیار "ئەلبێرتی" پێشڕەوی هونەری تەلارسازیی لەخۆگرت.

## لیۆن باتیستا ئەلبێرتی (L. B. Alberti) (١٤٠٤-١٤٧٢)

ڕێسا نوێکانی ئەم ئەندازیارە لە نێوان کۆمەڵی لە ئەندازیارە لێهاتووەکاندا بڵاوبوو وەك سان جالو و ڕۆسیللینۆ. ئەم ئەندازیارە توێژینەوەی دەربارەی ئاسەوارەکانی ڕۆمای کۆن کردووە و چەندان توێژینەوەی زانستی دەربارەی هونەرمەندانی سەردەمی زووی ڕێنیسانس نووسیوە وەك برۆنیلسکی و دۆناتێللۆ. ئەستێرەی ئەو وەك ئەندازیارێك لە نیوەی سەدەی پانزەهەمەوە بەدەرکەوت، دیزاینی جیاجیای بۆ تەلاری هەرێمە جیاوازەکان دەکێشاو ئەندازیار ڕۆسیللینۆ زۆربانی جێبەجێ دەکرد. لە بەناوبانگترین کارەکانی لە فلۆڕەنسادا کۆشکی خێزانی ڕۆتشیلایە کە ڕۆسیللینۆ دواتر جێبەجێی کردووە، لە جوانترین نموونەی سەردەمی ڕێنیسانس لە ئیتالیادا هەژمار دەکرێت. ئەم کۆشکە لە سێ نهۆم پێك هاتووە، ئەلبێرتی ڕووی کۆشکەکەی دابەشکردوە بە دابەشکردنێکی ڕێککەوتو و گونجاو لە ڕێی کۆڵەکەی پەیوەست بە دیوارەکانەوە لە هەموو نهۆمەکاندا، ئەم کۆڵەکانە دەوری دەروازەی پەنجەرەکان دەدات، لە نێوەندی هەر پەنجەرەیەکیشدا کۆڵەکەیەکی بچوك دەیکات بە دوو بەشەوە، سەر پەنجەرەکانیش کەوانەیەکی چەماوە هەیە. لە توێژینەوەماندا بۆ ئەم دیزاینانە زۆر بەوە دەچێت کە (ئەلبێرتی) بیرۆکەی ئەم ڕووەی لە پەرستگەی (کولوسیدم)ەوە وەرگرتبێت کە لە ڕۆما دیویەتی.

سەربارەی ئەم کارە ناوازەیەی چەند کارێکی ئەنجام داوە لەوانە ڕووی بالاتێستا لە ڕمینی. هەرچۆن لەسەر داوای پاپا بیۆسی دووەم دیزاینی گۆڕەپانی پینزای کێشاوە کە بە وێنەیەکی زیندوی تەرزی تەلارسازی ڕێنیسانس دادەنرێت. هەروەها دیزاینی کۆشکی ڤینیسیا بۆ ئەم دەگەڕێتەوە.

کاریگەریی تەلارسازی ڕۆمانی کۆن تەنیا لە دیزاینی تەلارسازیە دنیاییەکانیدا ڕەنگی نەدایەوە بەڵکو پەلی کوتی بۆ دیزاینی تەلاری کڵێساکانیش. لە ڕووی کڵێسەی پیرۆزمەند ئەندریادا کە لە شاری مانتوا ساڵی ١٤٧٣ تەرزێك لە بیناسازی دەبینرێت کە لە پەرستگەکانی سەردەمە نائاینییەکانەوە وەرگیراوە. لەو بیناسازیانەش کە هێمای تەرزی بیناسازی سەرەتایی ئەوە، ڕووی کڵێسەی پیرۆزمەند فرانشسکۆیە کە لە شار ڕیمینییە و ڕووی کڵێسای پیرۆزمەند ماریا نۆفیلایە کە سەرلەنوێ بنیات نرایەوە لە نێوان ساڵانی (١٤٥٦-١٤٧٠). لە ڕووەکەیدا کۆڵەکەی پەیوەست بە دیوارەوە دەردەکەوێت کە سیمای کۆڵەکەی یۆنانییە و دیوارە ناوخۆییەکانیشی بە نیگاری هونەرمەندان ماساتشۆ و جیرلندا یولیبی نەخشێنراوە.

تیۆرییەکانی ئەلبێرتی بۆ تەرزی تەلارسازی نوێ لە شارەکانی ئیتالیادا بڵاوبۆوە لەسەر دەستی ئەندازیاران جۆلیا نۆسان جاللۆ لە شاری براتۆ لە کڵێسەی ماریادا ساڵی (١٤٨٥)، ئەندازیار لۆمباردۆ لە شاری ڤینیسیا کە چەندان کۆشکی خاوەن ڕووی سەرنج ڕاکێشی بنیات ناوە.

## برناردۆ ڕۆسیللینۆ P. Rosselleno (١٤٠٩-١٤٦٤)

ژیانی خۆی وەك پەیکەرسازێك و ئەندازیارێك لە ئەریزۆ دەست پێ کرد و دواتر لە ساڵی ١٤٣٦دا لە فلۆرەنسا جێگیر بوو. بووە یەکێك لە دیارترین ئەندازیارەکانی ئیتالیا لە نیوەی سەدەی پانزەداو، دەستی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی تەرزێکی نوێدا. پاپا نیکۆلای پێنجەم بانگهێشتی کرد بۆ یارمەتی دان لە کلێسای پیرۆزمەند پترۆس لە ڕۆما، هەرچۆن دیزاینی کۆشکی ڤینیسیا لە ڕۆما لە دەستکردی ئەم ئەندازیارەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ساڵی ١٤٥٥.

لە بواری پەیکەرسازیشدا دوای چۆڵ بوونی نێوەندەکە بە گەشت کردنی (دۆناتێللۆ) بۆ بادوا ساڵی ١٤٤٣ چەند پەیکەرسازێ کاریان کرد و ماوەیان بۆ ڕەخسا تا دەرکەون یەکێ لەم پەیکەرسازانە ڕۆسیللینۆ بوو کە زیاتر ناووناوبانگی تایبەتی لە بواری نەخشاندن و ڕازاندنەوەی تابوتی گەورە پیاوانی فلۆرەنسادا هەبوو، لە ناوازەترین کارکردنی لەم بوارەدا نەخشی سەرگۆڕی "لیوناردو بروتی" و "کاردیناڵی ئەمیری پورتوگاله".

## پەیکەرسازی

وەك وتمان جگە لە ڕۆسیللینۆ چەندان توانای تر لە بواری پەیکەرسازیدا لەنا ئامادەیی دۆناتێللۆدا هاتنەکایەوە، کە توێژینەوەو کاری بەردەوامیان لەم بوارەدا دەکرد لە نێوان ساڵانی ١٤٤٣ بۆ ١٤٥٣ بەرهەمەکانیان لە دوای نیوەی سەدەی پانزەهەمەوە شکۆفەیان کرد، لە ناسراوترینیان دیلارۆبیا، دیل بولایولو، دیل ئارکا.

## لوکا دیلاڕووبیا "LvcceDellceRobice" ١٤٠٠-١٤٨٢

ناوبانگی ئەم هونەرمەندە دوای دروستکردنی پەیکەرێکی ریلیفی مەڕمەڕیی بوو بۆ کورسییەکی کاتیدراڵی فلۆرەنسی لە ساڵی ١٤٣٠دا. بابەتەکەی چەند مناڵێکن سوردی ئاینی دەخوێنن، هەرچەندە ئەم بابەتە پێشتر لە لایەن دۆناتێللۆوە بەرجەستەکرابوو، بەڵام تێبینی ئەوە دەکەین شێوازی کارکردنی دیلاروبیا جیاوازە لە شێوازی دۆناتێللۆ و نزیکە لە کاریگەریی شێوازی (جیبرتی)یەوە.

هەرچەندە دیلارۆبیا بەهرەمەندی و کارامەیی لە پەیکەرسازیدا نکوڵی ناکرێت بەڵام خۆی گرنگی ئەوتۆی نەداوە بە پەیکەری کامڵ و گەورە. زیاتر لێوەشاوەیی خۆی لە کاری ریلیفی

ناوەخن بۆشدا بەکارهێناوە و زۆریانی بە گڵی بـرژاو (کاشـی) دروسـت کـردووە و لەسـەر ڕووی دیوار دایناوە وەك تابلۆی "مریەم و منداڵەکەی".

### ئەنتۆنیۆ پۆلا یۆلۆ (Autonio Del Pollaiuolo) ١٤٢٠-١٤٩٨

ئەوەی دەربارەی ئـەم هونەرمـەندە دەزانرێـت نیگـارکێش و پەیکەرسـازو وەسـتای پەیکـەری برۆنـزی بـووە. لـە کارەکانیدا کاریگـەریی ئەفسانەو چیرۆکی مێژوویـی پێوەدیـارە جگـە لـە کارهایەکی ئاینی. گەر ساتێ بڕووانینە ئەو پەیکەرەی بۆ خێزانی میدتشی دروست کردووە کـە کێشەیەك نمایش دەکات لە نێوان (هـەرقل)ی پاڵـەوانی یۆنـانی و ئانتایۆسـی دوژمنیـدا، ڕاددەی ئەو کەوتنە ژێر کاریگەرییەمان بۆ دەردەکەوێت.

## نیگارکێشان

هونەرمەندە نیگارکێشەکانی ئەم هەرێمەش وەك هونەرمەندانی فلۆرەنسی پابەند بوون بە خواستی هیومانیزمەوە و بابەتە سروشتییەکانیان بەرجەسـتە دەکـرد، بـەڵام بـەبێ فـەرامۆش کردنی ئاین.

### دومنیکو جرلاندایو (Domenicho Ghirlandaio) ١٤٤٩-١٤٩٤

ئـەم هونەرمـەندە هاوسـەردەمی هونەرمـەند بۆتشـیللی بـووە، کـارکردنی خـۆی لـە دروسـت کردنی شـتومەکی ڕازاندنـەوەدا لـە فرۆشـگەکەی بـاوکیدا دەسـتپێکردووە. دواتـر دەچێتـە بـەر خوێندنی هونەری نیگارکێشان، کاتێ ناوبانگی پەیداکرد پاپای ڕۆما لە ساڵی ١٤٨٢دا بانگی کردە ڕۆمـا بـۆ ڕازاندنـەوەو نەخشـاندنی دیـواری نوێژگـەی کڵێسـای سسـتینا "Sistina". هـەرچۆن نەخشـاندنی دیـواری کڵێسای ماریا نۆفیلا لـە شـار فلۆرەنسا سـاڵی ١٤٩٠. هـەوڵی ئەوەشـی داوە شوراو قەڵای فلۆرەنسا بە کاری فریسکۆیی بڕازێنێتەوە. هەمان شت ئەم هونەرمەندە لە کاری پۆرترێت دروست کردنـدا کارامـە بـووە، زۆر کـاری پۆرترێتـی بـۆ کەسـایەتـییە بەناوبانگـەکانی فلۆرەنسا دروست کردووە لـە جوانـترینی ئـەو کارانـە تـابلۆی "باپـیرو کـورەزا"یـە کـە لـە سـاڵی ١٤٨٠دا دروستی کردووە لـەم تابلۆیـەدا وردەکاری هونەرمـەند و توانـای لـە گوزارشـت کـردن لـە نێوان منداڵ و باپیریدا بە سانایی دەردەکەوێت. بەشێکی بـاش لـەناوبانگی جیرلاندایو لەوەدایـە کە مایکل ئەنجیلۆی بلیمەتی ڕێنیسانس لەسەر دەستی ئەمدا هونـەری خوێنـدوە. لـە سـەرەتای ژیانی هونەریدا. ئەم هونەرمەندە لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدا بە پەتایەك کۆتـایی دێـت بـە ژیانی و لە پاشی هەردوو قوتابیەکەی میناردی و مایکل ئەنجیلۆ بەردەوام دەبن.

## پێرجینۆ (Petro Perugino" ١٤٤٥-١٥٢٣

پێرجینۆ لە پیرۆجیا پەروەردە بووە، سەرەتاگەکانی هونەری نیگارکێشانی لەسەر دەستی هونەرمەند (ڤیروکیو) خوێندووە و کارو بەرهەمەکانی هونەرمەندی بلیمەتی ڕێنیسانس (داڤنشی) لە ئەتلێلەکەیدا دیوە. لە دوای وەرگرتنی هەموو شارەزایی و زانیارییەك قوتابخانەیەکی هونەریی لە بیروجیا دامەزراندووە کە خاوەن مۆرکی تایبەتی خۆی بووە.

پێرجینۆ زۆر کاری هونەری لە شارە ئیتالیەکان جێبەجێ کردووە، بەڵام لە بەناوبانگترین کارەکانی دیواربەندێکی نیگارە کە بۆ نوێژگەی سیستینای دروست کردووە لە ساڵی ١٤٨٢. ئەم دیواربەندە دەرباری بەخشینی کلیلەکانە بە پیرۆزمەند بوترس وەك یەکەمین پاپایەك کە کلیلی بەهەشت لە مەسیح وەرگرێت. بەڵام ئەم ناوبانگەی پێرجینۆ ڕوو لە کزی بوو دوای ئەوەی ناوبانگی قوتابیەکەی (ڕافائیل) باڵی بەسەر ناوبانگی خۆیدا کێشا کە لەسەر دەستی ئەمدا بنەماکانی هونەری نیگارکێشانی وەرگرت. تەرزی زووی ڕێنیسانس لە فلۆرەنساوە بەرەو سەروی ئیتالیا لە ساڵی ١٤٢٠وە بڵاوبوو، لە شاری بادوا پەرەی سەند کە لەپاڵ ڤینیسیایە لەسەر دەستی هونەرمەندان (فلیبولیپی) و (ئۆتیشللۆ) و (کاستانیو) کە هەریەکێکیان بۆ ماوەیەك تیا ماونەتەوە، هەرچۆن هونەرمەندی پەیکەرساز دۆناتێللۆ بۆ ماوەی دەساڵ تیا ژیاوە. بەڵام ڕۆڵی دیارو بەرچاو لە گەشەسەندنی ئەم تەرزە نوێیە دەگەڕێتەوە بۆ هونەرمەندی نیگارکێش مانتێنا و زاواکەی بیللینی.

## ئەندریا مانتینا (Andrea Mantegna) ١٤٣١-١٥٠٦

مانتێنا بە هونەرمەندە پێشڕەوەکانی سەروی ئیتالیا دادەنرێت لە سەردەمی سەرەتای ڕێنیسانسدا، لە شاری بادوا پێگەیشتووە و ناوبانگی تیا بەدی هێناوە.

لە دۆناتێللۆوە -کە چەند ساڵێك لەم شارەدا بووە- گرنگی دان بە مێژوو و کلتوری کلاسیکی فێربووە. بەڵام ئەم سەیری ئەو مێژووەی نەدەکرد وەك وێنەیەك بێت بۆ کەماڵ و جوانی باڵا، یاخود وێنەیەکی نمونەیی سروشت بێت، بەڵکو وەك بەسەرهاتێ بۆ ئازایەتی و پاڵەوانێتییە گەورەکان و گەواهێك بۆ پێودانگە مرۆڤایەتییە نەمرەکان. هونەرەکەی جۆرێك لە تراژیدیایە بە مانا کلاسیکییە ئەرستۆتالیسییە کۆنەکەی. هەرکاتێکیش ویستبێتی وەسفی ڕووداوێك لەو ڕووداوە مێژووییانە بکات تا گوزارشت لەو هەستە تراژیدییەی بکات، هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەداوە ئەو ڕووداوە لە واقعی ئێستای نزیك کاتەوە، بەڵکو وا دەردەکەوێت کە هەوڵ بدات ڕێساکانی لە قوڵایی زەمەندا بدۆزێتەوە.

بەربینە بۆ دۆزینەوەی ماناکانی مێژوو لە کاردایە. کۆمپۆزشن جۆرێکە لە ڕێکخستنەوە یا کۆکردنەوە، واتە نزیکترە لە گێڕانەوە وەك لە یەکەیەکی ئەندامی کە زوبانی شێوەکاری دەیئەفرێنێ. هەموو بەشێك لە تابلۆدا بە هێندایی خۆی ڕووناکی و دیاری کردن و وەسفی وردەکار وەردەگرێت. وەك دیکۆمێنتێك لە دیکۆمێنتیەکانی مێژوو.

لە ساڵێ ١٤٥٣دا مانتێنا کچی نیگارکێش جاکوبو بللینی کردە هاوسەری، کە یەکێك بوو لە نیگارکێشەکانی ڤینیسیاو باوکی جیوفانی بللینی بوو، کاریگەریی جیۆفانی بە ڕاددەیەك بوو لەسەر مانتێنا، جیهانە بەردینیەکەی فراوان کرد تا پێشوازی لە هەستە مرۆڤیەکان بکات. هونەرەکەی لە جوانی سروشت و کراوەییەکەیەوە نزیك بۆوە. دواتر پەیوەندی کرد بە تەختی (مانتۆڤا)وە، لەم شارەدا و لە ڕۆماش، وشیاری هونەرمەند بە بەها مرۆڤایەتییەکان لە زیادبووندا بوو کە بیریارەکانی ڕێنیسانس گوزارشتیان لێ دەکرد. لە کارە هونەرییەکانیدا پشتینەیەکی تەلارسازی بەکاردەهێنا هەر بەم شێوازەش کارەکانی دەناسرایەوە، نمونەی ئەم شێوازەشی لە تابلۆی (پیرۆزمەند سباستیان)دا دەرئەکەوێت، دیمەنێکە پڕ تراژیدیا کە هەموو لەشی ئەم پیرۆزمەندە بە تیر پێکراوە و خوێنی لێ دەچۆڕێ، بوونی یەکە تەلارسازیەکان وەك کۆڵەکەی پڕ نەخش و نیگار و وردەکاری زۆر جوان و مامەڵەیەکی تەلارسازیانە لە پشتینەی کارەکەدا، هەموو سیماکانی شێوازی کارکردنی ئەم هونەرمەندەی دەرخستووە لە دوتوێی ئەم تابلۆیەدا. لە تابلۆ ئەفسانەییەکان و مێژووییەکانیدا دیمەنهایەکی سروشتی لە سەرووی ئیتالیاوە بەکارهێناوە و ئەو کەسایەتیانەش کە بەرجەستەی کردون لەشی خاوەن بەهێز و لێوان لێو لە ژیانن.

## جیوڤانی بیللینی (G. Bellini) ١٤٣١-١٥١٦

یەکێك بووە لە خێزانی (بیللینی) کە ناودارترین نیگارکێشەکانی ڤینیسیا پێك دەهێنن، خێزانەکەیان لە (جاکۆبۆ)ی باوکیان و (جنتیل)ی برای کە تابلۆیەکی شەخسی سوڵتانی عوسمانی محمدی دووەمی کێشاوە پێك هاتووە.

جیوڤانی لە پێشتر دەزانرێت وەك لە بارتولیۆڤیڤارینی، لە دامەزراندنی ڕاستەقینەی قوتابخانەی ڤینیسیای سەردەمی ڕێنیسانس دا، هەر ئەم قوتابخانەیەشە بنەمای پێگەیشتنی جیۆرجیۆنی و تیسیانۆ کە بە مەزنترین هونەرمەندانی ئەم قوتابخانەیە ناوزەد دەکرێن لە سەدەی شانزەهەمدا. جیوڤانی و جنتیلی برای لای جاکۆبۆی باوکیان فێری نیگارکێشان بوون، بەڵام مامۆستای گەورەی جیوڤانی بە مانتێنا دەزانرێت. هەرچۆن لە کاریگەریی هونەری دامەسینا دەرباز نەبووە.

بەڵام هونەری جیوڤانی هونەرێکە بە زمانی دڵ ئەدوێت، ئەفسانەکانی ئەفسانەی کلاسیکی نین هێندەی ئەفسانەهایەکن لێوان لێو لە سۆزی ئاینی و سروشتێکیان کردۆتە قاڵبی خۆیان کە چیتر شانۆیەك نییە بۆ بوونی مرۆڤ و کردەوەکانی بەڵکو بابەتێکە بۆ سۆز و هەستەکانی مرۆڤ. هونەرەکەی لە گەوهەرێك پێك هاتووە کە (تێڕامانە). ئەم ڕێبازەش هاوشانی خواستی نوێی بیریارە هیومانیستەکانە لە دوادواکانی سەدەی پانزەدا.

لە کارەکانی جیوڤانیدا کەسایەتییە ئاسمانیەکان خاوەن مۆرکێکی مرۆڤگەرای قوڵن، جوانترین نمونە تابلۆی (بەزەیی)یە کە ئاسمانەکەی لە مەرمەڕێکی سافکراو دەچێت، هێڵە ئاسۆییە درێژبووەکانی هەر دەڵێی بۆ هەتاهەتایی ئەو خەمە قوڵە فراوانە دەڵێتەوە کە زۆر بەهێزەوە لەسەر ڕووی دایکەکە نەخشاوە ساتەوەختی دوا لێك دابڕان. تابلۆکە ساڵی ١٤٧٠ دروست کراوە بە شێوازی نیوەیی فیگەرەکان (چون ناوبانگی تایبەتی لەم شێوازەدا هەبووە) هەرچۆن هەست بە گرنگی دانی هونەرمەند دەکەین بە لۆچ و چرچی جلەکان و پێکهاتەی لەشە ڕووتەکە. جیۆڤانی پێشڕەوێکی گەورەی سەردەمی زێڕینی ڤینیسیایە و جگە لە پەروەردەبوونی هەردوو هونەرمەند جیورجیۆنی و تیسیانۆ لەسەر دەستیدا، هونەرمەندی ئەڵمانی دیووەو زۆر پێی سەرسام بووە ئەو دەمەی سەردانی ڤینیسیای کردووە.

## ئەنتۆنیللۆ دامسینا (Antonello da Massina) ١٤٣٠-١٤٧٩

شتێکی ڕوون و ئاشکرا و نەگۆڕ دەربارەی پەروەردەبوونی و پەیدابوونی ئەم هونەرمەندە نازانرێت، بەڵام لە ڕێی کارەکانیەوە پەی بەو کاریگەرییە توندوتیژە دەبەین کە هونەرمەندانی فلاندەر لەسەر ئەم هونەرمەندەیان داناوە. ڤازاری -مێژوونووسی بەناوبانگی ڕێنیسانس- وای بۆ دەچێت ئەم هونەرمەندە دوور بووە لە سەنتەرو پێگە ناسراوە هونەرییەکانی ئەو سەردەمەوە، بەڵام دواتر چووەتە هەرێمی فلاندەر و لەسەر دەستی ئوستادەکانیاندا فێری هونەر بووە و نهێنی سنعەتی نیگارکێشانی ڕەنگی ڕۆنی لێ وەرگرتون کە ئەو دەمە هونەرمەندە ئیتالیەکان شتێکیان دەربارەی نەزانیوە. بەڵام بیروباوەڕوو گەڕانی نوێ شتێکی تر دەڵێت دەربارەی ئەم هونەرمەندە ئەویش ئەوەیە لە نێوەندێکی زۆر کارتێکراوی هونەری فلاندەریدا ژیاوە وەك ناپۆلی و خواروی ئیتالیا لەو سەردەمەدا، بە شێوەیەك لە شێوەکانیش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی هونەری پیرودیلا فرانشسکاوە.

ئەم هونەرمەندە پەی بەو ڕازە بردووە کە هونەرمەندانی فلاندەری لە بینگەیاندا بۆ جێگە هەیانبووە لەو واقعیەتە تایبەتییەی خۆیاندا کە بە (واقعیەتی هەستی) ناوزەد دەکرێت. بۆیە هەر کاتێك جیهانی دروست بکردایە وەك جێگەیەکی دیاریکراو دروستی دەکرد

بەڵام جێگەیەك سەر بە خودی خۆی وەك بڵێی جیهانێك بێت داخراو -وەك تابلۆی پیرۆزمەند جیرۆم لە هونەرمەند سەرباری گرنگی دانی بە جێگەو وردەکاری شتەکان، لە سەرو ئەمانەشەوە گرنگی بە کەشی گشتی کارەکەی داوە وەك ڕەنگ و پەیوەستی هەموو بوونەوەرەکان بە توێژاڵێکی ڕوون کە لە بلور دەچێت بە یەکترەوە. ئەم ڕێسایەشی لە کارە پۆرترێتەکانیشیدا بەکارهێناوە (کە تیا کارامە بووە) وەك بڵێی کەسایەتییەکە بە هەناسەی کەشێکی تایبەت بخولقێنێ.

## قوتابخانەی فیرارا (Ferrara)

هەردوو شێوازی سکوارتشیونی و مانتێنا بە خێرایی بە هۆی بارتۆلۆمیۆڤیڤارینی و کارلۆکریڤللی بلاوبۆوە لە ڤینیسیادا، هەرچۆن بە بۆنەی کۆزیمۆتورا و فرانشسکۆ دل کوسا و ئیرکولی روبرتی لە فیراراو، بە هۆی ڤیشنزۆفۆپا لە بریتشیا و میلانۆو، بە هۆی لیبرالی لە ڤیرونا بلاوبۆوە.

**تابلۆکانی کارلۆکریڤللی** (Carlo Crivelli) لە گەوهەری گرانبەها دەچن، جلەکانیان وەك ئالتونی زاخا و دراو و شەرابی وەك پارچەی بلور، میوەی وەك ساف.. تابلۆی (مریەم)ی بە ڕەنگە کانزاییە بریسکەدارەکانیەوەو، هێڵە تیژە وردەکانیەوە کە هەر لەوە دەچێت بە ئەلماس نیگاری کێشرابێت لەسەر تەختێکی بلورین، کۆمپوزشنە ستونیەکانی هاوڕێکە لەگەڵ دابەشکردنە ئاسۆییەکانی، ئەمانە هەمووی پێکڤە نمونەیەکی ناسکی دیزاین و جوانی نەخشاندنن لای ئەم هونەرمەندە داهێنەرە.

بەڵام **کوزیموتورا** (Cosimo Tura) (ساڵی لە دایك بوونی نەزانراوەو ساڵی ١٤٩٥ مردووە) هونەرمەندێکە بە دوور نییە لە زبری و ڕەقی. لەشەکان لە زۆربەی گۆشتەکانیان ڕووت دەکاتەوە، چیاکان لە زۆربەی ماددەکانی، پشتینەکان بە بەردە لارەکان پڕدەکاتەوە، لە گوزارشتەکانیدا توندوتیژی و لە هێڵەکانیدا توندڕەوییەك هاوشانی کۆنتراستە ڕەنگییەکانیەتی کە زۆرجار لە سورێکی خوێنی تێردایەو لە سەوزێکی زمرودی تاریکدا.

هەرچی **فرانشسکو دل کوسا** (Franseco del Cossa)**یە** (**١٤٣٦-١٤٧٨**)

نە ڕەسەنایەتی کۆزیمۆتۆرای هەبوو نە ئەو ناسکییەی، بەڵام قوڵتر هەستیار و ڕاستگۆتر هەستکردنی. تابلۆ سەرەتاییەکانی هاوسەنگی و جێگیریەکی تەلارسازی تیایە، لەوە دواتر کەوتە هەرچی زیاتر گوزارشت کردن لە جووڵە، خانووبەرە دەبینین پتەوی و یەکێتیان هەڵوەشاوە و شەقار بووە لە ساتێکدا جل و بەرگەکان ڕفیون بە ئاسمانداو تاڵی قژەکان بابردونی.

لە لۆمبارددیاش یەکەمین موژدەی سەردەمی ڕێنیسانس کۆمەڵێ تابلۆی فریسکۆیی هێنای کە بەسەرهاتی شەهیدبوونی پیرۆزمەند پترۆس دەگێڕێتەوە لە کڵێسای سانت ستورجیو لە میلانۆ، کە ڕەخنەگرەکان ئەمڕۆ کۆکن لەسەر ئەوەی لەبەرهەمی دەست و پەنجەی **ڤیشنزۆ فۆپا** (Vicenzo Foppa) بێت (١٤٣٦-١٤٧٨) بەڵام گۆڕانکاری مەزن ڕووی نەدا تا هاتنی لیۆناردۆ داڤنشی بۆ ئەم شارە ساڵی ١٤٨٣.

### ڤیتۆری کارپاچیۆ (Vittori Carpaccio) ١٤٥٥؟-١٥٢٥

وا پێناچێت ئەم هونەرمەندە سودمەند بووبێت لەو نوێکاریانەی پێش خۆی کردویانە لە زمانی هونەری نیگارکێشاندا، ئەم زیاتر بەلایەوەدا دەشکێتەوە کە پابەندی قوتابخانەی جنتیلی دا فابریانۆ بێت. هونەرمەندێکی خاوەن سەرنجی بەهێز بووە، گێڕەوەیەکی زوبان شیرین بووە، ژیانی ڤینیسیای سەردەمی خۆی بۆ وەسف کردوین وەسفکردنێکی دلڕفێن وەك ئەوەی خەون بێت.

## بەرەبەیانی ڕێنیسانس لە ڕۆماو خواروی ئیتالیا

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە ناوچەی خواروی ئیتالیا لە سەدەی پانزەدا کەوتبووە ژێر کاریگەریی هونەری فلاندەریەوە. لەم ناوچەیەدا کەسێکی وا دەرنەکەوت جگە لە ئەنتۆنللۆ دامسینا کە پێشتر دەرباری ئاخافتین.

هەرچی ڕۆماشە نەبووە سەنتەرێك لە سەنتەرەکانی هونەری ئیتالی ڕێنیسانس تا پاپاکان لە ئاڤینۆن نەگەڕانەوە و ڤاتیکان ئەو توانایەی بۆ خۆی گێڕایەوە کە لە سەدەی چواردەدا لاواز بووبوو، کڵێسا کەوتە پشت گرتن و بوونیات نانی فەلسەفی هیومانیزم کە بیریارەکانی فلۆڕەنسا بانگهێشتیان بۆ دەکرد، پاپاکان کەوتنە بانگکردنی هونەرمەندان لە شارەکانی ترەوە تا ڤاتیکان بەکارە هونەریەکانیان برازێننەوە، لە سییناوە هونەرمەندێکی وەك جنتیلی دافابریانۆ و لە فلۆڕەنساوە فرائەنجیلیکۆ و بۆتشللی و جیرلاندایو گەیشتنە ڕۆما، بەڵام زۆرێکیان لە هەرێمی ئۆمبریاوە دەهاتن وەك بیرودیلافرانشسکاو قوتابیەکانی میلوتزو دافورلی و لۆکاسنیۆریللی، پاشان بیروجینو کە ڕافاییللی فێری نیگارکێشان کرد لە ئەتێلەکەیدا لە بیروجیا.

**میلوتز و فورلی** (MelozzoForli) (**١٤٣١-١٤٩٤**) هەرگیز نەیتوانی پارێزگاری لەو هەیبەت و پاکێتی و ڕەسەنایەتییە بکات کە ئوستادەکەی پیادەی دەکرد، بەڵام لە هونەرەکەیدا جوانی و زیندوێتییەك دەبینین پڕ لە گەرمی مرۆڤایەتی، ئەمیش لە هەرکەسێ زیاتر ڕێخۆشکەری هاتنی رافایل بوو. خەڵکی ڕۆما وابەستەی دلڕفێنی ڕەنگە نەرمەکانی بوون، ئەو فریشتە

مەزنانەش کە بە سیمای مرۆڤی جوانەوە و پرچی ئاڵتونییەوە مەلەیان لە ئاسمان و هەوردا دەکرد جێی هەرچی نزیك بوونەوە و ئاشنابوونی زیاتری بینەرانی هونەری ئەوکاتە بوون.

**لۆکا سینیوراللی** (Luca Signorelli) "**نزیکەی ١٤٤١-١٥٢٥**" بە پێچەوانەی ئەوەوە هونەرێکی هەرقلی هەبوو، نیگارکێشی شەڕە توندوتیژەکان بوو، کە تیایدا وێنەی مرۆڤی ماسولکە دەرپەڕیو و دەمار دەرکەوتوو دەبینرێت، ئەم دەستبەرداری ئەو هێمنیە بوو کە لە سیمای دیلافرانشسکای ئوستادی بوو، لە تابلۆکانیدا هەڵچون و جوڵەیەکی پڕ دڵەڕاوکێ دەبینین. لەبەرئەوە هونەرەکەی بە مزگێنی هێنەری مایکل ئەنجیلۆ ناوزەد دەکرێت، کە دواتر لەگەڵ ڕافایل دا پێکەوە هەردووك بوونە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی قوتابخانەی ڕۆما لە سەدەی شانزەدا.

## کڵێسای سان بییر لە ڕۆما:

ناکرێت باسی بزاڤی هونەریی لە ڕۆمادا بکەین و لە کڵێسای سان بییر نەدوێین، چون ئەم بینایە لە گرنگترین ئەو بینایانە دادەنرێت کە لەو سەردەمەدا دروست کرابێت، وا دەزانرێت پێگەی بنیات نانی ئەم کڵێسایە جێی گۆڕی پیرۆزمەند سان بییر بێت. قوستەنتین لە ساڵی ٣٢٤-٣٤٤ ئەو کڵێسایەی لەویا دروست کردوە، پاشان پاپا نیکۆلای پێنجەم وای خواستووە سەرلەنوێ بنیاتی بنێتەوە. لە ساڵی ١٤٥٠ وە هەریەك لە ڕۆسیللینۆ و سانگالو پرۆژە تەلارسازی‌یەکانی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە پێشکەش کرد لە سەردەمی پاپا یولیوسی دووهەمدا. دواتر پشت بە نەخشەکەی برامانتی بەسترا کە مایکل ئەنجیلۆ پاشتر ڕێکی کردەوە و دەست کاری کرد.

نەخشەکەی داسانگالو بریتی‌یە لە خاچێکی لاتینی، بەڵام نەخشەکەی برامانتی لەسەر شێوەی خاچێکی گریکی دوولای وەکو یەك ڕاوەستاوە هەرچەندە مادرنۆ ساتێ داڵانێکی خستە سەر چونە ژورگەی کڵێسا کە دوای بنیات نان و تەواوبوونی، خۆی لە خۆیدا نەخشەکە گۆڕڕاو شێوەی خاچێکی لاتینی وەرگرت. مایکل ئەنجیلۆ دوای برامانتی هەستا بە سەرپەرشتیاری بنیات نانی کڵێسەکە، دیزاینی گومەزەکەی کێشاو سەرپەرشتی بەشێکی باشی جێبەجێکردنەکەی کرد تا کۆچی دوایی کرد و دواتر دللابۆرتا خەریکی بوو پاشان لەسەردەستی فۆنتانادا کامڵ و تەواوبوو. بەرزییەکەی (١٣٢,٥م) و تیرەکەی (٤٢م) بنەمای گومەزەکە پڕاوپڕە لە پەنجەرەی بەرز و تاوەرێکی خاوەن پەنجەرەی بچووك سەری گرتووە. لە سەدەی حەڤدەهەمدا برنێنی (Bernini) دووباڵی ئەم لاولای خستەسەر ڕووی کڵێساکە، کە لە ناوەوە وەك دوو داڵان دەرئەکەوتن. پێوانەی ڕووبەری کڵێساکە ٢١ هەزار م$^2$ دەبێت، بەڵام هەرکام لە دومیلانۆ ١١ هەزار م$^2$ و ئایاصوفیا ١٠ هەزار م$^2$ دەبێت.

## سەرچاوەکانی سودیان لێوەرگیراوە بۆ سەدەی پانزە:

١)محيط الفنون/ الفنون التشكيلية،عصر النهضة/الأستاذ رمسيس يونان/ دار المعارف بمصر. التأريخ بلا.

٢)الفن والمجتمع عبر التأريخ/ ارنولد هاوزر/ الجزء الأول، ترجمة د. فؤاد زكريا. مراجعة احمد خاكي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر. بيروت. الطبعة الثانية ١٩٨١.

٣)الفن و الانسان، دكتور عزالدين اسماعيل، دار القلم. الطبعة الاولى. بيروت ١٩٧٤.

٤)فنون الغرب في العصور الوسطى والنهضة والباروك، نعمت اسماعيل علام. دار المعارف بمصر. القاهرة ١٩٧٦.

٥)الفن في اوروبا من عصر النهضة حتى اليوم. الدكتور هفيف البهنسي دار الرائد اللبناني/ المجلد الثاني، موسوعة تأريخ الفن و العمارة، الطبعة الأولى ١٩٨٢.

٦)ڕێنیسانس. دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد/ وەرگێڕانی فؤاد میسری/ چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٤.

٧)افاق النقد التشكيلي/ عباس الصراف/ دار الرشيد للنشر، وزاره الپقافه و الاعلام العراقيه ١٩٧٩.

## پەراوێزەکانی سەدەی پانزە

١-هەروەك چۆن بەڕێز د. کەمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا دەربارەی ڕێنیسانس هەر ڕاستەوخۆ ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە و بە کوردیەکەشی وەرگێڕ کاك فؤاد مەجید میسری بە هەمان شێوە بەکاری هێناوە. ووشەکە بە زمانی فەڕەنسی واتای ژیاندنەوە یان زیندوکردنەوە دەگەیەنێ.

٢-زاراوەی (سەدەکانی ناوەڕاست) یەکەمجار لەلایەن هیومانیستەکانەوە بەکارهێنراو مەبەستیشیان لە سەدەی بەر لە ڕێنیسانس و سەدەکانی دوای گریك و ڕۆمان بوو.

هیومانیستەکان بەرەنجامی گرنگی دانیان بە کەلەپوری کۆن و ڕێزگرتنی تایبەتیان بۆ شارستانیەتی گریك و ڕۆمان سەربارى هەڵوێستی دژایەتییان بۆ کلێسە، دژایەتییەکی بەهێزی هەموو ئەو بەرهەمە ئەدەبیيانەشیان دەکرد کە پەیوەندیيان بە سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەبوو. چونکە ئەو سەردەمانەیان بە سەردەمی دواکەوتن و نەزانین لە قەڵەم دەدا، بەم هەڵوێستەشیان وایان لە خەڵکی کرد سەدەکانی ناوەڕاست بە تاریکیستانی ئەنگوستە چاو و

کۆت و پێوەندێکی گران بزانن، چەمکی سەدە تاریکەکان کە بە سەدەکانی ناوەڕاست دەوترێت زاددەی هەڵوێستی ئەمانە بەرامبەر بەم سەردەمە.

بەڵام لەم بۆچونەیاندا ڕاستی ناپێکن چونکە بەرەنجامی چونە پێشەوەو پەرەسەندنی مێژوویی سەدەکانی ناوەڕاست بەدەرنین لە گەلێك دەستکەوتی گرنگ بۆ مرۆڤایەتی.

٣-هونەری کورتوازی لە سەردەمی بێزەنتیدا واتە کارلێکردنی هونەری بێزەنتی و هونەری خۆرهەڵاتی بە تایبەت هونەری ئێرانی (کە لە هونەری چنینی فەرش و هونەری میناتۆری فارسیدا بەرجەستە دەبێت) لە ڕێگەی تورکیاوە کە ئەودەمە قوستەنتەنیە (ئەستەنبوڵی ئێستا) پایتەختی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی ڕۆژهەڵاتی بوو گوازرایەوە بۆ ئەوروپا.

٤-نمونەی ئەوانە لایەنگرانی بزاڤی فرانسیسکان و ئەوانەش کە لە کاریگەریی کەلتوری مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەسەر ڕێنیسانس دەگەڕێن.

٥-لە بەناوبانگترین ئەو بنەماڵانە خێزانی میدتشی کە لە وشەی (Medici)یەوە هاتووە واتە کاری ئەجزاچێتی و پزیشکی) و خێزانی پیتی (Pitti)و پازی (Pazzi) و سترۆتسی (Strotsi) بوون.

٦-لە ساڵەکانی دوایی سەدەی چواردەهەمەوە شاری فلۆڕەنسا لەسەر شێوازێکی نوێ دەستی دایە لێکۆڵینەوەی زمانی گریکیی کۆن بە مەبەستی شارەزابوونی ئەفلاتون و ئەرستۆو فەیلەسوفەکانی تر فێربوونی زمانی لاتینی خەڵکی شارەکانی ترو وڵاتە دراوسێکان خۆیان دەگەیاندە ئەم شارە چونکە چەندان پێگەی تایبەتی تیاکرابۆوە بۆ فێربوونی زمانی لاتینی ئەمەبێ لەوەی زێدی پێشەوایانی ڕێنسانسە وەك بترارك و بۆکاشیۆو دانتی لەلایەك و بنەماڵەی میدتشی لە لایەکی تر هەروەها هونەرمەندانی بلیمەت داڤنشی و مایکل ئەنجیلۆو ڕافاییل لەوێ لەدایك بوون و پەروەردە بوون.

لە لایەنی ئابوریەوە فلۆڕەنسا بەر لە هەموو شارەکانی تری ئیتالیا سکەی پارەی زێڕی لێدا کە بە (فلۆرین) ناودەبرا. هەر لەوێشدا سەرهەڵدانی یەکەمین دامەزراوی شێوە سەرمایەداری لەسەر ئاستی هەموو جیهان دروست بوو یەکەم مانیفاکتۆرەو ترۆستی دارایی "الاتحاد المالي" هاتەگۆڕێ. لە سەدەی چواردەدا ژمارەی کارگەی قوماش بەرهەم هێنان تیایدا لە (٢٠٠) کارگە تێپەڕی کرد. هەر لەو قۆناغەدا گەورەترین بانك بە شێوە نوێکەی لەم شارەدا دامەزرا. لە کۆتایی سەدەی سیانزەهەمدا ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە (٧٠) هەزار کەس و لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەدا خۆی دا لە (١٥٠) هەزار، لەوکاتەدا گەورەترین شاری ئەوروپا ژمارەی دانیشتوانی لە هەشت یەکی ئەو ژمارەیەی دوایی تێنەدەپەڕی.

٧-سەرەتای دەرکەوتنی زاراوەی هیومانیزم و هیومانیست (Humanistic, Humanism) وەك دەربڕینێکی فیکری کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم (لە سەدەی شانزەهەمەوە وەك زاراوەیەك بنج بەست بوو) ئەم زاراوەیە بەر لەو مێژووە بە Humanitas بەکارهاتووە و بەترارك بەکاری هێناوەو ئەوانی دوای ئەویش کاری تێکردون و دوبارەیان کردۆتەوەو بە شێوەیەکی فراوان بەکاریان هێناوە. زاراوەکە لە بنەڕەتدا لەم وشەیەوە وەرگیراوە کە مانای مرۆڤایەتی دەگەیەنێ، ئەمەی دواییش لە وشەی (Homo)وە وەرگیراوە کە مانای مرۆڤ دەبەخشێ. ڕابەرانی ئەم ڕێبازە نوێیە مەبەستیان لە هەڵبژاردنی ئەم زاراوەیە ئەوە بوو پێ لەسەر سیما دونیاییەکەی زانست و ئەدەب دابگرن و بایەخ بە مرۆڤ بدەن.

هەر ئەمان ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا لە ساغ کردنەوەو وەرگێڕانی سەدان دەستنووسی بێناز کەوتوی نێو کەنیسەکان و ڕاست کردنەوەی ئەو تێکستانەی بەدەستی ئەنقەست لە سەدەکانی ناوەڕاستدا شتیان لێ زیاد کرابوو، هەرچۆن وەرگێڕانی ئەو دەستنووسانەی لەڕێی نومایندەی تایبەت و کڕینییان لەلایەن پیاوانی ڕۆژگاری ڕێنیسانسەوە گرتیانە ئەستۆی خۆیان ئەو دەستنووسانەش کە زانایانی قوستەنتەنیە لەگەڵ نزیك بوونەوەی عوسمانییەکان بەرەو ئیتالیا لەگەڵ خۆیاندا بردیان. سەرەنجامی ئەم بایەخ دان و هەوڵانە بەردی بناغەی زانیاری (ئیپیێگرافی Epigraphy) داڕێژرا، کە لە نووسین و نەخشی کۆن دەکۆڵێتەوە.

٨-لەو کەسایەتییانە قەشەیەك بوو بە ناوی (سافونارولا) کە تانەی لە خەڵکی هاوسەردەمی خۆی دەداو بە یەخسیریی دەستی بیروباوەڕی بێئیمانی و فەسادیان لە قەڵەم دەدات. بۆ زانیاریی زیاتر بڕووانە پەراوێزی (٣٦).

٩-ئەمەش لەژێر کاریگەری هزری (ئارازمسی نۆتەردامی) کە یەکێکە لە ناودارترین هیومانیستەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس هیومانیستە ئەڵمانیەکان دەستیان دایە ئەو لێکۆڵینەوانەی ئارازمس بە (فەلسەفەی عیسا) ناویان دەبا.

١٠-هێرشی سوپایی فەڕەنسا بۆ سەر ئیتالیا ڕۆڵێکی کاریگەری بینی و بە هۆیەوە میرو شازادە فەڕەنسییەکان شارەزای شێوەی ژیان و کەلتوری دانیشتوانی ئیتالیای پێشکەوتوو بوون، هەر ئەم هۆکارەش بووە مایەی پەرینەوەی ڕۆشنبیری ڕێنیسانس بە شێوە گشتییەکەی بۆ فەڕەنسا.

١١-ئەمە بەڵگەیە کە پێشڕەوانی ڕێنیسانس دژ بە ئاین نەبوون ڕاستەوخۆ هێندەی دژایەتی کەنیسە وەك دامەزراوێکی ئاینی و پیاوانی ئاینییان کردووە. هێندە دژ بە خودی ئاینی مەسیحی نەبوون.

١٢-نووسەرانی سەدەی ناوەڕاست بەو بەرهەمە هونەرییانەیان دەووت (كۆمیدیا) كە بە گەش بینیی كۆتاییان دەهات و موژدەی خێرو خۆشی بەخەڵكی دەدا، ووشەی (یەزدانی)یش ئەوانە پێوەیان لكاند كە دوای دانتی دڵبەستەی بەیتەكە بوون. زۆر بەڵگەی لۆژیكی دەیسەلمێنن كە كاریگەریی هەندێ كتێبی وەك (رسالة الغفران) ی ئەبولعەلای موعەڕی و (الفتوحات المكية)ی ئیبن عەرەبی و "الاسراء" و "المعراج" كاریگەریان كردۆتە سەر دانتی لەم شاكارەیدا. ئەمەش بەڵگەی بوونی ڕۆڵی ڕۆژهەڵات و عەرەبە لەسەر ڕێنیسانس ئەمە نەك هەر لەسەر دانتی بگرە لەسەر (پۆكاشیۆ) و (پەترارك)یش ڕاستە.

١٣-لەسەر ڕێبازەكەی دانتی باوەڕی وابوو، كە دەبێ تاكەكەس بە خودی خۆیەوە ببەسترێتەوە نەك بە پێی بنەماڵەو ڕەچەڵەك حسابی بۆ بكرێ.

١٤-دیكامیرۆن بە زمانی لاتینی واتای (یاداشتی دە ڕۆژە) دەگەیەنێ، حەوت كچ و سێ لاو لە كاتی ڕشانەوەكەی ساڵی ١٣٤٨ فلۆڕەنسا جێ دێڵن و لە ڤێللایەكی دەرەوەی شاردا دە شەو و ڕۆژ دەمێننەوە هەر ڕۆژەی یەكێكیان چیرۆكێك دەگێڕنەوە. وا لێك دەدرێتەوە كە كاریگەریی چیرۆكی (هەزارویەك شەوە)ی لەسەر بێت.

١٥–لەو كەسایەتییانەی پەیڕەوی ئەم سێ پێشەوایەی كرد "ئارازمسی ڕۆتەردامی) بوو كە یەكێكە لە دیارترین هیومانیستەكانی ئەو قۆناغەی ڕۆژگاری ڕێنیسانسی تیا گەیشتە چڵەپۆپە-دواتریش كەسایەتی تۆماس مۆر كەوتۆتە ژێر كاریگەریی ئەمەوە.

١٦-تەنها لە شاری ڤینیسیا ژمارەی كرێكارانی كاركردوو لە بواری پیشەسازیی چنیندا گەیشتۆتە ١٦ هەزار كەس و لە پیشەسازیی كەشتی دروست كردندا ٦ هەزار كەس. ژمارەی یەكەم بەڵگەی پێشكەوتنی پیشەسازی و دووەمیشیان بەڵگەی پەرەسەندنی ئاستی بازرگانییە لەو شارەدا.

١٧-ئەم فەرمانڕەوایانە یا ئەندامی خێزانە مەلیكییەكان بوون (خێزانی ئیستی "Este") یا فەرمانڕەوای ئیمپراتۆریی (خێزانی ڤیسكۆنتی) لە میلانۆ، یا سەركردەی سوپا بە كرێگیراوەكان وەك (فرانشسكوسفورتسا) یاخود ژمێریار (خێزانی ریاریو و فارنێزی) لە فورلی و بارما، یاخود هاوڵاتی دیار و هەڵكەوتوو وەك (خێزانی میدتشی) لە فلۆڕەنسا.

١٨–چینی كرێكار و هەر بە كرێ كارگەرێك ناویان نەبوو بە هەمویان دەوترا (هەژارەكان).

١٩–واتە تا ساڵی ١٣٧٨ ساڵی شۆڕشی پیشەگەراكان.

٢٠-وەك خێزانەكانی ئەلبیرتی و كاپونی و ئاوتسلنۆو ئالبیزی ماوەی كورت دەسەڵاتیان گرتە دەست بەڵام دواتر خێزانی میدتشی تا سەدەی پانزە دەسەڵاتی لەخۆگرت.

٢١-لە وێنەی ئەم حاڵەتە سەرکردەی سەربازە هەڵگەڕاوەکان (کۆندۆتیری‌یە- Condottiere) شەهوەتێکی شەیتانیانەی هەبووە بۆ ڕابواردن و لەززەت کە هیچ شتێك لە ڕوویا نەوەستاوە، نمونەی خراپەکاری‌یەکە بەرگری ناکرێت لە جێی چینی ناوەند- هەستاوە بە هەموو خراپەکاری و ڕابواردنێك کە بە خەیاڵی ئەم چینەدا بێت وەختێ وێنای ژیانێکی بەختەوەر دەکات لە زیندە خەونەکانیدا.

خراپەکاری ئەم کەسایەتی‌یە بە ڕاددەیەکە هەندێك بە ڕاستی گومان دەکەن لە بوونی ئەم دڕندە نەفرەت لێکراوە.

٢٢-دیارە (داجو بیرفری) D. Frey کە وەسفی جیاوازی نێوان وێنای هونەر لە سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ ڕێنیسانسدا دەکات لەسەر بنەمای جیاوازی نێوان (لێکدانەوەی بە دوایەکدا هاتوو) (التفسیر المتعاقب) و (لێکدانەوەی هاوکات) (التفسیر المتزامن) بۆ جێگەی وێنەیی (للمکان التصویری) (Pictorial) پشت بەو لێکردنەوەیەی یا خود لێك جوداکردنەوەیەی ئارڤین بانۆڤسکی Erwin Panofsky دەبەستێت لە نێوان پێگەی کۆبۆوە و (مکان متجمع) aggregate پێگەی ڕێك کەوتوو (مکان نسقی) Systematic. لەبەر ئەوە بیروڕای بانوڤسکی پێش وەخت تیۆری ڤیکهۆف بە هەند وەردەگرێت لە شێوازی پەیوەست (المتصلة) Continuous و شێوازی لێك جودا (المفرقة) distinguishing لە گوزارشت کردندا، کە ڕەنگە خودی ڤیکهۆڤیش لەم تیۆریەدا کاریگەری بیرۆکەی لیسیج ی بەسەرەوە بێت دەربارەی ساتەوەختی لێوانلێو (اللحظة الحافلة) Pregnantmoment.

٢٣-ساڵی مردنی جیۆتۆیە.

٢٤-هەندێکیش لێکدانەوەیان وا نەبوو چونکە خواستی لێکچونی سروشت لە نیگارکێشاندا تەنها سروشت بە قوڵی جێگەیی بەخشین و لێك هەڵوەشاندنەوەی قاڵبە پەیوەستە ئەندازەی‌یەکان نی‌یە، بەڵکو لەو (بەها ساویانە)دایە کە لای ئۆرکانیا هەیە.

٢٥-ناوی ئەنتۆنیۆ پیزانۆیە نازناوی پیزانیللۆیە (١٣٩٨-١٤٥٠) لە ڤیرونا پەروەردە بووە، لە پێگەیشتوترین و هەڵکەوتوترین هونەرمەندی سەردەمەکەی خۆیەتی لە ئیتالیا، لەسەر ڕێساکانی هونەری غوتی بەردەوام بووە، بەرەنجامی کاریگەری شێوازی نیگارە چنراوەکان سەلیقەو وردەکاری‌یەکی تایبەتی بە دەست هێناوە لە وەسف کردن و گوزارشت کردندا، زۆربەی تابلۆکانی پۆرترێتن یاخود وێنەی پیرۆزمەندەکان. گرنگی داوە بە شێوە سروشتی‌یەکان بە زۆر جۆریانەوە، توێژینەوەی زۆری بەجێ‌هێشتووە بۆمان لەسەر شێوەی گوڵ و باڵندەو مەیمون و ئەسپ و سەگ، تەنانەت مێروش.

٢٦-دوو هونەرمەند لە فلۆرەنسادا ڕۆڵیان بینی لە بڵاوکردنەوەی چێژی هونەری کۆشکدا، کە لە سەروی ئیتالیاوە هاتبوون، ئەوانیش جینتلی دی فابریانۆ (Gentile de Fabriano) و دۆمنیکۆ ڤینیسیانۆ (Domenico Veneziano) بوون. بوونە مایەی گرنگی دانی هونەرمەندە ناوخۆیەکان بە بابەتە ڕۆمانتیکییەکان. فابریانۆ لە نموونەیترین هونەرمەندی شێوازی کورتوازی یە. تابلۆی (پەرستنی مەجوس) جوانترین بەرهەمیەتی.

٢٧-کاریگەریی ئەم هونەرە نەك هەر لە کاری هونەرمەندانی وەك فرائەنجلیکۆ FraAngelico و لۆرینزۆ مۆناکۆ (Lorenzo Monaco) ڕەنگی دابۆوە بەڵکو هونەرمەندانی پێشکەوتن خوازی وەك ئەندریادل کاستیانۆ (Andrea del Castagno) و ئۆتشێللۆ (Paolo Uccelo)شی گرتبۆوە.

٢٨-دوای هەڵبژاردن شەش هونەرمەند مانەوە بۆ پێشبڕکێکە، کۆمەڵی کالیمالا (Calimala) سەرپەرشتی پێشبڕکێ و کارەکەی دەکرد کە یەکێ بوون لەو کۆمەڵانەی یاخود لیژنانەی دەست نیشان دەکران بۆ ئەو مەبەستە. لە نێوان ئەو شەش هونەرمەندەدا (ڕۆنیللسلی و جیبرتی و جاکوبو دیلاکویرشا)ی تیابوو.

٢٩-جیوڤانی ڕۆتشێللای لەو کەسایەتیانە بوو کە بە ئاوەزێکی دنیایانەوە چاودێری هونەری دەکرد لە سەردەمی لۆرینزۆ میدتشیدا بووە، لە یادەوەرییەکانیدا نووسیویەتی "کە لە بەناوبانگترین یادەوەرییەکانە": بە درێژایی ئەم پەنجا ساڵە شتێکم نەکرد تەنیا پارە پەیداکردن و سەرف کردنی نەبێت، بە ڕوونی بۆم دەرکەوت لە پارە خەرج کردندا خۆشییەکی زۆر زیاتر هەیە لە پەیداکردنی. پیرۆزی یەزدانی و شارو کەسایەتی (خودی) لەو کڵێسایانەدا دیوەتەوە کە بوونیاتی ناون و کۆکەرەوەی تابلۆش بووە.

٣٠-دیارترین ناوێك بازرگانی ناسراو جیوڤانی دیلاپالای فلۆرەنسی بوو سەرەتای سەدەی شانزە کە کاری هونەریی بۆ مەلیکی فەرەنسی کۆدەکردەوە و دەکڕی نەك هەر لە هونەرمەندان بەڵکو لە کۆکەرەوەکانی تریش.

٣١-سەدەی حەڤدەی فەرەنسی بووە کە لویس چواردە گرنگترین ماوەی فەرمانڕەوایی کردووە.

٣٢-وەك سەرپەرشتیاری خاتوو لوکریستیا بورجا بۆ تەختی کۆشك لە نیپی (Nepi)و خاتوو ئیزابیلا دیستی (J. dEste) کە خولگەی تەختی کۆشك بوە لە فیراراو مانتوا، کاریگەریی لەسەر شاعیرەکانی دەوروبەری خۆی هەبووە و سەرباری ئەوەش خاوەن ڕۆشنبیرییەکی تایبەتی بووە دەرباری هونەری شێوەکاری.

٣٣–هونەرمەندێکی وەك پنتۆر چیۆ (Pinturicchio) کە نیگارکێشێکی زەخرەفی و ڕازێنەرەوە و زیاتر ڕووکەشی بووە، لە هەموو هونەرمەندەکانی سەردەمی خۆی (سەدەی پانزە) سەرقاڵ تر بووەو ئیشی لە هەمویان زۆرتر بووە. ئەمە وەك نمونەیەکی دیار و زیندو دەهێندرێتەوە بۆ ئاستی وشیاری هونەریی گشتی.

٣٤–بۆ نمونە ئێمە تەنها نۆ هونەرمەند دەناسین و بیستومانە دەربارەیان لەو سی و دوو هونەرمەندەی ئەتێلەی تایبەتیان هەبووە و ناویان هاتووە لە لیستی پیشەگەراکاندا لە شاری سیینا ساڵی ١٤٢٨.

٣٥–مەبەست خێزانی پیزانۆیە کە نەوە دوای نەوە چوار هونەرمەندی گەورەیان تیا هەڵکەوتووەو لە هونەری غوتیدا ئاماژەمان پێداون. بەڵام ڕۆڵی سەرەکی لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ نیکۆلا پیزانۆ.

٣٦–قەشە (ساڤونارولا) کە حاکمی شاری فلۆڕەنسا بووە ساڵی ١٤٩٧ بیروڕای گشتی جوڵاند لە فلۆڕەنسادا بە ناوی ئاین و چاکەو ئاکارەوە، هەڵگەڕانەوەیەکی دواکەوتوانەی سازداو ئاگری بەردایە بەرهەمە جوانەکانی ئاسەوارەکانی هونەری سەردەمی ڕێنیسانس، بە بیانوی ئەوەی ئەم کارانە یارمەتی دەری لەرێ لادان و سەرقاڵ کردنی خەڵکیەو دورخستنەوەیانە لە ئەرکە ئاینیەکان و تێکدانی ئاکاریی لەدوایە، هەندێ لە خەڵکان لەو کارەیدا پشتیان گرت بەڵام هێندەی بەسەرا نەچوو، دوای ساڵێك هەر خەڵکی لە هەمان جێگەی سوتاندنی ئاسەوارە هونەریەکاندا (کە مەیدانێك بوو) گریان لە خۆی بەردایەوەو سوتاندیان لەسەر ئەو کارەی.

٣٧–ئەم ناوە بەو هەرێمە وتراوە کە ئەمڕۆ بە بەلجیکاو هۆلاندە ئەناسرێت، هەرچۆن پێشی ئەوترێت هەرێمی فلمنك Flemish هەندێ سەرچاوە ئەڵمانیای ئێستاش بە بەشێکی ئەو هەرێمە دەزانن، هەندێ جاریش (فلاندەر) بەکارهاتووە.

٣٨–بروج بە پیشەسازی قوماشی خوریی ناوی دەرکردبوو، یەکەم بۆ ڕسەی مامەڵەی دارایش لە ئەوروپادا لە ئەنتۆرپ دامەزرا ساڵی ١٤٦٠.

٣٩-هەندێ جار بۆ بڵاوبوونەوەی جۆرو شێوازی نیگارکێشان ئەو وێنەی پاشاو شاژن و سوارچاکانەی بە پشتی کاغەزی یارییەوە بوون ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە لەم گواستنەوەیەدا.

٤٠-المسنح: ئەم وشەیە (نعمت اسماعیل علام) بەکاری هێناوە لە سەرچاوەی (فنون الغرب فی العصور الوسطی و النهضة و الباروك)دا، ئەم وشەیەش بە عەرەبی چەندان مانای هەیە وەك کەسایەتیەك کە لەلای ڕاستت بێت، هەر شتێ کە بەلای ڕاستتدا تێپەڕێ، مایەی گەشبینی، پێگەیەکی بەرز، بەئاگا، پیرۆز یاخود موبارەك. بەڵام لە سەرچاوەیەکی ئینگلیزی لە

ئەنتەرنێتەوە دەربارى ئەم تابلۆیە (The Ghent Altarpiece) دەقی ئینگلیزییەکەی وەها نووسراوە (In the middle of the upper tier is God Almighty, the word..) واتە لە ڕیزی سەرەوە لە ناوەندا یەزدانی خاوەن توانا، خاوەن وشە، گەوهەرو بنەڕەتی گەردون..) کەواتە ئەو کەسایەتی‌یەی نێوەند کە بەرگی سوری پۆشیوەو تاجێکی لەسەر ناوە. هێمایەکە بۆ مەزنی یەزدانی.

سەرچاوەی سودلێوەرگیراو بەم مەبەستە:

http://www.kfki.hu/~arthp/postcard.cgi?action&image=e/eyck van/Jan/09g ent

٤١-مەبەست لە تەوراتە.

٤٢-بە مامۆستای هونەرمەند و بلیمەتی ڕێنیسانس ئەلبرێخت دیورەر دادەنرێت لە هەڵکۆڵیندا.

٤٣-مەبەست لە قرمید خشتی تایبەتە بە بنمیچ، ڕەنگەکەی لە ڕەنگی کریمسۆنەوە (Crimson) یاخود قرمزی‌یەوە نزیکە کە سورێکی تێرە، هەر لە نزیکی ئەو ڕەنگەوە خشتەکەش وا ناونراوە.

٤٤-فیلیبینۆلیبی (١٤٥٧-١٥٠٤) ژیاوە و لە تابلۆکانی (تابلۆی سەرسامی مریەم بە کوڕەکەی) و (پەرستنی مەجوس).

٤٥-سەربارى ئەم تەلارسازانە دەکرێت ئاماژە بە بەناوبانگترین کۆشکی سەردەمی ڕێنیانس بدەین کە ژمارەیەك تەلارساز لە بنیات نانیدا بەشداربوونی وەك جیوفانی بارتولیمیو و ڕیتزو. ئەو کۆشکەش لە شاری ڤینیسیایەو بەناوی کۆشکی دوکالە (دوج).

هەرچۆن بارتولومیوبوت Bartolommeo Pot (١٤٦٤) لە پەیکەرساز و تەلارسازەکانی قۆناغی یەکەمە، لە ئاسەوارەکانی کۆشکی لاسادۆرۆ (Laead'Oro)یە، تەرزی کارکردنی بە کۆتایی تەرزی یۆنانی دادەنرێت، هەر ئەم تەرزە بوو لەسەر دەستی کودوتشی (Coducci) (١٤٤٠-١٥٠٤) پەرەیسەند لە کۆشکی فاندرمان دا. ئەوەدەمەی تەلارسازی ڕێنیسانس لە فلۆرەنساوە (بە هەندێ جوانکارییەوە) گوازرایەوە بۆ ڤینیسیا، پەنجەرەکان هەرچی زیاتر ئاوێتەبوون و ڕازاندنەوە دەرەکییەکان لەسەر تەرزی غوتی و کاریگەریی ڕۆژهەلاتی بوون، رووکەشی کۆشکەکان بەم گۆڕانکاریانە زیاتر سەرنج ڕاکێش بوون بە ڕاددەیەك کە لە هەموو کۆشکە ئیتالیەکانی جیادەکردنەوە.

# هونەری ڕێنیسانسی زێڕین (سەردەمی بلیمەتەکان) یاخود هونەری پێنجسەدەکان "شنکوشینتۆ" سەدەی شانزەهەم (١٥٠٠-١٦٠٠)

## پێشەکی مێژوویی:

ئیتالیای نیوەی یەکەمی سەدەی شانزە، ئیتالیایەك بوو پڕ لە کێشەی ڕامیاریی، چەندان جەنگ لە نێوان میلانۆو ناپۆلی و ڤینیسیادا هەلگیرسا، فەڕەنسییەکان دەستیان بەسەر میلانۆدا گرت لە میانی هەردوو ماوەی نێوان سالآنی (١٤٩٩-١٥١٢)، (١٥١٥-١٥٢٢)، هەرچۆن لە فلۆڕەنسا کێشەی جۆراوجۆر لەسەر دەسەڵات ڕوویدا لە نێوان خێزانی میدتشی و بەرامبەرەکانیدا لە نێوان سالآنی (١٥٠٢-١٥١٢) کە بووە مایەی جەنگێکی ناوخۆیی تیایدا فەرمانڕەوایی خێزانی میدتشی کەوتە لەرزین، تا دواتر ئەلیکسندەر میدتشی توانی دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ. بەشی سەرەوەی ئیتالیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسا لە ساڵی (١٥٢٩)دا. شا شارلی پێنجەم ساڵی ١٥٣٠ بووە ئیمپراتۆری سەر بولونیا، هەرچۆن میلانۆ کەوتە ژێر چنگی ئیسپانیەکان ساڵی ١٥٣٥. هێز و دەسەڵاتی فیراری کەوتە دەست فۆنسۆی یەکەم کە لۆکریسی بورجیای خواست. (بارما)ش خێزانی فارنیزە بەڕێوەیان دەبرد.

تواناو دەسەڵاتی پاپای ڕۆما لە کشانەوەدا بوو لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی (جولیۆی دەهەم) بە تایبەتیش دوای هێرشی ئیمپراتۆریەت بۆ سەری ساڵی ١٥٢٧.

بەڵام ئەم جەنگ و کێشانە کاریگەریی نەکردە سەر گورجوگۆڵی بزاڤی هیومانیزم، ئەوان خەریکی کۆڕگێڕانی خۆیان بوون لە شارەکانی ڤینیسیا، فیرارا، مانتوا و ڕۆما. بە هاوشانی چالاکی ئەمان گەڕان بە شوێن ئاسەوارە کۆنەکانی یۆنانی و ڕۆمانیدا هەر بەردەوام بوو، مایکل ئەنجیلۆ ئەندازیار سان جاللو چاویان بە پەیکەری (لاوکۆن Laocon)ی یۆنانی کەوت لە ساڵی ١٥٠٦دا، هەرچۆن گەرماوەکانی تیتۆس و کۆشکی زێڕینی نیرۆن دۆزرایەوە. دەرکەوتنی کتێبە بەناوبانگەکەی ماکیاڤیللی (میر) ساڵی ١٥١٣ دوابەدوای ئەو ڕووداوانەدا هات. ڤازاریش ساڵی ١٥٥٠ کتێبەکەی کە دەربارەی ژیانی هونەرمەندانی ئیتالی بوو بڵاوکردەوە، کتێبێك بوو سەراپاگیر

دەرباری تەلارسازەکان و نیگارکێشەکان و پەیکەرسازەکانی[1] ئیتالیا، یەکەمین جار بوو ژیانی هونەرمەندان بنووسرێتەوە و گرنگی پێ بدرێ.

بزاڤی هزریی و هونەریی چونە پێشەوەیەکی تێرو تەسەلی وای بە خۆوە دی لە فلۆڕەنسای ئەم سەدەیەدا، کە بووە مایەی دامەزراندنی (ئەکادیمیای ئاداب) لە ساڵی ١٥٤١ و (ئەکادیمیای نیگارکێشان) لە ساڵی ١٥٦٢، کە یەکەمین ئەکادیمیای زانستی بوو بۆ خوێندنی هونەری نیگارکێشان لە جیهاندا. سەرباری دامەزراندنی ئەکادیمیاکانی هونەر و ئەدەب لە لایەن خێزانی میدتشییەوە، ئەم خێزانە دەرگای کتێبخانە بە نرخەکەیان بە ڕووی جەماوەردا کردەوە لە ساڵی ١٥٤٨.

بیری بە ئەرشیف کردن و تۆمارکردن بلاوبۆوە بەرئەنجامی ئەو دۆزینەوە زۆرانەی لە ئاسەواری ڕۆمانی کۆندا کرا، ئەدیب و ڕۆشنبیرەکان بیریان لەوە کردەوە پاشکۆ کۆنەکانیان کۆکەنەوە لە بینای (بلفدیر)دا لە میانی ساڵانی (١٥٠٥-١٥٥٠). هەرچۆن بیرۆکەی نووسین لە مێژووی هونەردا پێگەیشت، ژمارەی نووسەرو دانەرانی بوارە جیاجیاکانی شێوەکاری ڕوو لە زیادبوون بوو، لیۆناردۆ "نامەیەك لە بابەتی نیگارکێشاندا"ی نووسی و هونەرمەندە تەلارسازەکانیش وەکو "ڤینیولا Vignola" لە ساڵی ١٥٣٠داو "سیرلیو Serelio" لە ساڵی ١٥٣٧داو "پلادیو Palladio" لە ساڵی ١٥٧٠دا، دەرباری تەلارسازی بابەتهایەکی جیاوازیان نووسی. دواتریش "سیللینی Celleni" یادەوەری و لێکۆڵینەوەکانی لە هونەری کارسازی ئالتونیدا بلاوکردەوە. بەلام لە هەموویان گرنگ تر هەر کتێبەکەی ڤازاری بوو دەرباری ژیانی هونەرمەندە ئیتالیەکان.

شاری فلۆڕەنسا (شاری گوڵان) ناوازەترین سەرکەوتنەکانی تۆمارکرد لە بواری هزر و هونەری ڕێنیسانسدا، ڕۆڵ و گەورەیی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی میدتشی و بە تایبەت لۆرینزۆ کە بە سەرکردەی یۆنانی (بیرکلیس) دەچوێنرێت لە ئالودەبوونیدا بە هونەر و فەلسەفەو پشتگیری و پاڵ گرتنی ئەوانەی کاری تیائەکەن. وەك ڤازاری دەیگێڕێتەوە فلۆڕەنسا لە سایەی فەرمانڕەوایی لۆرینزۆدا کە بە جەسورترین میر لە کارکردنیداو بە میهرترین لە بەخشندەیدا، نازناوی لۆرینزۆی (شانازی)یان (مانیفیکۆ) پێ بەخشی بوو. هونەرو ئەدەب لە سایەی ئەودا سەریدا لە بەرزترین سەروەریەکانی، وڵاتیش بووە خاوەن گوڵبژێرێکی توانا لە بن نەهاتوی داهێنەران، کە دواتر بەهرەمەندی و تواناو سەلیقەی ئەفراندیان لە فلۆڕەنساوە ڤیسنیای گرتەوەو دواتریش لە ڕۆمادا جێگیر بوو.

ئەم بزاڤە نوێیە گەیشتە لوتکەی کەماڵ و توانـای گەشەسـەندن لـە سـەردەمی ڕێنیسانسـدا بە مانایەکی تر لە میانی کلاسیکی‌یەتی سـەردەمی ڕێنیسانسـدا. هـەر لەبـەر ئـەم هۆیـەش بـوو بـەم ماوەیـەی نێـوان (١٥٠٠ بـۆ ١٥٥٠) وتـرا سـەردەمی زێڕینـی ڕێنیسـانس، یــاخود ڕێنیسانسـی زێڕین. ئەم بزاڤەو گواستنەوەی شۆڕشی ئـایدیۆلۆجی خـۆی شۆڕشـێکی مـەزنی هـزری بـوو کـە ڕێچکەی ژیــانی ئــەوروپی گــۆڕی بــۆ ســەردەمێکی بــاڵا، لــەم بەشــی دووەمــەی ڕێنیسانســدا هونەرمەندانێ کە بۆیان لـوا هـەردوو سـەردەمەکە ببینـن هەڵکشان بـەرەو لوتکـەو بـە لایـەکی تریش چەندان بلیمەتی نوێ لە دایك بوون، ئیتالیای ئەو دەمە لە بـەناوبانگترین بلیمەتـەکانی هونـەری هێنایـە بـوون کـە بوونـە هـۆی نـەمری نـاوی ئـەو وڵاتـە لـە مێـژوودا، وەك داڤنشـی و برامـانتی و مـایکل ئـەنجیلۆ و رافـائیل. هـەر ئـەفراندنی ئــەم ســەردەمە ڕێخۆشــکەر بــوو بــۆ والابوونی دەروازەی سەردەمێکی تر کە بە سەرەتای سەردەمی نوێ ناوزەد دەکرێت.

گـەر خـودی ڕێنیسـانس سـیمای زیندوکردنـەوەی کـۆن و پەیوەسـت کردنـەوەی بـە تەوژمـە نوێکانـەوە لـەخۆگرتبێ، ئـەوا ئـەم سـەردەمە ئـەفراندنی هونــەری خســتە خولگــەی چــالاکی هزری‌یەوە، لێرەشەوە هەموو ئاراستەکان کرانـە هونەرمـەند و کەسـایەتی‌یەکەی، ئـەو خاڵـەش دڵنیابوو کە کاری هونەریی بەرهەمی سەرچاوەی بەهرەیەو زادەی بلیمەتیەتی.

ناوی بلیمەتەکانی ئەم دەمە لە ڕەهەندەکانی سەردەمی خۆیـاندا تێپـەڕیان کـردو سـنوریان شکاند.

هەربۆیـە ئـەم دەمـە هێنـدەی بـەناوی کەسـایەتی‌یەکانی دەناسـرێت و باسـی لێـوە دەکرێـت هێند بەپێی وڵات و قوتابخانە هونەریەکان ناویان نایەت، ئێمە لە سەدەی شـانزەدا لـە بـەردەم سەردەمی بلیمەتەکاندایین، وڵاتەکان و پێگەکانیش شتێك نین تەنـها ناسـینەوەی شـوێن نـەبێت کە ئەو بلیمەتانەی تیا ژیاون و ئاسەواریان تیا بەجێ‌هێشتووە.

ناوەکان ســەرو وڵات و شـوێن و پێگـەو زەمەنـەکان کـەوت، هـەتا ئـەمڕۆش ئـەو ئاسـەوارانە زەمـەن دەبـڕن سـنور دەبـەزێنن سـنوری شـوێکات، لەگـەڵ نـەوە لـە دوایەکـەکانی مرۆڤایـەتیدا دەدوێن.

هـەرچی چۆنێـك بێـت هـێزو توانـای کەسـایەتی‌یەکانی ئـەم سـەردەمە- گـەر بــە دوای بریسکەیاندا نەچین- پێگەو پرشنگدانەوەی هونەری ڕێنیسانسمان بیرنابەنەوە.

سـەدەی شـانزەهەم سـەردەمی زێڕینـی ئیتالیـا بـوو -پێـش هـەموو شـتێك- تیـایدا هونــەری شێوەکاری بە هەموو جۆرەکانیەوە پەرەیسەند بەرادەیەك کە مێژووی هونـەر پێـش ئـەوە بـە خۆیەوە نەدیبوو، بەلام هونەری نیگارکێشان میانەیەك بوو یاخود یەکەمین میانەیەك بوو کـە

بە سەرەکی بەشداری کرد لەو دەوڵەمەندییە هونەرییەی ڕێنیسانسی زێڕیندا. هەرچۆن تەلارسازی بۆ هونەرەکانی ڕۆمانسك و غوتی بواری سەرەکی بوو، پەیکەرسازیش بۆ سەدەی پانزەهەم لە بواری سەرەکی و سەرەتایی بوو. هەر لەم سەدەیەدا بوو مەسیحیەت و هونەری بێباوەڕی کۆن لێکیان دا، سەردەمی پاپای لیۆی دەهەم بە سەردەمی برکلیس ئەچوێندرا، سەرباری دەسەڵاتی تیۆریە ڕامیاریەکانی میکاڤیلی و فرانسوا جیشاردان، دۆزینەوەی جوگرافیە ناوازەکانیشی گرتبۆوە.

ئەم سەردەمە لە هەموو لایەکەوە بینگەی هزری لەخۆ گرتووە، هەرچەندە کێشە ئاینی و ڕامیاری و ئابوریەکانی دەوریان دابوو لێنەدەگەڕان. تێبینی گۆڕانی دیدنیگای هونەرمەندەکان دەکەین بۆ کێشەکانی هونەر و جوانی و پەیوەستیان بە خواستی هیومانیزمەوە، هونەرمەندانێ پەیدابوون گرنگییان بە گەڕان بە شوێن ڕاستی واقعدا دەدا هەرچۆن دەگەڕان بە دوای جوانی ڕاستەقینەدا لە میانی توێژینەوە زانستی و تیۆریەکاندا لە بری ئەوەی تەنها خۆ خەریك بکەن بەو دووبارەکردنەوەیەی ئەو لاساییانەوە کە پێشتر باوبوون. هەڵبەتە ئێمە نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت ئەو پەرەسەندنەی لە فەلسەفەی هزری مرۆڤدا ڕوویدا، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆزینەوانەی پێشتر هونەرمەندانی ئیتالی لە سەدەی پانزەدا بە دەستیان هێنابوو.

گەر بە واتایەکی تر بڵێین سەدەی شانزەهەم جێگیرکردن و چەسپاندنی ئەو خواست و بەدواداچونانە بوو کە لە سەدەی پانزەدا هونەر بە دوایدا دەگەڕا.

## ڕۆڵی ڕۆما لە گەشەسەندنی هونەری ڕێنیسانسی زێڕیندا:

پێشتر ئاماژەمان بە گۆڕانکاری ڕۆڵی شارەکان دا لە ئیتالیای ئەم سەدەیەدا، کە لە فلۆرەنساوە بەرەو ڤینیسیاو دواتر لە ڕۆمادا گیرسایەوە، چون چیتر هێزی پاڵپێوەنەری هونەر سەرچاوەکەی لە فلۆرەنساوە نەبوو. لە دەرەوەی فلۆرەنسا چەندان خێزانی خاوەن خواستی مەلیکی هەبوو، ڕێسای ژیانی دانیشتوانی کۆشکەکانیان گرتبووە بەر و سەراپای ئیتالیایان گرتبۆوە، بەڵام لەنێو ئاپورەی ئەم هەموو تواناو سامانەدا هێشتا تەختی پاشایەتی جیدی پێش هەموو شتێك هەر لە دەوری خودی کەسایەتی پاپا کۆببۆوە لە ڕۆما، لەوێ هەمان ئەو نمونە باڵایانە باوبوو کە لە هەموو تەختە پاشایەتییەکانی تردا پەیرەو دەکرا کە هونەر و ڕۆشنبیری وەك توخمهایەکی جوانی و شکۆ بەخش بە ڕووکەشی ژیان تەماشا دەکرا.

مێژووی ئەم گەشەسەندنە لەسەر دەستی پاپاکاندا لە ڕۆما، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی پاپاکان لە فەرەنساوە گەڕانەوە ڕۆما، ئەو دەمە ڕۆما هەر لە کەلاوەیەك دەچوو، بەرئەنجامی

ئەو داگیرکارییە هەمەجی و کارەسات و کاول کارییەی تیاکرابوو لە میانی ئەو شەڕوو جەنگانەدا کە ماوەی سەدەیەکی خایاندبوو لە نێوان خێزانە ڕۆمانیە گەورەکاندا. خەڵکی ڕۆما هەژار بوون، تەنانەت گەورەپیاوانی کلێسا دەستەوسان بوون لە کۆکردنەوەی سامانێکدا کە بەشی گۆڕانکاری و چاکردنەوەو لە هەمان کاتدا بەدی هێنانی بزافێکی زیندوکردنەوەی هونەر بکات، تا بە شانی فلۆڕەنسادا بگاتەوە.

ساتەوەختی دەسەڵاتداری ڕامیاری پاپاکان ساتەوەختی ئیتالیایەکی هەڵوەشاو و کەرت بووبوو. بۆیە زووبەزوو ئەم بارەیان قۆستەوەو دەستیان بەسەر ئیتالیادا گرت، پاپاکان وا هەستیان دەکرد میراتگری ئیمپراتۆرەکانی ڕۆمان، هەرچۆن سودیان لەو هیوا ئەندێشەییانە وەرگرت بۆ گێڕانەوەی شکۆداریی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کۆن، ئەم هیوایەشیان لە هەموو سوچێکی وڵاتدا بڵاوکردبۆوە، بەمەش بەڵێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا (گەرچی سەرکەوتنێکی هەمەکی نەبوو) لە پانوپۆڕ بوونی دەسەڵاتیاندا.

ڕاستە هەموو هەوڵە ڕامیاریەکانیان سەری نەگرت، بەڵام ڕۆما بووە پێگەو چەقی سەرەکی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی و کاریگەریی ئاوەزیی هەرچی زیاتریشی کرد لەسەرو وەختی دژە ڕیفۆرمەدا (Counter Reformation) کە ئەم بزاڤە وایکرد ڕۆڵی ڕۆماو پێگەی خاوەن کاریگەرییەکی قوڵتر بن. ئەم کاریگەریەشی تا بەشێکی باش لە سەردەمی باڕۆك درێژ بۆوە. هەر لە گەڕانەوەی پاپاکان لە ئەڤینۆن چیتر ئەم شارە تەنها پێگەیەکی چاوپێکەوتنی دیبلۆماسی نەما بۆ کۆبوونەوەی سەفیرو کارگێڕەکان لەسەرانسەری جیهانی مەسیحیەوە، بەڵکو بووە بازاڕێکی دارایی گرنگ کە بڕی پارەی وەهای بۆ دەهات و تیا خەرج دەکرا بۆ ئەو دەمە شتێك بوو خەیاڵی. دەسەڵاتی پاپا لە ڕۆما وەك هێزێکی دارایی توانی زاڵ بێت بەسەر هەموو میرەکانی سەروی ئیتالیاو سەرکردەو پیاوانی بانك و بازرگانەکانیدا، تەنها خۆی دەیتوانی بە هێندایی هەمویان پارە لە بواری ڕۆشنبیریدا خەرج بکات و بگرە زیاتریش، بەمەش جڵەوی هونەر کەوتە دەست ڕۆما، دوای ئەوەی بەدەست فلۆڕەنساوە بوو.

هەرچەندە لە سەدەی پانزەدا [تەنانەت لە سەردەمی سکستۆسی چوارەمیشدا (١٤٧١-١٤٨٤)] بنکەی پاپەوی لە ڕۆما خاوەنی هیچ هونەرمەندێکی خەڵکی ڕۆما نەبوو، بۆ مەبەستی کاروبەرهەمی هونەریش پشتیان بە وزەی دەرەکی دەبەست، لە بەناوبانگترین هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمەیان بانگهێشت دەکرد بۆ کارکردن لە نمونەی مازاتشۆ، جنتیلی دی فابریانۆ، دۆناتێللۆ، فرائەنجلیکۆ، بنوتسو گۆزۆلی، میلۆزۆ دا فۆرلی (Melozzo da Forli)، بنتۆرکیۆو،

مانتێنـا. بـەڵام ئـەم هونەرمەندانـە گشـت لـە دوای تـەواوکردنی ئەرکـەکانیان شـارەکەیان جێدەهێشت بێئەوەی سادەترین ئاسەوار جگە لە کارەکانیان لە پاش خۆیان بەجێ بهێڵن.

هەرچـەند ئـەو ماوانـە ئـەم شارە وەك چـەقێکی بەرهـەم هێنـانی هونـەریی بـوو بـەڵام نەیگەیاندە ئەو ئاستەی قوتابخانەیەکی هونەریی یاخود ڕێبـازێکی هونـەریی تیـا بەدەرکـەوێت کە خاوەن مۆرك و سیمایەکی ڕۆمانی خۆجێیەتی بێت.

پەیدابوونی ڕێبـازێکی لـەو جۆرە بەدەرنەکـەوت تـا سـەردەمی پاپەویـەتی یولیۆسـی دووەم (١٥٠٣-١٥١٣) دوای جێگیربوونی برامانتی و مایکل ئەنجیلۆ و دواتریش رافاییل، کە هەموو تواناو شارەزایی و بەهرەی خۆیان خستە خزمەتی پاپاوە. ئەمەش سەرەتای یەکەم بوو بۆ ئـەو مـاوە پڕ چالاکییە هونەریە ناوازەیەی کە بەرەنجامەکەی بەو ئاسـەوارە بـە نـرخ و باڵایانـە هـات لـە ڕۆما. ئەوانەش ئاسەوارهایەکن مەزنترین گەواهی -بەڵکو تاکە گەواهی- دەدەن لەسەر مەزنێتی و لوتکـەی سـەردەمی ڕێنیسـانس، کـە نـەدەکرا ئــەم مەزنێتیــە بێتــە بــوون تەنـها بــەو بــارە ڕەخساوەی بنەکەی پاپەویەت نەبێت.

ئەم ماوەیە بوو بە سـەرەتای پێگەیشـتنی هونـەرێکی کڵێسـایی نـوێ لـە بەرامبـەر هونـەری سەدەی پانزەدا -کە ڕێڕەوی بنەڕەتی دنیایی بـوو-. لەگەڵ ئەمانەشـدا زۆری گرنگـی دانـی ئـەم هونەرە لە بەها ڕۆحانیەکاندا نەبوو کە لە سەروی ئەم جیهانەوەیــە، بـەڵکو تـەرخانی ویقـار و باڵایی و کەشخەیی و شکۆمەندی کرابوو، هێمنیەکی هەڵکشاو و بەرز جێی هەستێکی مەسیحی گرتـەوە دەربـاری ئـەو دنیـا کـە قـوڵ ڕۆچوبـووە دەرونـی مرۆڤایەتییـەوە. ئەمــەش بـۆ خـۆی گوزارشتێك بوو لە باڵابوونی جەستەیی سەرباری ئاوەزیی.

مەبەستی سەرەکی پاپاکان لەهەر کڵێسایەکی گەورەو بچووك‌و، قوربانگەیـەك و فوارەیـەکی شۆردنگە، بە دەست هێنانی نەمریی بوو بـۆ خـودی خۆیـان، بـە ڕاددەیـەك هێنـدەی بیریـان لـە شکۆمەند ڕاگرتنی خۆیان دەکردەوە هێند سەرقاڵی شکۆمەندی یەزدان نەبوون.

لە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی لیـۆی دەهـەمدا (١٥١٣-١٥٢١) ژیـانی تـەختی فـەرمانڕەوایی ڕۆمـا گەیشتە چڵەپۆپەی. ئەنجومەنی پاپەوی هەر لە تەختی ئیمپراتۆری دەکرد،ماڵی کاردیناڵـەکان لە شێوەو ڕازاندنەوەیاندا نزیك بوو لە کۆشکی بچوکی ئەمیرەکانی ئەو دەمەوە، ماڵی پێشـڕەوە ڕۆحانیـەکانیش لــە ماڵــە ئەرســتۆکراتیەکان دەچــوو کەلــە نێوانیــاندا پێشـبڕکێی جوانــی و کەشخەییان دەکرد.

زۆربەی کارگێڕی کڵێساکان و پێشـەوا ئاینییـە لوتکـەکان وابەسـتەی هونـەر بـوون هـەر لـە سەرەتاوە، هونەرمەندانیان لە پێناو نـەمری نـاوی خۆیـاندا بـەکارهێنا، جا لـە ڕێی پێشکەش

کردنی دیاریەوە بێت بە هونەری کڵێساکان یاخود لە ڕێی بوونیات نانی کۆشکەکانیان و ڕازاندنەوەی بێت.

پیاوانی دەوڵەمەندی بانکەکانیش بە دەستێکی تر [لە سەرو هەموشیانەوە ئاجوستینۆ چیجی (Agostino Chigi) هاوڕێی رافاییل و پەروەردگاری] لە پێشبڕکێدا بوون بەرامبەر پیاوانی ئاینی بۆ چاودێری کردنی هونەر، بەمەش لە بەهای ڕۆمایان زیادکرد وەك بازاڕێکی هونەر، بە پێچەوانەی چینە دەسەڵاتدارەکانی شارەکانی تری ئیتالیاوە (بە تایبەت فلۆڕەنسا) کە بە شێوەیەکی گشتی هاویەك بوون، چینی باڵای ڕۆما لە سێ دەستە پێك هاتبوو:

یەکەمیان: ماڵی پاپاو خێزان و خزمەکانیو، پیاوانی پلەبەرزی ئاینیو، دیبلۆماسیە ئیتالی و هەندەرانیەکان و کەسایەتی زۆری تر کە خاوەن بەشی خۆیان بوون لە شاکارە پاپەویەتەکاندا. ئەندامانی ئەم دەستەیە سەراپا لە پشتگیریی کەرەکانی هونەربوون خاوەن خواستێکی باڵاو لە مەزنترینی ساماندارەکان بوون.

دووەمیان: پیاوانی گەورەی بانك و بازرگانە دەوڵەمەندەکانی دەگرتەوە کە باروزروفی خەرجکردنی پارە بەو لێشاوەی ڕۆما لە خزمەت دەوڵەمەند بوون و سودو قازانجی ئەواندا بوو. بۆ نمونە ئالتوڤیتی Altoviti لە زیاترین دۆستەکانی هونەر بوو لە بەخشینی ساماندا لە سەرانسەری ئەو سەردەمەدا. تا لە بەناوبانگترین هونەرمەندانی ئەو سەردەمە جگە لە مایکل ئەنجیلۆ کاریان بۆ ئاجوستینۆ چیجی کردووە[٢].

سێهەمیان: لە ئەندامانی خێزانە ڕۆمانیە کۆنە ڕەسەنەکان پێك هاتووەو هەژاری بەرەنجامی باری ئابوری نوێ باڵی کێشاوە بەسەریانداو هیچ ڕۆڵێکیان لە ژیانی هونەریدا بۆ نەمابۆوە، تاکە شتێ بۆ مانەوەی خۆی کردبێتی هاوسەری کردنی کوڕو کچەکانیانە بە خێزانە دەوڵەمەندەکان، هەر ئەمەش هاوشێوەی ئەو تێکەڵاوبوونەی دروست کرد کە لە میانی سەردەمی پێشوی فلۆڕەنساو شارەکانی تری ئیتالیا ڕوویدا بە هاوبەشی کردنی چینی پیاوماقوڵە کۆنەکان لە چالاکیە ئابوریەکانی چینی ناوەندا.

لە سەرەتای سەردەمی یولیوسی دووەمدا ژمارەی نیگارکێشە ئامادەبووەکان لە ڕۆمادا خۆی دەدا لە هەشت بۆ دە نیگارکێش کە دەکرێت بە ناو دەستنیشانیان بکرێت، بەڵام بیست و پێنج ساڵی پێنەچوو کە سەدو بیست و چوار نیگارکێش تەنها لە دەستەی پیرۆزمەند لۆقادا کاریان دەکرد.

بەشێکی زۆر لەم ژمارانە پیشەگەر بوون و داواکاری تەختی پاپا ڕایکێشابوونە ئەوێ ئەمە جگە لە داواکاری بۆرجوازیەتی دەوڵەمەند، ئەم هونەرمەندانە لە گشت لایەکی ئیتالیاوە دائەبارینە نێو ڕۆما.

بەلاّم ڕۆڵی پیاوانی ئاینی و بانکەکان هەرچی چەندێ بێت لە گرنگیدا وەك خاوەنی کارەکان، ئەو سیمایەی هونەری نێوەندی ڕێنیسانس زۆر بە ڕوونی جیائەکاتەوە کارکردنی بە تەنهای مایکل ئەنجیلۆیە لە ڤاتیکان. زۆربەی کارەکانی رافاییل تایبەت بوون بە خۆی واتە بۆ خۆی تەرخان بوون لە کارکردنیاندا. ئەم ڕاستیەش گرنگیەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لە پەرەسەندنی شێوازی کارکردنی ئەو سەردەمەدا، ئەم شێوازەش تەنها لە خزمەت کردنی پاپادا لە تواناداا بوو بەدەربکەوێ کە شێوازێکی بالاّبوو (maniere grande) ڕێڕەوە هونەریەکانی قوتابخانە ناوخۆییەکانی تر لە چاویدا بە مۆرکێکی ناوچەگەرایی خاوەن پلەهایەکی جیاواز دەرئەکەوتن.

## ڕووەو خواستێکی کلاسیکی:

مەرگ ڕێگەی نەدا لۆرینزۆمیدتشی پێ بنێتە سەدەی شانزەهەمەوە، بە چەند ساڵێکی کەم بەر لە دەستپێکردنی ئەم سەدەیە لۆرینزۆ گیانی سپاردبوو، جێگرەکەشی دوورخرایەوەو هەرچی هەڵگری ئالاّشە "Gonfaloniere" پیترۆسۆدرینی ولاّتی بە ئاڤارێکی بۆرژوازیدا برد. بەلاّم لەگەڵ ئەمانەشدا پێشتر هۆکارهایەکی ڕیخۆشکەر هەبوون بۆ گۆڕانکاری بەرەو شێوازێکی هونەری کورتوازی (Courtly) نمایشگەرای فۆرمالیستی وردەکار، سەرەتاگەلەکانی ئاڕاستەکراو بۆ چێژێکی بلاّوی نوێ دانرابوو و توانیبوی دانپیانێکی گشتیش بۆ خۆی بەدەست بێنێت، تەنها شتێك کە بۆ پەرەسەندن مایەوە گرتنی هەمان ڕێگە بوو، بێ هیچ پاڵ پێوەنەرێکی نوێی دەرەکی. ئەم ڕێڕەوە لە بنەمایدا پارێزگارا بوو لەبەر ئەوەی ڕووەو یاسایەکی فۆرمی هەتاهەتایی پەیت دەچوو، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پێشکەوتن خواز بوو بەوپێیەی هەڵوێستێکی شێوازگەرای سەردەمەکەی خۆی بوو.

ئەم شێوازە وەختێ لە شاکارەکانی ڕۆمادا خۆی گەیاندە چڵەپۆپە، لە وێنەی ئەم شێوازە بەرز و ناوازەیە لە هیچ جێگەیەکی تردا بەرچاو نەدەکەوت، چون توخمەکانی ڕۆشنبیری و زانست بە قوڵاییدا ڕۆچوبوون، ئەمە بێ لەو ئاستەی لە چارەسەرکردنی کێشە باڵاکانی قاڵبی هونەریدا تیا ڕاوەستابوو. گەر لە هونەری ڕێنیسانسی پێشکەوتودا خەڵکی گشتی تێگەیشتنێکی (هیچ نەبێت) خوارو خێچیان بۆ هونەر هەبووبێت و هەندێ خاڵی کەمی پێك گەیشتنیان لەگەڵیدا بووبێت، ئەوا لەم هونەرە نوێیەدا جەماوەر هەموو پەیوەستیەکی لەگەڵ هونەردا لە

دەست دا، هونەری نوێ هیچ پابەندییەکی لە دوتوێی خۆیدا بۆ خەڵکی هەڵنەگرتبوو. ئەبێت کارێکی وەکو "فوتابخانەی ئەسینا"ی رافاییل چ مانایەکی بۆهەلگرتبن، یاخود (Sybils)ی مایکل ئەنجیلۆ، ئەمەش لە کاتێکدا گەر دەرفەتی ئەوەیان بۆ لوابێت چاویان بەم کارانە بکەوێت؟!

لە واقعدا خودی نمونەی ئەم کارانە هونەری کلاسیکی سەردەمی ڕێنیسانسی تیا ئەفرا، ئەو هونەرەی وای ڕاهێنایین گشتگیرییەك ببەخشینە ماناکانی، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاڕاستەی جەماوەرێکی بچوکی وا کرابوو کە لە هەموو ئەو جەماوەرانە بچوکتر بوو کە پێشتر هونەر دیالۆگی لەگەڵ کردبوون. تەنانەت کاریگەری جەماوەریی ئەم لە کاریگەریی جەماوەریی خواستی کلاسیکی یۆنانی سنوردارتر بوو، گەرچی هەردوکیان لە سیفەتێکی دیاریکراودا هاوبەش بوون: ئەویش سەرباری مەیلی بەلای شێوازگەرای ڕازاوەدا "Stylization"، دەستبەرداری ڕێبازگەلە لێکچووەکانی لەگەڵ سروشتدا نەبوو کە زاڵێتییەکی خۆی هەبوو لە ماوەی پێشوودا، بەڵکو بە پێچەوانەوە کاری لەسەر قوڵکردنەوەی ئەو ڕێبازگەلە کردو هەرچی زیاتر پەیت کردنەوەی. هەروەك چۆن پەیکەرەکانی پارسینۆن جیایە بەوەی ڕاستترو هەرچی زیاتر هاویەکە لەگەڵ ئەزمونی ئاساییماندا لە چاو پەیکەرەکانی دەروازەی پەرستگەی زیۆس یاخود ئۆلیمبا وەك نمونەیەك، هەمان شت بابەتە تاکیەکانی نێوکارەکانی رافاییل و مایکل ئەنجیلۆ بە شێوەیەکی هەرچی زیاتر نزیك لە سروشتەوە چارەسەرکراون، ئازادتر و واقعی ترن لە بابەتی هونەرمەندەکانی سەدەی پانزەهەم.

لە هەموو هونەری نیگارکێشانی ئیتالیای پێش لیۆناردۆ داڤنشیدا فۆرمێکی مرۆڤ بەدی ناکەیت شتێکی دزێو یا ڕەق هەڵاتو یاخود گرژبووی لەخۆ نەگرتبێت، گەر بەراوردی بکەین بەو فۆرمە مرۆڤیانەی کە رافاییل و فرابارتولومیو و ئەندریا دل سارتۆو تیسیان و مایکل ئەنجیلۆ نیگاریان کێشاوە. ئەو فۆرمە مرۆڤیانەی لە سەردەمی ڕێنیسانسی پێشکەوتودا بەرجەستە دەکران، هەرچی چەندێ دەوڵەمەند بێت لە وردەکارییدا، هەرگیز لەسەر پێی خۆی بە باوەڕو پتەوییەوە ناوەستێ، جوڵەکانیان هەردەم پڕ جۆش و خرۆشە، پەلوپۆکانی زەدەدار و لاوازو چروکە لە جومگەکانیدا، پەیوەندیشی بە جێگەی دەوروپشتیەوە هەمیشە پەیوەندیەکی نارێك و دژە، ئەو ڕێگەیەی پێی شێوە کراوە ناسروشتییە، ڕووناکیەکەشی دەستکردە. ئەو هەوڵانەی بۆ هاوشێوە بوون لەگەڵ سروشتدا درا لە سەدەی پانزەدا بەرهەمی نەبوو تا سەدەی شانزە کە تیا گەیشتە ئەنجامی خواستراوی خۆی. بەڵام ئەمە ناکاتە یەکسان بوونی هەموو شێوازی کارکردنی سەدەی شانزە، بەڵکو لە پرۆسێسی ڕازاندنەوەی شێوازگەرا

(Stylization)یشدا هەمان شت خۆی دەنوێنێت، کە بووە ئەفراندنی هونەرێکی کلاسیکی لە ناوەڕاستی سەردەمی ڕێنیسانسدا و پێشتر سەرەتای لە نیوەی سەدەی پانزەوە گرتبوو.

ئەلبێرتی بە خاوەن گرنگترین چەمکی نێو چەمکەکانی خواستی کلاسیکی دادەنرێت، ئەویش بەو پێناسەیەی بۆ جوانی کردی کە بریتییە لە ڕێککەوتن و گونجاندنی هەموو بەشەکان. ئەو وا لێکی دەداتەوە کە کاری هونەریی بە شێوەیەکی وا پێك هاتووە (یاخود پێك دێت) کە ئەستەمە بەشێکی لێ لابرێت یاخود جیابکرێتەوە، یا بخرێتە سەری بەبێ ئەوەی زیان بە جوانی گشتی بگەیەنێت. ئەم بیرۆکەیە[٣] لەسەر جوانی بوو بە یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی تیۆری کلاسیکی لە هونەردا.

بەلام چۆن هاوسەنگی دەکرێت لە نێوان ڕێککەوتنێکی ڕێژەیی لە فەلسەفەی هونەری ڕێنیسانسداو لە نێوان ئەو گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیانەیەی لە خودی ئەو سەردەمەدا ڕوویان دا؟

هەڵبەتە مەبەست لە (ڕێککەوتنی ڕێژەیی) ئەو ڕێککەوتنەیە لە نێوان سەرەتا گرتنی خواستی کلاسیکی لە سەدەی پانزەهەمەوەو بەردەوام بوونی خواستی لێکچونە لەگەڵ سروشت لە سەدەی شانزەدا.

ڕێنیسانس لە ماوەی نێوەندیدا پارێزگاری لە ڕۆحی دڵسۆز بوونی خۆی بۆ سروشت کرد و پێودانگە ئەزمونیەکانیشی هێشتەوە بۆ ڕاستیەکی جوانی، نەك هێندەو بەس بەڵکو زیاتر توندوتۆڵی کردن. هۆی ئاشکرا بۆ ئەمە ئەوەیە ئەم سەردەمە، هەروەك سەردەمی کلاسیکی یۆنانی -سەرباری هەموو ڕێبازهایەکی پارێزگەرا کە لە خۆی گرتووە- ماوەیەکی دینامی دەنوێنێت کە تیایدا پرۆسێسی بەرزبوونەوە لە پلەی کۆمەڵایەتیدا کامڵ نەبووبوو، لە بارێکی وەهاشدا ئەستەمە هیچ ڕێساو دانراوێك ببێتە دوا ڕێساو دانراوی دیاریکراو و گەشە بکات. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدان بۆ دانانی ئاستێك و ڕاددەیەك بۆ پرۆسێسی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و ڕێگرتن لەهەر بەرزبوونەوەیەکی تری پلەی کۆمەڵایەتی، هاوشان دەڕۆیشت لە سەرەتای گەشەسەندنی چینی ناوەند و تێکەڵ بوونی بە چینی خانەوادە باڵاکان، لەسەر ئەم ڕێڕەوەوە دەتوانین هۆکاری سەرەتای سەرهەڵدانی تێگەیشتنی کلاسیکی بۆ هونەر لێك بدەینەوە لە سەدەی پانزەدا.

گەر گۆڕانکاری لە خواستی لێکچون لەگەڵ سروشت بۆ خواستی کلاسیکی هەروا بە خێرایی ڕووی نەدابێت، بەڵکو چەندان پێشەکی ڕێخۆشکەرییان بۆ کردبێت لە پێشترەوە بە ماوەیەکی درێژ، ئەمە وا دەکات بە ئاسانی مرۆڤ بکەوێتە هەڵەوە لە تێگەیشتنی هەر پرۆسێسێکی گۆڕانکاری سەرەکی کە ئەو دەمە ڕوویدابێت. ئەمەش لەبەرئەوەی گەر مرۆڤ سەرنجەکانی

پەیت کاتەوە بە ئاڕاستەی ئەو نیشانانەی گۆڕانکاری داهاتوو دەست نیشان دەکەن، سەرەتا لەو دیاردە گواستراوانەوە دەست پێ بکەین کە بۆ نمونە لە هونەری لیۆناردۆ و بیرجینۆدا هەیە، وا هەست دەکەین گۆڕانکاریەکان بەردەوام بوون بێ پچڕان، بەمەش هەست بە شێوەیەك لە حەتمیەتی لۆژیکی دەکەین و هونەری میانی نێوەندی ڕێنیسانس بە بەلەمێ تێئەگەین کە هەموو دەست کەوتەکان و بەرەنجامەکانی سەدەی پانزەی لەخۆ گرتبێ. بە دەستەواژەیەکی تر مرۆڤ بە ئاسانی دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە بڵێ پەرەسەندن و گۆڕانکاریەکان لە هەردوو شێوازەکەدا پەرەسەندن و گۆڕانکاریەکی ناوەکی پەیتە. گەر بڕووانینە ئەو گۆڕانکاریانەی لە هونەری کلاسیکی کۆنەوە بۆ هونەری مەسیحی ڕوویداوە، یاخود لە هونەری ڕۆمانسکیەوە بۆ هونەری غوتی، توخمهایەکی سەرەکی نوێی وا هاتۆتە ناوەوەو بە زۆریەکی وەها کە ئەستەمە لێکدانەوەی شێوازە نوێکەیان لەسەر بنەمای گۆڕانکاری و پەرەسەندنی ناوەکی بکەین -واتە بەو پێیەی تەنها چەند دژێکی لەخۆ گرتبێ یاخود ئاوێتەیەکی دیالێکتیکی شێوازە کۆنەکە بێت- بەڵکو دەبێت لەم بارەدا لێکدانەوەکانمان لەسەر هۆکارهایەك بنیات نابێت بە دوور لە هۆکاری هونەری و شێوازیی تایبەت.

بەڵام حاڵەتی گۆڕانکاریەکان لە سەدەی پانزەوە بۆ سەدەی شانزە جیاوازە، لێرەدا گۆڕانکاری لە شێوازدا بەبێ هیچ جۆرە پچڕانێکی ئەوتۆ ڕوودەدات، لەسەر هەمان ڕیتمی گۆڕانکاریی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و هاوشێوە لەگەڵ ڕیتمی ئەو گۆڕانکاریە کە خۆی لە خۆیدا پەیوەستەو پچڕانی لەخۆ نەگرتووە. ئەمەش بەو مانایە نایەت کە بە شێوەیەکی میکانیکی خۆبەخۆ ڕوودەدات.

گەر باری کۆمەڵایەتی لە کۆتایی سەدەی پانزەدا بە شێوەیەکی جیاواز پێشکەوتایە واتە بۆ نمونە گەر گۆڕانێکی سەرەکی ئابوری یا ڕامیاری یا ئاینی ڕوویبدایە، لە جێی پتەو بوونی ڕێبازی پارێزگارا کە ڕێی لە پێشترەوە بۆ خۆشکرابوو -ئەو دەمە هونەر بەپێی ئەو گۆڕانە پەرەیدەسەند بە ئاڕاستەیەکی جیاوازدا، شێوازی بە ئەنجام گەیشتوی سەردەمی ڕێنیسانسی پێشکەوتوو جیاواز دەبوو لەوەی گەیشتە قۆناغی کامڵ بوون لە شێوازی کلاسیکیدا. چون گەر مرۆڤ بیەوێت سەرەتاگەی لۆژیکی بەسەر پەرەسەندنە مێژووییەکاندا پیادە بکات، دەبێت هیچ نەبێت دان بەوەدا بنێت کە کۆمەڵێك هەلومەرجی مێژوویی ئەکرێت چەند ئەنجامێکی جیاجیای هەبێت.

ڕاستە لە میانی بەراوردکارییەوە فلۆڕەنسا چوێندراوە بە ئەسینا یاخود لۆرینزۆ میدتشی و پاپا لیۆی دەهەم بە بیریکلیسی یۆنانی، هەرچۆن کۆمەڵە کاری "ئارازی Arazzi" ڕافاییل بە

پارسینۆنی هونەری نوێ ناوزەد دەکرا، دەکرێت ئێمە ئەم لێکچواندنانە پەسەند بکەین، بە مەرجێ ئەو جیاوازیە گەورەیەی نێوان خواستی کلاسیکی کۆن و نوێمان بیرنەچێت، سەرباری هەموو لێکچونێکیان. گەر هونەری کلاسیکی نوێ بەراورد بکرێت بە هونەری یۆنانی زوو بە زوو هەست بە نەبوونی ئەو گەرمی و پەیوەستییە ڕاستەوخۆیە دەکرێت کە لە دوهەمیاندایە، چون کۆمەڵگەی ڕێنیسانس کۆمەڵگەیەکە لەژێر کاریگەریی یادەوەریەکانیدا دەژیا بۆ ڕۆژگاری پاڵەوانێتی و سەرکەشی ڕۆمانی و سوارچاکی سەدەکانی ناوەڕاست، لەبەرئەمە پەنای بۆ مۆرکێکی وەرگیراو و گەڕاوە بەرەو دوا بردووە، ئاراستە کلاسیکیەکەی نێویشی تا ڕاددەیەك دەستکردە، وەك پەیڕەوکردنی یاسا کۆمەڵایەتی و ئاکاریەکان بە شێوەیەکی دەستکرد. هونەری کلاسیکی دەیەوێت وەسفی کۆمەڵگەیەکمان بۆ بکات وەك ئەوەی دەیەوێت خۆی ببینێت و وەك ئەوەش کە دەیەوێت کەسانی تر ببینن. گەر سیمای ئەم هونەرە بپشکنین بە وردی، ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت بە نزیکی هەموو لە وەرگێڕانێکی ئەو نمونە باڵا ئەرستۆکراتیە، پارێزگارایانە تێناپەڕێ، بۆ سەر زمانی هونەر کە ئەم کۆمەڵگە سەوداسەرەی جێگیریی و هێمنی پیاهەڵدەدات و باوەڕی پێیەتی. خواستی فۆرمگەرای هونەریی سەدەی شانزەش شتێك نیە هاوشان کاری ئەو ڕژێمە شێوەییە نەبێت کە پێکهاتەی هزرهایەکی ئاکاری و ئەو هەیبەت و شکۆداریەیە کە چینی باڵا لەو سەردەمەدا بەسەر خۆیدا سەپاندبووی.

هەرچۆن ئەرستۆکراتیەت و هەموو خاوەن ئاوەزە ئەرستۆکراتیەکان ژیانیان ملکەچی بڕیارێکی یاسایی شێوەیی ڕووکەشی کردبوو، تا لە ئاژاوەی هەڵچون بیپارێزێ. هەر بەو شێوەیەش گوزارشت کردنیان لە هەڵچونەکانی نێو هونەر وابەستەی چاودێریەکی قاڵبە ناکەسایەتی‌یە ڕووتەکان کردبوو.

بە لێکدانەوەی ئەم کۆمەڵگەیە ڕاگرتنی دەرون و سەرکوت کردنی هەڵچونەکان و خۆبەخۆیەتی و سروش و سەرگەرم بوون، باڵاترین ڕاسپاردەیە کە هونەرمەند هەوڵی پەیڕەوکردنی بدا.

لە سەردەمی کلاسیکیەتی ڕێنیسانسدا چیتر پیشاندانێکی دیاری هەست و سۆز نەما بەو زەقیەی وەك بۆ ماوەیەك لە سەردەمی غوتی دوادوا وە بەردەوامی لە سەدەی پانزەدا وەرگرت.

فرمێسك و ئازار و هاوار و ناڵین و پاڕانەوە و قوڵ هەڵبڕین و لە هۆش خۆچون بە یەکجارەکی ون بوون. چیتر مەسیح شەهیدێکی ئازاردراو نەماو بۆ جارێکی تر بووەوە بە میرێکی ئاسمانی و هەڵکشایە سەرو ئاستی لاوازی مرۆڤ. هەرچۆن ئیتر مریەم بە چاوێکی پڕ

گریانەوە سەیری کوڕە مردووەکەی نەکرد و تەنانەت دەستبەرداری هەر جۆرە ناسکیەکی بازاڕیی بۆوە بەرامبەر مەسیحی منالْ.

بانگەوازی سەردەم سەراپا بووە هاوشانی لە هەموو شتێکدا، پوختەیی و وردەکاریی ئەو بنەمایانە بوون هونەر بەسەر خۆیدا سەپاندبووی و لە هاوشێوەیدا نزیك بوو لە ڕێسا سەپێنراوو پەیڕەوکراوەکانی ژیانی ڕۆژانەوە. بیرۆکەی پوختەکاری لە هونەردا ئەلبێرتی بە خاوەنی پێشینەی دەزانرێت، ئەودەمەی وتی: "هەر کەسێ بیەوێت شکۆمەندی لە کارەکەیدا بە دەست بێنێت، پێویستە شێوە بەکارهێنانی پوخت کاتەوە بۆ ژمارەیەکی سادە لە شێوەکان. هەروەك چۆن ئەمیر و سەرکردەکان بە پوختی ووتارەکانیان لە هەیبەتی خۆیان بەرزدەکەنەوە، هەرواش پوخت و کەم بەکارهێنانی شێوە لە بەهای کاری هونەریی بەرزدەکاتەوە".

بیرۆکەی (چڕوپوخت Subordination) بووە بنەمایەك هەمیشە جێی ڕێکخستن و گونجاندنە ئاساییە ڕووتەکانی پێکهاتنی شێوەی دەگرتەوە.

هەڵبەتە ئەم لێکدانەوانە نامان گەیەنێتە ئەوەی بڵێین بنەمای دەسەڵات لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا یەکسانە لەگەڵ بیرۆکەی (چڕوپوخت) بوون لە هونەردا. چون گەر واشمان ووت تێکەڵ کردنەکەمان تەنها بە ووتە ئەبێت و بەس. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەیەك لەسەر بیرۆکەی دەسەڵات و ملکەچی بنیات نرابێت بێگومان گوزارشت کردن لە ڕژێم و دەرخستنی لە هونەردا بە شتێکی ئەرێتی دەزانێت، چون داگیرکردنی واقعە لە بری خۆپێسپاردنی.

کۆمەڵگەیەك ئەرکی ئەوە بدات بە سەرشانی هونەردا کە کۆمەڵی ڕێساو بنەما و پێودانگی وەك دیاردەیەکی هەتاهەتایی لە بڕاوە نەهاتوی بێ جووڵە و بێ کەموکوڕی بۆ بەرجەستەو بسەلمێنێ. لە کۆمەڵگەیەکی وەهادا لەلای چینە باڵاکان و دەسەڵاتدارەکان هونەر پێش هەموو شتێك هێمایەکە بۆ هێمنی و ئارامی و جێگیریی کە خۆیان لە ژیاندا لە هەوڵی بەدیهێنانیا بوون.

لەبەرئەوەی گەر لە ماوەی نێوەندی ڕێنیسانسدا پێك هاتنی هونەریی پەرەیسەندبێ لە قاڵبێکی هاویەك و چون یەکی نێوان پارچە و بەشە جیاجیاکانداو، گەر واقعی بە زۆرەملێ لە سەمتێکی سێگۆشە یا بازنەدا دانابێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا هەر چارەسەری کێشەیەکی فۆرمی هەڵنەگرتووەو بەس، بەڵکو لە دوتوێیدا گوزارشتە لە تێڕووانینێکی جێگیر بۆ ژیانو، ئارەزوی هێشتنەوەی ئەو دۆخانەی چون یەکی ئەو تێڕووانینەیە.

کۆمەڵگەیەکی وا پێوەرێك لە سەرو سەربەستی کەسایەتی دادەنێت لە هونەرداو، پەیڕەو کردنی ئەو پێوەرە لەو میانەدا (هەروەك لە خودی ژیاندا) تاکە ڕێگەی زامنە بۆ گەیشتن بە کەماڵ. بەڵام سەدەی پانزە هەمیشە وەها وێنای جیهانی دەکرد کە لە گۆڕانکاریەکی بی‌کۆتای هەتاهەتاییدایەو، پرۆسێسی گەشەکردن ناکرێ بڕیاری تیا بدرێ و کەماڵ بوونیش لەخۆ ناگرێ. هەڵبەتە لە جیهانێکی وادا مرۆڤ هەست بە لاوازی و دەستەوسانی دەکات، مل بەرەو خۆپی‌سپاردنێکی کوێرانە دەنێت. لە بەرامبەر ئەم بۆچوونەدا سەدەی شانزەهەم وا هەست بە جیهان دەکات خاوەن سنورێکی دیارو ئاشکرا. جیهان هەر بە هێندایی ئەوەندەیە کە مرۆڤ دەتوانێت پەی پی‌بەرێت، چیتر لەوە زیاتر نی‌یە. هەموو کارێکی هونەریش لە ڕێگەی تایبەتی خۆی گوزارشت لەو واقعە هەمەکی‌یە دەکات کە مرۆڤ توانیویەتی پەی پی بەرێت.

هونەری ڕێنیسانس لەم سەردەمەدا هونەرێکی دنیایی بوو لە ڕێڕەوی گشتی‌دا. تەنانەت لە بەرجەستەکردنی بابەتە ئاینی‌یەکانیشدا. بۆ گەیشتن بەم شێوازە نمونەییە نەهات جیهانی سروشتی لە بەرامبەر جیهانی سەرو سروشتی دابنێت، بەڵکو بە دۆزینەوەی ماوەیەك لە نێوان خودی بابەتەکانی جیهانی سروشتی‌یەوە. ئەوەش ئەو ماوەیەیە کە لە جیهانی ئەزمونی بینیندا دەبێتە هۆی دۆزینەوەی جیاوازیەکان لە بەهادا هاوشێوە لەگەڵ ئەو جیاوازیانە هەیە لە نێوان دەستەبژێرو جەماوەری پانوپۆڕ لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی‌دا. کاروبەرهەمەکانی ئەم سەردەمە جیهانێکی گشتگیری بالآمان بۆ وێنە دەکات پشت بەستوو بە پیشاندانی توخمهایەکی سەرەکی پەیت. بەڵام گەر بپرسین ئەم (توخمە سەرەکیانە) چی بوون؟ ئەوا لە وەڵامدا دەڵێین ئەو شتانە بوون کە دەمێننەوە بە جێگیریی، تێك ناچن و بۆگەن ناکەن، نرخ و بەهایان پێش هەموو شتێك لەخۆ بەدوور گرتنیدایە لەهەر شتێ کە تەنها سەپێنراوی واقع بێت و بە ڕێکەوت ڕوویدابێ. هەموو ئەو شتانەش کە سەدەی پانزە بە گرنگترین پەل و پۆی توخمەکانی واقعی دەزانی لە ڕاستەوخۆیی و بینراوی و خستنەڕوویی و تاکی لە دیدنیگای ئەم هونەرەوە شتێك نەبوون سەرەکی.

بەم شێوەیە دەستەبژێر خەیاڵی هونەرێکیان ئەفراند کە بەسەر هەموو زەمانێکدا پیادە دەبێت، کە هونەرێکی بەشەری هەتاهەتاییە، چون ئەم دەستەبژێرە دەسەڵاتدارە دەیانویست قەناعەت بە خۆیان بێنن کە کە تواناو دەسەڵات و سەنتەری ئەوان زەمان کاری تی‌ناکات و تێك ناچێت و هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نایەت.

بەڵام لە ڕاستیدا هونەری ئەم سەردەمە بە پێوەرە تایبەتەکانیەوە لە بەهاو جوانی‌دا، بەسترابوو بە زەمانەوەو دیاری کراو و بەرهەڤ بوو وەك هونەری هەر سەردەمێکی تر. چون

بیرۆکەی نازەمانی خۆی لە خۆیدا بەرهەمی زەمانێکی دەست نیشان کراوە، ڕاستی خواستی ڕەها لە ڕێژەیی بوونیدا جیاواز نىیە لە ڕاستی خواستی ڕێژەیی.

زیاترین توخمێکی هونەریی ئەم سەردەمە کە پابەندی زەمان و هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان بووبێت نمونەی باڵایە لە جوانی چاکەدا Kalokagathia. ئەم توخمە ڕوونترین توخمێکە گوزارشت لە پشت بەستنی بیرۆکەکەی لەمەڕ جوانی لەسەر نمونە ئەرستۆکراتیە باڵاکان بکات لە کەسایەتیدا.

شتێکی نوێ نەبوو بۆ سەدەی شانزە کە جوانی جەستەیی پێگەی خۆی بەدەست بێنێتەوە- کە سەدەی پانزە بە چاوێکی هۆگرو شەیدایانەوە دەیڕووانیە شۆخوشەنگی جەستە، ئەمەش بە پێچەوانەی خواستی ڕۆحانیەوە بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا- بەڵکو ئەوەی نوێ بوو لە سەدەی شانزەدا جوانی و هێزی جەستەیی پێکەوە بوونە گوزارشتێکی ڕاست لە جوانی و گرنگی ئاوەزی.

سەدەکانی ناوەڕاست وەهای دەبینی کە دژایەتیەکی نەپساوە هەیە لە نێوان ژیانی ناهەستی و لە نێوان جەستەیەکی ناڕۆحانیدا، ئەم دژایەتیەش لە ماوەهایەکی دیاریکراودا پتەوتر دەبوو وەك لە هەندێ ماوەی تر، بەڵام بەردەوام جێگەی خۆی لە هزری خەڵکیدا داگیر کردبوو. لە سەدەی پانزەدا ئەم دژایەتیەی نێوان ڕۆحانی و جەستەیی کە سەدەکانی ناوەڕاست بانگەوازی بۆ دەکرد هێزو تواناو گرنگی خۆی لە دەستدا. چیتر گرنگی ڕۆحانی و ئاوەزیی پەیوەست بوونێکی بێ مەرج پەیوەست بۆوە بە جوانی جەستەوە. ئەمەش کێشەکەی بۆ هونەری ڕێنیسانسی سەدەی شانزەهەم ئاسان کرد، وای کرد بە یەکجارەکی ئەو گرژیەی نێوان سیفاتە ڕۆحانی و جەستەییەکان دیار نەمێنێت و وون بێت.

بەپێی سەرەتاکانی ئەم هونەرە هەرگیز شیاو نەبوو بۆ نمونە وتووێژکەرەکان (الحواریون) وەك جوتیارێك یا پیشەزانێکی ئاسایی وێنە بکرێن وەك ئەوەی زۆرجار لە سەدەی پانزەدا بە هۆگریەك و شەیداییەکی زێدە ڕەوانەوە وەها وێنە دەکران. لە دیدنیگای ئەم هونەرە نوێیەوە پەیامبەرەکان و وتووێژکەران و شەهیدان و پیرۆزمەندان کەسایەتی نمونەیین، ئازاد و مەزن، بەهێزو بەشکۆ، سەنگین و جیدی.

بە واتایەکی تر ئەمانە لە ڕەگەزێکی پاڵەوانی وەهان لە لوتکەی جوانیەکی هەستی کامڵدا. لە کارەکانی داڤنشیدا هەندێ سەمتی سەر بە ژیانی ڕۆژانە بەرچاو دەکەوێت هاوشانی ئەو شێوە باڵایانە، بەڵام تەنها شێوە پڕ شکۆ باڵاکان هێدی هێدی دەمان گەیەننە ئەو بڕوایەی کە شایەنی مانەوەو بەرجەستەکردنی هونەریی بوون. ئاوگێڕەکەی نێو تابلۆی (ئاگر لە بۆرجۆ)ی

ڕافاییل سەر بە هەمان ڕەگەزە کە فەریکەکانی مایکل ئەنجیلۆ و دەگرێتە خۆ -کە ڕەگەزێکی زەبەلاحە، پڕ چالاکی و گورجوگۆڵیە، باوەڕی بە خۆیەتی، هەموو هەڵسوکەوت و جوڵەیەکی هاوسەنگی و هێمنی تیا بەدی دەکرێت.

شکۆمەندی ئەم فۆرمانە لە ئاستێکدا بوو ڕێ درا بە ڕووتی نیگاریان بکێشرێت، سەرباری ئەو ڕقە کۆنەی چینە ئەرستۆکراتیەکان هەیان بوو بەرامبەر بەرجەستەکردنی لەشی ڕووت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فۆرمانە هیچ شتێك لە شکۆمەندیان کەم نەبۆوەو دانەبەزی لە چاوی ئەو چینەوە. لە پێکهاتەی پڕ بەهای لاکانیدا و لە گونجاندنێکی شیك پۆشی جوڵەیدا و لە شکۆمەندی و سەنگینی هەیکەلیدا، هەمان گوزارشت بەدی دەکەین و هەست پێ دەکەین لە بالآیی کە ئەو جل و پۆشاکە قورس و ئەستور و خاوەن چرچە قوڵانە پێمان دەبەخشێت، کە ساتێ لەبەرکەرەکەی پێوەی هەڵسوکەوت ئەکات و دەجوڵێ دەنگێکی نزمی تایبەت دەردەکات و هەمیشە شیك پۆشیەکەی پارێزراوە، بە گرنگی پێدان و ئاگاداریەوە هەڵبژێرراوە.

ئەم سەردەمە لە هەڵبژاردنی نمونەی بالآی کەسایەتیدا پەنای بردە بەر بیروباوەڕەکانی پیاوێك کە وێنەی کەسایەتی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە لەلای ئەم نووسەرەی تەختی کۆشکەکان ئامادەبوو. ئەم نووسەرە ڕۆشنبیرە (باڵدەسار کاستیلۆنی)ـە خاوەنی کتێبی کۆرتیجیانۆ(Cortegiano)[٤].

ئەم سەردەمە بەوەوە ڕانەوەستا تەنها سودمەندی بیروڕاکانی ئەم کتێبە بێت بەڵکو زیادەڕۆییشی تیادەکرا. هەموو سیما دیارەکانی نێو نەخشە بۆ کێشانی سەردەمی ڕێنیسانسی ناوەند بۆ مرۆڤ لە هونەردا، پێشتر لە نمونەی بالآی هونەری کۆشکەکاندا وەك چەند خاڵێکی سەرەکی ئامادەبوون، بەڵام ئەمە وای نەکرد ئەم هونەرە نوێیە نەکەوێتە ژێر کاریگەری ڕەهەندەکانی کەسایەتی لای کاستیلۆنی، بەڵکو لە واقعدا شێوەی پاڵەوانێتی ئەم سەردەمە، بە خواستی (جوانی چاکە)شەوە Kalokagathia شتێك نەبوون وەرگێڕانێکی ئەم نمونە بالآ مرۆڤی و کۆمەلآیەتیە نەبێت بۆ زمانی هونەرێکی بینینی. لە فۆرمەکانی دوتوێی هونەری سەدەی شانزەدا توشی هەمان ئەو هێمنی و ئارامیە دەبین "کە کاستیلۆنی لە بیروڕاکانیدا ئاماژەی پێداوە" لە سیماو ڕووکەشداو ئەو ئازادیەش کە لە جوڵەو هەڵسوکەوتدایە. گۆڕانکاریەکان لە چاو سەردەمی پێشوودا هەر بە هێندە قایل نەبوو بەڵکو خۆی کێشا بەرەو گۆڕانکاری لە توخمە فۆرمیە پەتیەکانیشدا؛ ئەو شێوە لاوازە لە ڕەی سەر بە سەردەمی غوتی بوو، تا ئەو هێڵە پچڕپچڕە هەناسە کورتانە، لە سەدەی پانزەدا، دەستی کرد بە پەیداکردنی ناسکی و گونجاندنێکی دڵنیا لە خۆی و زیندویەکی لە ڕاددەبەدەر و چەمانەوەیەکی پڕ جوانی و ناسکی

خەرامانی، بە کەماڵێك گەیشت کە لە هیچ هونەرێکی تردا نەبینراوە هەر لە سەردەمی کلاسیکی کۆنەوە.

هونەرمەندانی سەردەمی رێنیسانسی ناوەند چیتر بە جوڵە کورتە، تیژە، بە پەلەکان و ئەو رێك پۆشیە حەساوە هەڵچووە سەرسام نەمان و هیچ چێژێکیشیان لێ وەرنەدەگرت، ئەمە بێ لەو جوانیە هەڵگوشراوە، ناکامڵ و ناپێگەیشتوە کە لە سیماکانی فۆرمی مرۆڤی سەدەی پانزە بوون. هەرچی ئەوان بەهێزێکی لەبن نەهاتودا هەڵیان دەداو پێگەیشتوێتی تەمەن و جوانیان لا مەبەست بوو، ئەوان ژیانیان بەرجەستە دەکرد وەك ئەوەی کە هەیە، نەك لە لایەنی پرۆسێسی گۆڕانکاریەوە، چون پێشتر ئاماژەی تەواومان بە خواستی جێگیریی و ئارامی ئەم سەردەمە داو خودی ئەم سەردەمەش لە پێناو کۆمەڵگەیەکدا کاریان دەکرد کە لە خەڵکانێ پێك هاتبوو گەیشتبوونە جێ و رێ و پلەی خۆیان ئەشیان ویست هەموو شتەکان و خودی خۆشیان هەروا بمێننەوە. لە هونەرمەندانیش بەشداری کردنی ئەو هەستە پارێزگەرایەیان دەویست.

گۆڕانکاری لە چێژدا گەیشتە ئاستێك لە قوڵی تەنها بە جل و بەرگ و ڕازاندنەوەو شمەکی بەکارهاتوی ڕۆژانەوە نەوەستا کە گۆڕانکاری لە ڕەنگ و بریسکەیاندا بکرێت، بەڵکو ئەم گۆڕانکاریەیە قوڵە بووە هۆی خۆپاراستن و بەدورگرتنی خودی هونەریش لە باق و بریق و زەقی ڕەنگکردنی کراوە کە هەرچی زیاتر لە سەدەی پانزەدا باوبوو. هەر سەرەتای ئەم گۆڕانکاریە لە بینیندا بۆ ڕەنگ بووە مایەی دیارنەمانی بەکارهێنانی ڕەنگ لە تەلارسازی و پەیکەرسازیدا، خەڵکی ئەو سەردەمە تا ئەمڕۆش لە لایان قورسە کە وێنای کارەکانی پەیکەر و تەلارسازی یۆنانی بە ڕەنگینی بکەن. ئەم مێژووە مێژووی دیاریکردنی ڕەنگە لە ژیانی مرۆڤی مەدەنیدا، هەر لە هەڵبژاردنی ڕەنگی جل و بەرگیەوە تا کەرەسەو شتومەکی پێویستی و ڕەنگی خانوبەرەو.. هتد، سەراپا لە سنوری ئەم دیاریکردنەدا وەستا.

ڕاستە پەخش بوونی ئەم بیروباوەڕە لەو سەردەمەوە تەنها هۆکارێك نیە بۆ ئەو دەستبەرداربوونەی مرۆڤی مەدەنی سەردەم هەیەتی هەر لەو مێژووەوە تا ئەمڕۆ، بەڵام بە سانایی دەکرێت بڵێین هۆکاری سەرەتایی و هۆکارێکی سەرەکیە.

سەردەمی ڕێنیسانسی ناوەند تەمەنی هێند درێژ نەبوو و ئەوەندەی نەخایاند، سەراپای تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕی نەکرد. دوای مردنی رافاییل ئاخاوتن دەربارەی هونەرێکی کلاسیکی ئەستەم بوو کە ڕێبازێکی شێوازی گشتی بنوێنێت. لە واقعدا کورتی ئەم ماوەیەی سیفەتێکی جیاکەرەوە بوو بۆ هەموو ماوەکانی شێوازی کلاسیکی لەسەردەمە نوێیەکاندا،

چونکە ماوەی جێگیریی و ئارامی لە دوا کۆتایی سەردەمی دەرەبەگایەتی، ماوەهایەك بوون تەمەن کورت. بەڵام خواستی فۆرمی وردەکاری سەردەمی ڕێنیسانسی ناوەند (وەك شێوازی و تەکنیکی و جوانی) هەر فریودەر مایەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆی، گەرچی بۆ جارێکی تر ئەو دەسەڵات و پێشڕەوویەتیەی وەرنەگرتەوە لە هەندێ بزاڤی هەناسەکورتدا نەبێت، کە زۆربەیان دەستکرد بوون و هۆکاری فێرکردن پاڵپێوەنەریان بووە. لە لایەکی ترەوە ئەم خواستە سەلماندی کە لە گرنگترین تەوژمەکانی ژێرەوەی هونەری نوێیە، هەرچەندە شێوازی فۆرمی وردەکار، کە دامەزراو بوو لەسەر بنەمایەکی سەمتی پێوەریی، خۆی ڕانەگرت لە بەردەم دابەزینێکی سەرەکی بۆ لێکچونی سروشت لە سەردەمی نوێدا، بەڵام کارێکی کرد کە چیتر دوای سەردەمی ڕێنیسانس گەڕانەوە بۆ ئەو شێوازە فۆرمیە کەڵەکەبووە هەڵوەشاو و کەرتبوانە لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا زانرابوون شتێك بێت. ئەستەم. لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە وامان لێهات بڕووانینە کارێکی نیگارکێشان یاخود پەیکەر وەك ئەوەی وێنەیەکی پەیت کراوە بێت بۆ واقع کە لە تاکە گۆشەنیگایەکەوە تەماشای کرابێت. مەبەست ئاوێتەیەکی فۆرمی‌یە کە لەو گرژیەی نێوان جیهانێکی پانوپۆڕ و خودێکی دابەش نەبووی بەرامبەر ئەو جیهانە دروست بووەو سەری هەڵداوە. ئەم جەمسەرگیریەی نێوان هونەر و جیهان ناوبەناوێك هێور دەبۆوە، بەڵام بۆ جارێکی تر هەرگیزاو هەرگیز دیارنەمانی تەواوەتی بەخۆوە نەدی.

ئالێرەدایە نمایشی ئەو کلتورە ڕاستەقینەیەمان بۆ دەکات کە سەردەمی ڕێنیسانس بۆی بەجێ هێشتوین.

## قوتابخانەی هونەریی شارەکان

## قوتابخانەی فلۆرەنسا، قوتابخانەی سیینا، قوتابخانەی ڤینیسیا

پێشتر ئاماژەمان بە ڕۆڵی قوتابخانەی سییینادا کە ئەو ماوەیەی هونەری نیگارکێشان لە فلۆڕەنسادا گوڕێکی وەهای نەبوو. شاری سیینا پێشڕەوایەتی گرتە دەست لە سەدەی سیانزەدا بە هۆی هونەرمەندان دوسیو و سیمونی مارتینی تا بە ساستیا دەگات. هەر لەسەر دەستی هونەرمەندانی ئەم شارە ڕووناکی بۆ یەکەم جار هێنرایە ناو تابلۆ. لە سەدەی پانزەدا سیینا وازی لە پێشڕەوایەتیەکەی خۆی هێنا بۆ فلۆڕەنسا، واتە ڕۆڵی قوتابخانەی سیینا زوو کۆتایی پێهات و لەم سەدەیەدا چووە پاڵ قوتابخانەی فلۆڕەنسی و لە چالاکی بێوێنەی سێ بلیمەتەکەیدا داڤنشی و ڕافاییل و مایکل ئەنجیلۆدا توایەوە.

قوتابخانـەی سـێهەم کـە خـاوەن پێگەیـەکی گرنگـی مێژوویيـە قوتابخانـەی ڤینيسـيایە، کـە دامەزراندنی لەسەر پێگەیشتن و ئەنجامەکانی دوو قوتابخانەی پێشوو بوو، ئەم قوتابخانەیـەش وەك دوو قوتابخانـەی پێشـوو خـاوەن نـاوی گەورەیـە لـە مێـژووی هونـەری جیـهانیدا. لـەو هونەرمەندانە جیوڤانی بیللینی و مانتێنا و جۆرجیۆنی وتیسیان و تینتوریتـو و ڤیرۆنێزە و.. هتد بوون. چالاکی و کارکردنی قوتابخانەی ڤینیسیا لە نیوەی یەکەمی سەدەی پـانزەوە دەسـتی پێکرد تا نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم.

لە نێوانی ئەم سێ قوتابخانەیەدا جیاوازی زۆر هەیەو لە هەمان کاتدا گرنگیشن، بە تایبەت لـە نێـوان قوتابخانـەی فلۆرەنسی و ڤینیسیدا. هـەرچی دەربـاری قوتابخانـەی سـيينايە چـون هەناسە کورت بووەو لـە سـەدەی پـانزەدا ئاماژەمـان بـە چۆنیـەتی تـەکنیك و شـێوازی داو ئـەو گۆڕانکاری و نوێگەریانەمان دەستنیشان کرد کە تیـایدا بـە بەرهـەم هات، ئەمـە بـێ لـەوەی لـە پاش خۆی و بە شێوەیەك یاخود چەند شێوەیەك لە شـێوەکان ئـەو داهێنانانـە لـەنێو هونـەری قوتابخانەی فلۆرەنسیدا ڕەنگـی دایـەوەو جێگیر بـوو. بۆیـە بەراوردکاریەکـەمان بـە شـێوەیەکی سەرەکی و ڕاستەوخۆ ئاراستەی دوو قوتابخانەکەی تر دەکەین.

## بەراوردکاریەکانی نێوان قوتابخانەی فلۆرەنسی و قوتابخانەی ڤینیسی:

لەو ڕاستیانەی کە نابێت فەرامۆشی بکەین ئەوەیە کە قوتابخانەی فلۆرەنسی زووتـر سـەری هەڵداوە و پشت بەستوو بوو بە ڕێساکانی هونەری کلاسـیکی (یۆنـانی- ڕۆمـانی) بـە شـێوەیەکی گشتی، بەڵام قوتابخانەی ڤینیسیا سەرچاوەو سەرتاگەی لە هونەری کۆنـەوە[٥] وەردەگرێـت ئـەو سـەرباری سـودمەند بوونـی لـە دەسـتکەوتەکانی قوتابخانـەی فلۆرەنسا. ئـەو دەمـەی فلۆرەنسـا سەرگەرمی ماندوبوون بوو لە گەیشتن بـەو سەرکەشـیەی پـێی گەیشـت، قوتابخانـەی ڤینیسـیا ئەودەمــە زنجیرەیــەکی نــوێی لــە توانــا نیگارکێشــەکان دەدۆزییــەوە. ئــیریك نیوتــن (لەو سـەرچاوەیەیدا کـە بـۆ نیگارکێشـان و پەیکەرسـازی ئـەوروپی نووسـیوە سـاڵی ١٩٦٤)[٦] وای دەبینێت فلۆرەنسیەکان کە زانستی ڕێکخستنی تابلۆیان تا ئەوپەڕی توانای بردە پێش، بـەڵام هەر نەگەیشتنە ئەو ڕاددەیەی ئەم زانستە لەگەڵ زانستی ڕەنگدا لێك بدەن، ئەمەش ئـەو شـتە بوو کە ڤینیسیەکان تیـا سـەرکەوتوبوون. بـەم دەستکەوتەشـیان زنجیرەیـەك لـە توانـای نوێیـان کردەوە.

وێنــە لای فلورەنســیەکان لــە ســاڵی ١٤٨٠ پێـك هــاتبوو لــە شــێوەو ڕەنــگ بــەڵام لای ڤینیسیەکان لە ساڵی ١٥٢٠دا شێوەیەکی ناپوختە بوو بە ڕەنگ. لەلای فلۆرەنسیەکان هەرچی

چەندێ ڕەنگ گونجاو بوو بێت خاوەن سیفەتێك بوو کە پێویست بوو بخرێتە سەر دیزاینی designکارەکە، بەڵام لای نیگارکێشە ڤینیسیەکان ڕەنگ شتێك بوو پەیوەست بە دیزاینەوە، کە جیابوونەوەی لێی نەدەزانی. ڕەنگی فلۆڕەنسیەکان پێویستیەك بوو لە پێویستیەکانی جەستەو ئەو کەرەسانەی پابەندی بوون: جلێکی سور یا درەختێکی سەوز، ڕەنگ دەکران بە سور و سەوز لە میانی سنوری ئەو جەستانەدا. بەڵام ڤینیسیەکان وەها سەیری ڕەنگیان دەکرد کە سیفەتێك بێتو، بەبێ ئەو زۆر بە قورسی نەبێت ناتوانرێت بە جل و درەختەکە بووترێت بوونیان هەیە.

ڕەنگ هەموو شتەکانی داگیرکردووە و لە میانی سنوری شتەکانەوە پێگەیشت وەك ڕووناکی، لە هەموو شتێکیش ئاڵا وەك هەوا. بەم شێوەیە یەکەی بوونیاتی نیگارکێشانی فلۆڕەنسی پێگەی خۆی چۆڵ کرد بۆ یەکەی ڕەنگی نیگارکێشانی ڤینیسی.

گەر سەرنجمان ئاڕاستەی هونەری پەیکەرسازی بکەین دەبینین باشترین قۆناغەکانی خاوەن پەیکەرێکی مەزن نیە لە قوتابخانەی ڤینیسیادا، بەڵام ئەو دەستکەوتە هونەریانەی بەدی هێنا زۆر گەورەتر بوون لە دەستکەوتی پەیکەرسازیی قوتابخانەی فلۆڕەنسا. یەکێ لە سیما سەرەکیەکانی هونەری ڤینیسیەکان سیمای تەکنیکە- Technical. هەر ئەم سیمایەشە وا دەکات هونەری ئەم قوتابخانەیە زیاتر بە نزیك دەرکەوێت لە هونەری (مۆدێرن و سەردەم)ەوە وەك لە هونەری فلۆڕەنسی. ئەم خاڵە بە ڕوویەکی تایبەت لەو گۆڕانکاریەدا دەرئەکەوێت کە لە بەکارهێنانی تێمپرا Temperaوە ڕوویان کردە بەکارهێنانی بۆیەی ڕۆنی Oil Colour بەو ئۆرتەی نێوەندێکی سروشتیە بۆ نیگارکێشان. هەروەها مەیلی گرنگی دان بە ڕووەکان کە بەرامبەرە بە مەیلی هێڵە دەرەکیەکان – Contour بێگومان سیمایەکی جیاکەرەوەی هونەری ڤینیسیەو بەکارهێنانی بۆیەی ڕۆنیش یارمەتیدەرو ڕێخۆشکەری ئەم لایەنەی بینگەی هونەرمەند بوو.

ڕەنگە قوتابخانەی فلۆڕەنسی کە بۆیەی ڕۆنی ڕەتکردۆتەوە لەگەڵ پێداویستیەکانیدا نەگونجابێت، بەمەش خۆی نەگونجاندووە یاخود پێویستی نەبووە خۆ لەگەڵ سروشتی ئەو ماددەیەدا بگونجێنێت، ئەنجامەکەشی لە دەست چونی ئەو تواناو بەرەنجامانەیە کە لەوزەو بەهای ئەم ماددەیەدا هەیە، گەر خۆ گونجاندنی قوتابخانەی فلۆڕەنسا لە دەمێکی زۆر زوترەوە دەستی پێ بکردایە وێنای شۆڕشێکی لێ دەکرا لە بواری نیگارکێشاندا.

هەردوو قوتابخانەکە جیان لە ڕووکەش و تەکنیکیاندا. فلۆرەنسا هەمیشە شاری فەیلەسوف و پیاوانی هزر بووە لە بەرامبەردا وەك شاری شاعیران و مۆسیقییەکان سەیری ڤینیسیا کراوە، بلیمەتێتی شیعریی ئەم شارە پێ دزکێ کردۆتە نێو هونەرەکەیەوە.

هۆکارێکی تر کە ڕۆڵی گرنگی لە مێژووی هەردوو شارەکەدا گێڕاوە ئەوەیە فلۆرەنسا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو سەرکەشییە مەدەنیەی بەخۆوە نەدی کە ڤینیسیا پیادەی دەکرد. فلۆرەنسا سەنتەرێکی بەرهەم هێنی هونەر بووە، لەبەر ئەم هۆیەش پێداویستییەکانی کڵێسای دابین دەکرد و بەڕاددەیەکی کەمیش خێزانە خانەوادەکان. بەڵام ڤینیسیا شاری بازرگان و کۆشکەکان و تەلارە مەدەنیە مەزنەکان بوو. لەبەرئەمە داواکاری لە لایەن شارەکەوە بە هێندایی داواکاری کڵێسە بوو لەسەر هونەرمەندەکان.

ئەزموونی کارکردنی هونەری و دروست کردنی پێکهاتە فۆرمیەکان سیمای یەکیەتیەکی شێوەو ناوەڕۆکی هەبوو یەکگرتنی ئەو دولایەنەش لە حەقیقەتێکی بەرجەستەدا شێوەو ڕەنگ پەیوەست دەبن، دەستبەرداری دژایەتیە زەقەکانی سێبەرو ڕووناکی دەبێت، بە مرامی هەرچی زیاتر دەرخستنی ڕاستیەکی هەستی ئیستاتیکی پەیت کە لە سیماکانی جیاکاری هونەری ڤینیسیە.

ئەمە بە گشتی ئەو خاڵی بەراوردکاریانە بوون لە نێوان هەردوو قوتابخانە هونەریەکەدا، گەر لەمە زیاتر لەمبارەیەوە بدوێین دەمان گەیەنێتە ووردەکاریی زۆر دوور کە ئەویش لە بینینێکی هەمەکیدا هەر ئەم خاڵانە دەگرێتەوە.

## نیگارکێشانی سەردەمی ڕێنیسانسی زێڕین لە ئیتالیا:

ژمارەیەکی زۆر لە بلیمەتانی نیگارکێشانی ئیتالی بەشدارییان کرد لە گەیاندنی هونەری نیگارکێشان بە ئاستێکی باڵا لە توانا کە پێشتر لە مێژووی نیگارکێشاندا بەرئەنجامی لەوجۆرە بەدی نەهاتبوو، مەڵبەندی سەرەکی ئەم توانایانەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە فلۆرەنسا و دەوروبەریەوە بوو: ناوی داڤنشی، رافاییل، مایکل ئەنجیلو، بارثلمیۆ ئەندریا دیل سارتۆ و کۆریجیو دەرکەوتن. لە ڤینیسیاش جۆرجیونی و تیسیانۆ و تۆنتۆریتۆ و ڤیرونیزە ناوناوبانگیان سنوری بڕی.

سەرباری پاراستنی تایبەتمەندێتی کارکردنی هەریەك لەم هونەرمەندانە بە تەرزێکی جیاواز و تایبەت کە دەبێتە هۆکاری جیایی هەرکامێك لە سەردەمانی، بەڵام ئەمە ڕێ لەوە ناگرێت کە لە هەندێك تایبەتمەندێتیدا هاوبەش نەبن چون ئێمە پێشتر ئاماژەمان بە کێشەی نێوان خواستی لێك چون لەگەڵ سروشتداو خواستی چوون بەرەو کلاسیکیەت دا کە لە پاشاندا

گەر بۆ ماوەی نزیك لە پەنجا ساڵیش بێت کێشەکە بە سەرکەوتنی خواستی کلاسیکیەت کۆتایی هات. ئەم خواستەش شتێك نەبوو دانان و پابەندبوون نەبێت بە ڕێساکانەوە کە ئەو دەمە ئەفرا. هەر بۆیە دەکرێت ئاماژە بە هاوبەشێتی ئەو هونەرمەندانە بدەین لە چەند تایبەتمەندێتی‌یەکی دیاریکراودا کە لە سیماکانی قۆناغی زێڕین ڕێنیسانس دەژمێررێت. گەر ئەم ئەدگارانەش پوخت بکەینەوە ئەوا لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا ئاماژەیان پێ دەکەین:

١-ووردەکاریی سادەکرایەوە لە وێنەدا و پتەوو پڕ لە ژیان دەرئەکەوت لە جۆرهایەکی سروشتی‌دا، هەرچۆن چرچ و لۆچی جل و بەرگ و قوماش و چنراوەکان زیاتر گرنگییان پێ دراو دەرکەوتن بە هێڵی بەهێز جێبەجێ دەکران.

٢-بەرەنجامی گرنگی دانی زیاتر بە زانستی بەربینە پانتاییەکانی قوڵی زیاتر بوون کە چاویان بە ئاراستەی خاڵێکی کۆتایی دووردا دەبرد.

٣-گرنگی دانێکی زیاتر درا بە چارەسەری سێبەرو ڕووناکی کە بووە مایەی زیاتر دەرکەوتنی بەرجەستەیی بینراوەکان.

٤-گوزارشتی زیاتر لە سیماو ڕووخساری کەسەکاندا دەرکەوت، ئەو ڕەق هەڵاتن و سڕەوت و خامۆشی‌یەی لە دەموچاوی کەسایەتیەکاندا بوو دیاردەیەکی هونەرە ڕۆحانی و هونەرە میللی و خۆجێیەتی‌یەکان بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

ئەمە جگە لە گرنگی دانی زیاتر و چونە پێشەوەی توێکاری جەستەی کەسایەتیەکان بەمەش جوڵەی مرۆڤەکان دینامیکی تر بوون و ژیانێکی زیاتریان دەبەخشی. ئەمانە گشت سەرباری قوڵ بوونەوە لە بەرجەستەکردنی بابەتەکاندا، جا ئەم قوڵ بوونەوەیە بینگەیی بێت یاخود تەکنیکی. یاخود هەر هێنانی هەندێ بابەتی دوور لە ئاستی گشتی و نامۆ پێیان.

## هونەرمەندەکان:

### لیۆناردۆ داڤنشی (Leonard da Vinci) ١٤٥٢-١٥١٩

ئاسمان مرۆڤێ دەبەخشێ لە جوانی و زیرەکی و توانا تا سنورەکانی بەشەر بشکێنێ و بگاتە بێهاوتاییەکی خودایی. بیسەلمێنێ بلیمەتیەکەی دیاردەیەکی یەزدانی لە ڕاددەبەدەرە نەك دەستکەوتێکی ئاسایی، لە لیۆناردۆدا سەرباری جوانیەکی ناوازە توانایەکی مەزنمان بینی بە جۆرێك هیچ گیروگرفتێك لەبەردەم ئەودا نەبوو بێ‌چارەسەر.

ڤازاری

لیۆناردۆ ساڵی ١٤٥٢ له ئانشیانۆ -دێیەکی بچووك بووی سەر بـه شاری ڤنشی لـه دایکێکی لادێی له دایك بووه. ڤنشی شارێکه دەکەوێته نێوان بیزاو فلۆرەنساوه، هـەر لەسـەر نـاوی ئـەم شارەشەوه ناونراوه له هەرێمی تۆسکانیا. له کەشـێکی ژیـانی لادێدا پـەروەردە بـووه کـه تیـایدا هۆگری جیهانی سروشت بووه هەر له نشونماکردنی جۆری ڕووەکەکانەوه تا باڵندەو گیانەوەر و مـێروو. ئەمـەش بـۆ خـۆی بـووه مایـەی گرنگیدانـی سـەرەتایی ئـەو بـه ژیـانی ئـەندامی. خۆشەویسـتی ئـەو بـۆ گیانلەبـەران وای لێ دەکـرد بـه بـازاڕدا بگـەڕێ بـۆ کڕینـی بـاڵندەو ئازادکردنی. ڤازاری دەڵێت: بەبێ زێدەڕۆیی داڤنشی لەگەڵ جوانی ڕوخساریدا هێند بەهێز بوو دەیتوانی نالی ئەسپ به دەستی خوارکاتەوه و هێند ناسکیش بوو ئازاری دەکێشا بۆ باڵندەیـەك له قەفـەزدا، بۆیـه نرخەکـەی هـەرچی چەندێ بوایـه دەیدا تـا ئـازادی بکات. ئەمـه سـەرباری جوانی ئەو پیاوه خاوەن شێوازێکی شیرینی گفتوگۆ بوو هاوسەردەمانی هۆگری بوون.

داڤنشی نیگارکێشێکی بێهاوتا و پەیکەرساز بوو، زانایـەکی بیرکـاری و لـه هـەوڵی داهێنـانی فڕۆکـەدا بـوو، فڕینـی باڵندەکـان زۆر سـەرنجیان ڕادەکێشـا، ئـەو لـه دوای ئـەوەی لـه خوێندنـی یاسادا ئاسوده نەبوو (خواستەکەی باوکی که ویستی وەك باپیری یاسا بخوێنێ و ببێته پیـاوێکی یاسایی بەدی نەهێنا) خوی دایـه بیرکـاری بـه جۆرێـك کـه مامۆسـتاکانی دەستەوسـان بـوون لـه وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیدا، بۆچوون به دوای سەودایی فڕینی باڵندەشدا کەوته نیگارکێشـانی باڵنده له هەموو جۆره حاڵەتێکی جوڵەو فڕینیدا[٧].

باوکی ئەم نیگارانەی بردە لای ڤیریکۆ، ئەم مامۆستایه سەرسام بوو بەم نیگارانـەو ئامـاژەی بەوە دا که ئەم منداڵه زۆر پێویسته بـەردەوام بێـت لـه نیگارکێشـاندا، بـەم شـێوەیه داڤنشـی بـه هاوڕێیەتی (بیروجینو) له ئەتێلەکـەی ڤـیریکۆدا کـاری کـرد وەك یارمـەتیدەرێکی مامۆسـتاکەی لەو کارانەدا که له فلۆرەنسا پێی سپێردرا له میـانی سـاڵانی (١٤٦٩-١٤٧٨). ڤـیریکۆی زەرەنگـەر و پەیکەرسـاز زیـاتر کارامـەیی لـه پەیکەرسـازیدا هەڵکـەوتوو بـوو، بۆیـه گـەر بڕووانینـه کـاره پەیکەرەکانی لێکچونێك دەبینین لەگەڵ نیگاره سەرەتاییەکانی داڤنشـیدا، کـه گـەواهی کەوتنـه ژێر کاریگەریی مامۆستاکەی دەدات، جگه له مامۆستاکەی لەو دەمـەیدا کاریگـەریی نیگـارکێش (پۆلایۆلا)شی لەسەر بوو.

دەگێڕنـەوە سـاتێ ڤـیریکۆ توانـای داڤنشـی دەبینێـت چـەندێ چووەتـه پێشـەوه لـه تـابلۆی (یوحـەننای پاکژکـەرەوە) دا، بـه ڕاددەیـەك سـەرو توانـای نیگارکێشـانی ئـەم کـەوتووه (بـه بـەراوردکاری نێـوان دوو فیگـەری مەسـیح و یوحـەننا کـه ڤـیریکۆ کێشـاونی و دوفیگـەری

فریشتەکان کە داڤنشی بەرجەستەی کردون) ڤیریکۆ بۆ یەکجاری واز لە نیگارکێشان دەهێنێتو تەنها لە پەیکەرسازیدا کاردەکات.

لیۆناردۆ- لە قۆناغی یەکەمی ژیانیدا کە دەکەوێتە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەوە- کۆمەڵێ کاری هونەری بەرهەم هێنا لە نێوانیاندا تابلۆی (مزگێنی) کە لە نێوان ساڵانی (١٤٧٢-١٤٧٣) دروستی کردووە، بەڵام لە هەموویان دیارتر تابلۆی (پاکیزەی بەردەکان)ە کە نمونەی ئوستادیو توانایە لە پیشاندانداو بێ وێنەییە لە گوزارشت کردن و هاوسەنگی کردنی نێوان جوانیەکی سروشتی و جوانیەکی نمونەییدا. دوای ئەوەی داڤنشی نامەیەکی بۆ دیوکی میلانۆ نارد ساڵی ١٤٨٣ (کە تیا نووسیبوو من ئامێری جەنگی جۆراوجۆر دەتوانم دروست بکەم و پردی بزۆك و گالیسکەی خێرا بە ئەفرێنم هەروەها من ئەندازیارێکی کارامەم.. لە دواییشدا دەتوانم پەیکەر لە مەرمەڕوو برۆنز و بەرد دروست بکەم و وەك بە تواناترین کەسێك نیگاربکێشم..).

هەر بۆیە ئەو دەمەی سەفەری کرد بۆ میلانۆ تابلۆی (پاکیزەی بەردەکان)ی لەگەڵ خۆیدا برد و لە نێوەندی ئەویش، پێشوازی گەرمی لێکراو چەندان پرۆژەو کاریان پێبەخشی، لە دیارترینیان تابلۆی سیسیلیا جالیرانی بوو. ئەم ماوەیە داڤنشی ڕۆڵی خۆی وەك نیگارکێشی کۆشك بردە سەرو لە جوانترین کارەکانی بەدی هێنا لەوانە دیواربەندی (دوا شێو)ە کە لەسەر داخوازی یەکێ لە خەڵکی شاری میلانۆ دروستی کرد بۆ هۆڵی نانخواردنی برایانی دۆفیکان لە دێری ژنە پیرۆزمەند ماریادیل گراسیا لە نێوان ساڵانی (١٤٩٥-١٤٩٨). داڤنشی چ لەم تابلۆیەدا چ لە تابلۆی (پاکیزەی بەردەکان)دا گرنگی‌یەکی باشی داوە بە سێبەری کەسایەتیەکان و دانانی سێبەر لە تابلۆداو گرنگی پێدانی بە ڕاددەیەکی پێویست لە دوا داڤنشی‌یەوە بووە و بە تایبەت دوای ئەم تابلۆیانە. دەوترێت تابلۆی یەکەمیان لەژێر کاریگەریی نمونەیی زەوقی غوتیدا کراوە، بەڵام ئەوەی دیارو ئاشکرایە گرنگی نەدانی داڤنشی‌یە لەم دوو تابلۆیەدا (یاخود لە کارەکانی ئەم قۆناغەیدا گشت) بە ڕەنگ، ڕەنگکردنێکی ڕاستەوخۆ کراوە کە لەسەر تەرزی کارەکانی "بۆتشیللی" بێت.

دەرباری تابلۆی (دواشێو) زۆر وتراوەو نووسراوە، لە دوای خۆشیەوە شارەزا هونەرییەکان یەك لە دوایەك لە ماوەی جیاجیادا کاریان لەسەر چاکردنی ئەو بەشانەی کردووە کە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار تێك چون. لە جوانترین شتێك لەم تابلۆیەدا ئەو توانا گوزارشتیەیە کە هونەرمەند بۆی بەرجەستە کردوین لە میانی ئەو جوڵە کۆمەڵیەوەو ئەو ساتەوەختەش کە بۆ ئەو گوزارشت کردنەی هەڵبژاردووە، ئەوانەی پێش داڤنشی کە ئەم بابەتەیان کردبێتە ناوەڕۆکی کارێکیان هەمیشە ساتەوەختێکی پڕ خامۆشی یان بۆ هەڵبژاردووە، کە هەر کامێك لە

قوتابیەکانی مەسیح سەرقاڵی تێڕامانی خۆیانن تیایدا، بەڵام لیۆناردۆ لوتکەی ڕووداوەکەی هەڵبژاردووە ساتێ مەسیح ئاماژە دەدا بەوەی یەکێکیان خیانەتی لێدەکەن، لێرەدایە ئەم تابلۆیەی هونەرمەند خاوەن سیمایەکی درامیەو گرنگی تیا دراوە بە توێژینەوەی هەڵچوونەکانو هەست و سۆز و خولیا تایبەتەکان.

لەم تابلۆیەدا خواستی کلاسیکی داڤنشی بە ڕوونی دەرئەکەوێت لە پێش هەموو شتێکەوە بەو مەندیەی بەخشیویەتیە مەسیح و کەمی بەکارهێنانی ڕەنگ و گرنگی دان بە زانستی بەربینە وەك دەبینین هێڵەکانی بنمیچەکە لە کۆتاییدا لە خاڵی پەنجەرەکەدا یەکدەگرنەوە کە لە پشتێنەی کارەکەدایە، ئەو ڕووناکیەی لە پشت سەری مەسیح دایە و سەرچاوەکەی ڕووناکی پەنجەرەکەیە وەك هالەیەکی چواردەوری سەری بەدەردەکەوێت لیۆناردۆ زۆرکاری ئامادەکاری بۆ ئەم تابلۆیە کردووە پێش جێبەجێکردنی کۆتایی کە هەمووی ئاماژەیەکن بە گرنگی و بایەخ پێدانی ئەو بە زانستی بەربینە. لە گرنگی دانیشیدا بە زانستی توێکاری تێبینی ئەوە دەکەین دەستی هەموو کەسایەتیەکانی بە مەبەست دەرخستووە، چون ئەو بڕووای وابوو گەر نیگارکێشی ڕەسەن بیەوێ بە وردی گوزارشت لە جەستەی ئادەمیزاد بکات، دەبێت ئاگاداری وردترین ئەندامی لەشی مرۆڤ بێ. سەرەتای بایەخ دانی داڤنشی بە زانستی توێکاری دەگەڕێتەوە بۆ تابلۆ سەرەتاییەکانی (تابلۆی پەرستنی مەجوسی) کە لەم تابلۆیانەدا توێژینەوەیەکی پێش وەختی زۆر دەبینین لەسەر لایەنی توێکاری فیگەرەکان، پێش کردنیان بە تابلۆ، ئەم پابەندیە قوڵ و هەمەکیە بە توێکاریەوە داڤنشی کردە خاوەنی باشترین کتێب لەسەر ئەم زانستە کە تا سەردەمی ئەو دەرکەوتبێت، پێدەچێت گرنگی دانی ئەو هەر لە سەرو وەختی سەرەتای کارکردنیەوە بەم زانستە بەشێکی باشی بگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی مامۆستایەکی تری کە هونەرمەند سنیوریللی[٨] بوو، بایەخدانی داڤنشی بە توێکاری هەر بە مرۆڤەوە نەوەستا بەڵکو گیانلەبەرانیشی گرتەوە.

داڤنشی لە میلانۆ لە بانگهێشتی دیوك سفورتزادا حەڤدە ساڵ مایەوە و پەیکەرێکی بۆ فرنشیسکۆ سفورتزا دروست کرد لەو میانەدا، دوساڵ تێپەڕی لە نێوان کۆتایی هاتن بە تابلۆی (دواشێو)[٩] و بەجێهێشتنی میلانۆ لەلایەن لیۆناردۆوە. ئەم دو ساڵە بە داوایەکی ڕەسمی مایەوە وەك زانایەك و داهێنەرێك کاری دەکرد و پلانی بەرگری کردن لە لۆمباردیای دانا دژ بە داگیرکاری فەرەنسیەکان.

لەبەر باری نائاسایی جەنگ لە میۆلانۆدا، ئەو پەیکەرە مەزنەی بۆ سفورتزای کردبوو کە هەر ئەسپەکەی نزیك هەشت مەتر بەرز بوو بێ لە ئەسپ سوارەکەی سەری، پێداویستی زۆری

جەنگ بە ماددەی ئاسن و برۆنز ڕێگەیان نەدا پەیکەرەکە قاڵبی بۆ بکرێ بە ئاسن و بە برۆنز دابڕێـژرێ، ئەوکاتـەش کـە هێشتا دەنگی جـەنگ نـەبوو، لۆدڤیکۆی ئـەمیری میلانـۆ لـە یـادی ژنهێنانی خۆیدا پەلەی لە داڤنشی کرد بۆ پـەردە لادان لەسـەر پەیکەرەکە کـە هێشتا هـەر بـە قوڕ بوو، گەرچی تەواو بووبوو، وەك باس دەکرێت ئەو پەیکەرە شتێك بووە سەرسوڕهێنەر، لە هەموو لایەکی ئیتالیاوە خەڵکی دەهـاتن بـۆ سـەیری و باسـکردنی گەیشتە دەرەوەی ئیتالیـاش. داڤنشی بۆ بەدی هێنانی ئەسپێکی وا زەبەلاح زۆر گەڕاو توێژینەوەی لەســەر جۆرەهـای ئەسـپ کرد، لەهەر جۆرێك دا شتێك یا چەند شتێکی بـەرچاو دەکەوت کە بـە دڵی نـەبێت، بۆیـە لـە دواجاردا پەنای بردە بەر ئەندێشـەی بێهاوتـای خـۆی بـۆ بـەدیهێنان و ئـەفراندنی ئەسـپێکی نمونەیی بەڵام بە داخەوە وەختێ ئەمیری میلانۆ تێك شـکاو فەڕەنسـیەکان هاتنـە نـاو شـاری میلانۆوە، سەربازە فەڕەنسیەکان ئەم پەیکەرەیان کردە نیشانەو مەشقیان لەسەر دەکرد و لـە هەموو لایەکەوە تیریان تێدەگرت. تـا پەیکەرەکـە بـە تـەواوی ڕووخـا، لیۆنـاردۆ بـەم کـارە زۆر دلگران بـوو کـە لەبـەرچاوی خۆیـدا کارەکـەیان تێکشـکاندو لـەناویان بـرد، هەرچـەندە ئـەمیری فەڕەنسی فەرمانڕەوای میلانۆ زۆر پۆزشی بۆ هێنایەوەو داوای لێبوردنی کـرد لـە هـەمان کـاتدا پێشنیاری بۆ کرد کە لای ئەو بمێنێتەوە و مەلیکی فەڕەنسی بە داوایـەکی تایبـەتی بانگهێشـتی کردووە بۆ فەڕەنسا بۆ پاریس هەموو هۆکارێکی حەوانەوە و چاودێری و ڕێزلێنانی بـۆ دانـاوە، بەڵام ئەو کارەساتە بە جۆرێك دڵی داڤنشی شکاندبوو نەیتوانی ئـەو داوایـە قبـوڵ بکـات و زۆر بە ڕێزەوە داواکانی ڕەت کـردەوەو میلانـۆی بەجێهێشـت بـەرەو مـانتوا کەوتـەڕێ لەسـەر داوای خوشکی ژنەکەی لۆدڤیکۆ کە ژنی حاکمی ئەو شارە بوو، ئەم ژنە زۆر وابەستەی هونەر بوو لـە بەرزترین ئاواتەکانی ئەوەبوو داڤنشی سەردانی بکات و وێنەیەکی تایبەتی کەسایەتی خۆی بـۆ دروست بکات، زۆر بە گەرمی پێشـوازی لـە لیۆنـاردۆ کـرا، بـەڵام ئەوکاتـە هونەرمـەند ئـارەزوی نیگارکێشانی نەمابوو هەرچی چۆنێك بێت پۆرترێتێکی بۆ کـرد بـەبێ ڕەنـگ لەسـەر کاغـەز و مـانتوای بەجێهێشـت بـەرەو ڤینیسـیا کـە ئەودەمــە لــەژێر هەڕەشــەی داگیرکــاری تورکــە عوسمانیـەکاندا بـوو، ئـەو هەرچـەندە بـۆ ئـەوە چـوو بـوو بـۆ ئـەوێ تـا توێژینــەوە لەســەر ئەسـپەکەی پیرۆزمـەند مەرقـەس بکات چون ناوبـانگی پێـش خـۆی کـەوتبوو بـۆ ئـەم شـارە، پێشوازیەکی گەرمی لێکراو ڕێزێکی زۆری لێنراو داوای لێکـرا کـە لـە دانـانی نەخشـەی بـەرگری لەم شارەدا بەشداری بکات. هەر ئەودەمە هونەرمەند جلی ژێر ئاوی داهێنـا بـە ماددەیـەك کـە ئاو کاری لێنەکات هەرچۆن هێڵکاری بـۆ چـەکێکی نـهێنی ترسـناك کـرد کـە وردەکاریەکـەی تیـا نەدرکاندبوو هێندە نەبێت کە سەدان سەرباز بە یەکجار لەناودەبات ئەمــە سـەرباری زرێپۆشـی

ژێر دەریایی بۆ تێکشـکاندنی کەشـتی سـەربازی، بـەڵام هیـچ کـامێك لـەم داهێنانانـە جێبـەجێ نـەکران لەبـەر تێچونـی پارەیـەکی زۆر و گۆڕانـی نەخشـەی عوسمانیـەکان لـە ئاراسـتەیاندا بـە لایـەکی تـردا. لـە سـاڵی ١٥٠٢ چاوی بـە سـیزار بورجیـای سـەرکردەی ئـەو هەرێمـە کـەوت کـە میکیـاڤیللی ڕاوێژکاری بـوو، ئـەو کردیـە ئـەندازیاری تەلارسـازی و سـەربازیی خـۆی هـەرچۆن پلەیەکی سەربازی پێبەخشی کـە نازنـاوی ژەنـەراڵ بـوو، بـەڵام هێنـدەی نـەبرد سـیزار کـوژراو داڤنشی بـەرەو فلۆڕەنسـای زێـدی خـۆی گەڕایـەوە، گەیشـتبووە تەمـەنی پـەنجا سـاڵی، جوانـی و گەنجێتی لە ڕووخساریدا نەمابوو قـژی ڕووتـابۆوەو سـپێتیەکی زۆر لـە ڕیشـی دابـوو، بـەڵام لـە بوونیادیا هەر پتەوو بەهێز بوو بایەخێکی ئـەوتۆی نـەدەدا بـە جـل و بـەرگ و دیمـەنی، وەها دەرئەکەوێت کە لە تەمەنی خۆی گەورەترە.

بەڵام بە تەنها هـەر ئـەم نـەبوو کـە گۆڕابـوو بـەڵکو فلۆڕەنسـاش لـەم گۆڕانـەدا بەشـداربوو، فـەرمانڕەوایی خـێزانی میدتشـی بەسـەرچوبوو ببـووە کۆمـارێك ئەنجومـەنێك لـە پیـاوە خانەدانەکان و بازرگانە دەوڵەمەندەکان ڕێبەریان دەکرد ئەوکاتە فلۆڕەنسا لە خۆ ئامادەکردندا بوو بۆ جەنگێك دژ بە شاری بیزا، بێگومـان داوا لـە لیۆنـاردۆ کـرا کـە نەخشـەی جـەنگیان بـۆ بکێشی ئەویش گۆڕینی ڕێڕەوی ئەو ئاوەی بە باش زانـی کـە (ڕووبـاری ئـارنۆ)یـەو دەچێتـەوە سەر شاری بیزاو بەمەش ئاو لە دوژمنەکەیان دەبڕێت، نەخشەکە پەسـەندکراو دەست کـرا بـە هەڵکەندنی ڕێڕەوێکی تر بۆ ڕووبارەکە، کارەکە زۆر بـە خـاوی دەڕۆیشـت، لـێرەدا بـوو داڤنشـی ئامێرێکی داهێنا کە زووبەزوو زەویەکە هەڵکەنێ، بەم شێوەیە ڕێڕەوی ئاوەکە گۆڕا بۆ هەزاران مەتر لە دەشتێکدا، بەڵام لە پڕێکدا کارەکە وەسـتا بـە یـەکجاری بـەرەنجامی مۆرکردنـی ئاشـتی نێوان هەردو شارەکە، داڤنشی بیری کردەوە کە ئاوەکە بە چەند شارۆچکەو لادێیەکی سـەر بـە کۆماری فلۆڕەنسادا بەرێت ئینجـا بچێتـەوە سـەر ڕێـڕەوی بنـەڕەتی خـۆی بـەڵام پرۆژەیـەکی وا داهاتێکی زۆری تێ ئەچوو جێبەجێ نەکرا وەختـێ زسـتان هـات و ئـاو زۆر بـوو لافـاو هەسـتاو بووە کارەسات لە ڕێڕەوە نوێکەیدا بە دەیـان مـاڵی جوتیـاران بـوو بـە ژێـرەوەو سـەدان کێڵگـە کاول بوو، هەرچەندە کارەساتەکە سروشتی بوو بەڵام چاوی لۆمـەکردن و تاوانبـارکردن چووە سەر داڤنشی بەم شێوەیە لیۆناردۆ ڕووەو شوێنی لەدایك بوونەکەی دێ (ڤنشی) ڕۆیشت لەوێ زیاتر بە هەوڵی فڕینەوە خەریك بو، ئەوەی دۆزیەوە کە دەبێت مرۆڤ بۆ فڕینی پـەنا بەرێتـە بەر دوباڵی گەورەی وەك شەمشەمەکوێرە. (هەر هـەمان کـات بـوو کـە پەڕەشـووتی داهێنـا) لـە پێستەو چـەرم و قوماشـی پتــەو بــاڵێکی گــەورەی بــۆ خــۆی دروســت کــرد لەســەر لوتکــەی چیایەکەوە بە ناوی (سەڤاقوش) خۆی هەڵدایە خوارەوە، هەوڵەکەی شکستی هێنـاو خۆشـی لـە

مردن گەڕایەوە، ئەمانەی گشت بە نـهێنی کـردو ئـەو کەسـانەش کـە ئـەم بـاڵدارە زەبەلاحـەیان دوراو دوور بینی سەرسام بوون و لەهەر شوێنێك باسیان دەکرد باوەڕیان پێنـەدەکرا. ئیـتر بـۆ دواجار وازی لە هەوڵی فڕین هێنـاو گەڕایـەوە سـەر نیگارکێشان و تـابلۆ تـا ڕۆژێـك یـەکێك لـە گەورەپیاوانی فلۆرەنسـا بـەناوی (فرانشسـكو دل جوکونـدا) داوای لێکـرد نیگـارێکی ژنەکـەی بـۆ بکێشێ کە ئافرەتێکی گەنجی جوان بوو بە ناوی (مۆنالیزا)، بۆ یەکەمین جار داڤنشی هەستی بە خۆشەویستی کـرد کاتێ چاوی بـەم ئافرەتـە کـەوت، ئەودەمـە تەمـەنی پـەنجاو چـوار سـاڵ دەبوو، لە ساڵی (١٥٠٣ تا ١٥٠٦)[١٠] کـاری تیـا کـردووە، تیپێکـی مۆسـیقای دانـاوە لـە سـاتەوەختی کـارکردنیدا تـا ئـەو خـەندە ئەفسـوناویەی سـەر دەمولێوی مۆدێلەکـەی تێـك نـەچێت، وەختـێ کارەکە زۆر دەخایەنێت مێردی ژنەکە شك پەیدا دەکات و داوای بـە پەلـە تـەواوکردنی دەکات، بەڵام داڤنشی بە بیانوی ئەوەی پشتینەی مۆدێلەکە بە دیمەنێکی سروشتی پڕبکاتەوە، تابلۆکە دەباتە دەرەوە، چـون نەیویسـت تابلۆکـە بداتـەوە بـە مێردەکـەی. کـاتێکیش بانگهێشـت کـرا بـۆ پڕۆژەی ڕازاندنەوەی هۆڵـی ئەنجومـەنی ڕاوێژکـاری فلۆرەنسا، هێنـدەی تـر بیـانوی بـۆ بـوو تـا تابلۆی مۆنالیزا نەداتەوەو دوای بخات. لەم تابلۆیەدا ئەفسـوونێکی نادیـار هەیـە، ڕەخنـەگرەکان هـەتا ئێسـتا گفتوگـۆو دیـالۆگی لەسـەر دەکـەن، چاوەکـانی بـۆ هـەرکوێ بچـی سـەیرت ئەکـەن، خەندەکەی سەرلێوی ڕازێکە بۆ خۆی کە تا ئەمڕۆ نەزانراوە، زۆری لەسەر وتـراوەو نووسـراوە، تەنانـەت لای خـودی داڤنشـی خـۆی زۆر ئـازیز بـووە، هەربۆیــە لــە دوای مێـژووی دەرکردنــی تابلۆکە لە ماڵی (فرنشسکو دیل جیوکوندا) لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ هـەموو جێگەیـەکی بـردووە، لـە پێنـاو مۆنالیزیـادا زۆر داوکـاری تـری ڕەت کردۆتـەوە، لــە نـاوازەترین ئاسـەواری هونـەرە لـە سەراپای سەردەمەکاندا کە باڵی کێشاوە بەسەر هەست و سۆزی نووسەر و شاعیراندا لـە هـەموو نـەوەکان، هـەر لـە ڤـازاری تـا ڤـالێری، ئێسـتاش بــە بـەردەوامی هــەر ڕۆژەی لێکدانەوەیــەك و ئاماژەیـەکی نـوێ لـەخۆ دەگرێـت، ســاڵانە بــە هــەزاران کـەس لـە دەوری خـول دەخـۆن بـۆ تەماشاکردنی، هونەرمەندان بە چەندەها جۆر دروستیان کردۆتەوەو سروشـتیان لێوەرگرتـووە. نـاپلیۆن لــە ژووری نووســتنەکەی خــۆی داینــاوە کاتــێ فــەرمانڕەوایی فەڕەنســای کــردووە. خۆشەویستی داڤنشی بۆ ئەم تابلۆیە تا ئاستێك بووە دەستبەرداری هەموو مـاڵ و شـتوومەك و کارەکانی تری دەبێت تەنها کتێبەکانی و نووسینەکانی و ئەم تابلۆیە نــەبێت هیچـی تـر لەگـەڵ خۆی نابات لە چونیدا بۆ میلانۆ جارێکی تـر لـە دوای پـڕۆژەی هۆڵـی ئەنجومـەنی ڕاوێژکـاری. ئەمـە بـێ لـەوەی کـرێی کارەکەشـی وەرنـەگرتووە تـا خاوەنەکـەی بەمـە دڵنیـا بکـات کـە بــۆی دەگێڕێتەوە.

## لیۆناردۆ و مایکل ئەنجیلۆ، پرۆژەی هۆڵی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری فلۆڕەنسا

ئەوکارەی حکومەتی فلۆڕەنسا داوای کردبوو ڕازاندنەوەی هۆڵی ئەنجومەنەکەی بوو بەو ڕووداوانەی لە شەڕی ئینجیارا ی نێوان فلۆڕەنساو میلانۆدا ڕوویان داو فلۆڕەنسای تیا سەرکەوت. ئەوکاتە لیۆناردۆ دەستنیشان کرا بۆ ئەم کارە، وەختێ مایکل ئەنجیلۆ (کە دواتر دێینە سەر باسکردنی) بەم کارە دەزانێت (کە ئەوساتە گەنج بوو لە نزیکی بیست و پێنجساڵێك دەبوو) ئامادەیی خۆی پیشان دەدات بە ڕازاندنەوەی بەشێکی ئەو هۆڵە، بۆچی؟ تا بەرەنگاری داڤنشی بکات و بیجولێنێ، دەستەی ئەنجومەنیش ڕەزامەندییان پیشان داو پێیان خۆش بوو چون دەیانزانی داڤنشی لە کارکردندا خاوە.

داڤنشی پێشتر ناوی ئەم گەنجەی بیستبوو چاوی بە پەیکەری (داود)ەکەی کەوتبوو، سەرسام بوو بە هەڵکەوتویی و بە توانایی، وەك بەرامبەرێکی ترسناك دەیبینیەوە کە لە میانی داهێنانی شاکارەکانی پەیکەرو نیگارکێشاندا پێشی بکەوێت. لەبەر ئەمە پەیوەندی نێوانیان باش نەبوو، ئەمە جگە لە جیاوازی خوو نەریت و سروشتیان و تەمەنیان لیۆناردۆ پیرو بێ دەنگ و بەدوور لە خەڵکی و سەرکز، بەڵام مایکل ئەنجیلۆ گەنج و پڕ لە ڕۆحی بەگژاچونەوە و توڕەیی خێراو هەرچۆن زۆر دڵنیا بە بلیمەتی خۆی.

تا جارێك هەندێ هاوڕێی مایکل ئەنجیلۆ لە گۆڕەپانێکدا داڤنشی ڕادەگرن و پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن دادوەر بێت لە نێوانیاندا دەربارى مەسەلەیەك كە بە شاعیری ئیتالی (دانتی ئالیجیاری) پەوە پەیوەست بووە. بەڵام لیۆناردۆ کە بێ زانیاری مایکل ئەنجیلۆی هاوڕێیانی نەزانیوە دەربارى ئەم شاعیرە، زۆر بە سانایی وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ: (وا باشترە بچن لە مایکل ئەنجیلۆ بپرسن چونکە ئەو شارەزاترە لە دانتی و شیعرەکانیدا). وەختێ مایکل ئەنجیلۆ ئەم وەڵامە ئەبیستێ، لەناو کۆمەڵێکدا دانیشتووە هەڵدەسێتە سەرپێو چاوەکانی سوردەبن لە توڕەییدا، وای لێکدایەوە کە بەرامبەرە پیرەکەی گاڵتەی پێدەکات دواتر بە دەنگێکی پڕ بەرەنگاری و ڕق و گاڵتەپێکردنەوە هاواری لێکرد: (جا بۆچی خۆت بۆیان باس ناکەیت، ئەی ئەو پەیکەرسازە ترسناکەی نمونەیەکی بۆ پەیکەری ئەسپێ دروست کردبوو نەیزانی بوو چۆن بە برۆنز دایڕێژێ!.. بە ڕاستی خەڵکی میلانۆ بێمێشك بوون.. چونکە کارێکی وەهایان دا بووە یەکێکی وەك تۆ). داڤنشی تەنها بە وشەیەکیش وەڵامی ئەم گاڵتەپێکردنەی نەدایەوە، بەڵکو بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت. بەڵام ئەم خورپەیە سەرسامی کرد چون چاوەڕێی شتی وای نەدەکرد.

لێرەوە پرۆژە هاوبەشەکەیان بوو بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تاقیکردنەوەی ترسناک، هەردوو بلیمەت کەوتنە کارکردن لە بێ دەنگیەکی لێوان لێو لە بەرەنگاری و پێشبڕکێدا. زووبەزوو هۆڵە فراوانەکە بووە جێ کۆبوونەوەیەکی قەڵەباڵغی خەڵکی، هەموو ڕۆژێ خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆدەبوونەوە زۆر بە بایەخ پێدانەوە چاودێری هەردوولایان دەکرد، هەر کۆمەڵێکیان لەلایەك وەستابوون بەرامبەر یەکتری ببوون بە دوو کەرتەوە لە لایەنگرانی لیۆناردۆ و لە لایەنگرانی دلگەرمی بەرامبەرەکەی، تا وای لێ هات مشت و مڕی زۆر توندوتیژ لە هەموو جێگەکان بەرپا بوو، لە شەقامەکان و گۆڕەپانەکان و ماڵەکاندا، دەربارەی ئەوەی چ هونەرمەندێکیان بە تواناترە لەوی تریان لە شێوازی کارکردن و جیاییدا، فلۆرەنسای ئەو ڕۆژگارە باسێکیان نەما ئەم باسە نەبێت، تەنها گرفتیان بوو بە بەدواداچوونی گۆڕانکارییە ڕۆژانەییەکان لە کارکردنی هەرکامێکیاندا.

ئەو دیمەنەی مایکل ئەنجیلۆ هەڵیبژاردبوو کۆمەڵێك سەربازی ڕووتی نمایش دەکرد کە خۆیان لە ڕووبارێکدا دەشۆن تا بەهرەی لە بن نەهاتوی خۆی لە کێشانی ماسولکەکانی لەشی مرۆڤدا بۆ خەڵکی بخاتەڕوو لە ڕێی دیمەنێکی وەهاشەوە گوزارشت لەو هەموو ووزەو چالاکییە کۆکراوەیە بکات کە هێمایەکن بۆ هێز و نەهامەتی. بەڵام لیۆناردۆ ناوجەرگەی شەڕێکی توندوتیژی هەڵبژارد کە تیایدا ئەسپ سوارەکانی هەردوولا لە جەنگێکی کوشندەدان. شارەزایی ئەو لە هونەرەکانی جەنگ و نەخشەکانی وای کرد کە دیمەنەکە هێند بەرجەستە بێت وەك ئەوەی بووبێتە واقعێکی زیندو بۆ جەنگێکی ڕاستەقینە لەو بنمیچە[11] بەرزەدا. بە جۆرێك بینەرەکەی وای هەست دەکرد کە ئەسپەکان وا لە درزی دیوارەکانەوە دێنە دەرەوەو لە جوڵەیەکی چاوترووکاندا سوارەکان فڕێ دەدەنە سەر زەوی هۆڵەکە.

دوای چەند مانگێك ساتێ کارەکان تەواوبوون، مایکل ئەنجیلۆ چیتر نەیتوانی سەرسام بوونی زۆری خۆی بە ئەفراندنی بەرامبەرە پیرەکەی بشارێتەوە، بەڵکو گەواهی دا بە ئوستادی ئەو و لەبەردەمیا نوشتایەوە. هەتا خودی لیۆناردۆ خۆشی کە ناسراوبوو بەوەی گاڵتەی بە ئەنجامی کارەکانی خۆی کردووە، ئەم جارە نەیتوانی دڵخۆشی خۆی بەم شاکارە نایابە دەرنەخات. ئەو ڕۆژە خەڵکی فلۆرەنسا کۆبوون و کۆك بوون لەسەر ئەوەی داڤنشی بالاترە لە توانایدا بەسەر بەرامبەرەکەیدا بالاییەکی دیارو ڕوون، هونەرمەندی پیر زۆر شادمان بوو بەم سەرکەوتنە، بەڵام ئەم خۆشیە دوای چەند ڕۆژێ بەبادا چوو، نەك هەر هونەرمەندەکە بەڵکو شاری فلۆرەنساش زۆر زویر بوون، چون داڤنشی وەك خویەکی ئاسایی خۆی جۆرە کەتیرەیەکی لەناو ڕەنگەکانیدا بەکاردەهێنا کە دەرەنگ وشك دەبۆوە و توانای پیانووسانی بە دیواردا بەهێز

دەكرد، بەڵام بۆ ئەوەی تەم و تەپوتۆز و مەگەز نەنیشێتە سەر كارەكەو پیا نەنووسێت، ئەم كێشەیەی بە ئاگركردنەوە لە جێگەیەكی ژورەكەدا چارەسەر دەكرد، هەروا‌شی كرد لە هۆڵی ئەنجومەندا پاش تەواوبوونی كارەكەی بەڵام بە ڕێكەوت ئاگرەكە كلپەی كرد و بەرزبۆوە بۆ ئاستێكی نزیك لە بنمیچەكە، تا وای كرد ڕەنگەكان تێك بچن و تێكەڵ بن بەسەریەكدا، ئەوكارە مەزنە تێك چوو كە بە درێژایی ئەو چەند مانگە كرابوو. دەستەی ئەنجومەن سەرزەنشتی داڤنشیان كرد و داوای دووبارە دروست كردنەوەیان لێ‌كرد، بەڵام ئەو دەیزانی ئەمە ئەستەمەو جارێكی تر ناتوانێت بەو گەرموگوڕیە كاربكاتەوە، لەوەبەدوا توانای هیچی نەما ئەوەندە نەبێت بیربكاتەوە چۆن فلۆڕەنسا بەجێ بهێڵێت بەرەو میلانۆ جارێكی تر، چون ئەو بانگهێشتەی بە بیركەوتەوە كە جێگری مەلیكی فەڕەنسی لە میلانۆ كردی، ڕێكەوتیش وای كرد هەر لەو كاتەدا داوایەكی ڕەسمی لە میلانۆوە كرا بۆ داڤنشی كە بچێتە ئەوێ بۆ ڕێكخستنی میهرەجانێك لە پێشوازی كردنی مەلیكی فەڕەنسی لویسی دوانزەهەمدا، جگە لەم ئەركەش مەلیكی فەڕەنسی خۆی داوای ئامادەبوونی داڤنشی كردبوو چون ئارەزوویەكی بەتینی هەبوو بۆ ناسینی ئەم بلیمەتە، دەستەی ئەنجومەنیش بۆیان نەدەكرا ڕەتی داوایەكی وها بدەنەوەو فەڕەنسی‌یەكان لە خۆیان بئاڕۆژێنن و ئەمان تەنها كۆمارێكی بچوك بوون. بەم شێوەیە داڤنشی فلۆڕەنسای جێ‌هێشت دوای ئەوەی بەڵێن نامەیەكیان پێ نووسی كە لە ماوەی سێ مانگدا بگەڕێتەوە بۆ دروست كردنەوەی كارەكەی، هەرچۆن نەیان هێشت سەفەر بكات تا بڕێكی گەورە پارەیان لێ‌سەند وەك بارمتەیەك بۆ گەڕانەوەیی و جێبەجێكردنی كارەكەی لێ‌ داواكرابوو. ئەویش زۆر لەوە زیاتری كرد وازی لە هەموو كەرەسەو شتومەك و پێداویستی‌یەكی هێنا تەنها تابلۆی مۆنالیزاو كتێب و نووسینەكانی برد.

فەڕەنسیەكان ڕێزێكی زۆریان گرت و خودی لویسی دوانزەهەم داوای لێ‌كرد لەگەڵیا بگەڕێتەوە بۆ فەرەنساو بیكاتە ڕاوێژكاری سەربازیی و ئەندازیار و نیگاركێش و هاوڕێی تایبەتی خۆی، بەڵام داڤنشی داواكەی ڕەت كردەوە، لە میلانۆ خزمەتێكی زۆری دەكرا لەوێ مایەوەو سەرقاڵی گەڕانە زانستی‌یەكانی خۆی بوو لە توێژینەوە تەوژمە هەواییەكان و توخمەكانی تیشك كە بەرەو توێژینەوە لە چاوی مرۆڤی برد، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەرەو مەسەلەیەكی ترسناكی ڕاپێچ كرد، ئەویش توێكاری كردنی چاوی ئادەمیزاد بوو، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە لاشەی مرۆڤ هەبوو، كەوتە هەڵدانەوەی گۆڕ و ڕفاندنی لاشەی مردوی تازە بە تازەو توێكاری كردنی ئەمەش شتێك بوو بۆ ئەو سەردەمە زۆر مەترسیدار و پڕ سەركێشی‌یە، داڤنشی توانی فەرمانڕەوای میلانۆ قەناعەت پێ بكات كە ئەم توێكاری كردنە

چەند سودی هەیە و پێویستە لە پێناو خزمەتکردنی زیندووەکاندا. دواتر ڕێی پێدرا لە خەستەخانەکاندا لەوپەڕی لوتکەی نهێنیدا ئەم کارە ئەنجام بدات، لەبەر ڕووناکیەکی کەم و بۆن و بەرامێکی زۆردا، تێبینییەکانی لە دەفتەرێکی تایبەتدا دەنووسی بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتریش بە نیگارکردن کارەکانی تەواو دەکرد، لێرەدا بوو لە گرنگی نیگارکێشان تێگەیشت لە میانی شیکردنەوەو باس کردن و لێکدانەوەی تێبینییەکانیدا، لە دەفتەرەکەی ئەوکاتەیدا نووسیویەتی: وا باشترە یاخود زۆر زیاتر وردبینانەتر و بەسودترە، کە مرۆڤ ئەوەی دەیەوێت وەسفی بکات لە ڕێی نیگارکردنیەوە بێت نەك بە ووشە.

نیگارەکانی هێند بە سەلیقەو وردبینیەوە ئەنجامدا کە ڕاستی زانستیانەیان گەیشتۆتە ئاستێکی بێوێنە، هەتا ئەمڕۆ هەر کتێبێك لەسەر ئەو زانستە بنووسرێ بە باوەڕو دڵنیاییەکی زۆرەوە پشت بەم ئەنجامانە دەبەستێت.

دواتریش دەستی دایە توێکارکردنی گیانلەبەران لە زۆربەی جۆرەکانی دەکۆڵیەوە، گەیشتە ئەو پرسیارانەی چ ئەندامێکی لەش لەوانی تر سەرەکیترەو کامیان لە وەستانیاندا دەبنە هۆی مردن؟ بەرەنجامی ئەم هەولانەی گەیشتە ئەوەی بوونەوەرەکان چەند بە بەهان، بە ڕاددەیەك بۆچی لە جەنگەکاندا وەها بە ئاسانی تیا لەناوئەبرێن؟ لەوەوە بڕیاریدا جارێکی تر لە هیچ بوارێکی سەربازیدا کارنەکات و گرنگی دانی خۆی ئاڕاستەی خزمەتکردنی ژیان بکات. ئامێری چنینی دروست کردو یەکێکی تریش بۆ ڕەنگکردنی قوماشەکان، ئامێرێکیش بتوانێ پێستە خۆش بکات. هەرچۆن کارگەیەکی بۆ دروست کردنی مۆزەی شوشەیی داناو ئامێرێکی نوێی بۆ چاپکردنی کتێب داهێنا کە پێش تایپ ڕایتەری ئەمریکیەکان کەوت بە ٣٥٠ ساڵ. نەخشەی بۆ دروست کردنی بەربەستەکان کێشا.

بەڵام ئەم هێمنیەی هونەرمەند تیا دەژیا چەند ساڵێکی خایاند بە جولاندنی پاپا یولیوسی دووەم ئەڵمان و سویسریەکان پەلاماری میلانۆیان داو فەرمانڕەوای شارکوژراو داڤنشی سەرلەنوێ پێداویستیەکانی خۆی پێچایەوە لە سەرو هەموشیانە تابلۆی مۆنالیزا بوو لەگەڵ دەستنووس و کتێبەکانی بەرەو ڕۆما کەوتەڕێ، چون بیستبوی یەکێك لە بنەماڵەی میدتشی بە ناوی پاپا لیون دەهەم دەسەڵاتی پاپەوی لەدەست گرتووە. لە ڕۆما ڕێزێکی گەورەی لێنراو ئەوکاتە تەمەنی شەست ساڵ دەبوو، لە بەشێکی کۆشکی (بلفیدیر)دا نیشتەجێ کرا، کە کۆشکێکی هاوینە بوو هەر چوار لای بە باخچەو گوڵ و باڵندە گیرابوو، ئەمە خەونێك بوو بۆ کەسێکی وەك داڤنشی وای هەست دەکرد لە جیهانێك لە جیهانە فردەوسیەکاندا دەژی، ئەم ماوەیەی بە توێژینەوەی جۆری ڕووەك و ئەو باڵندەو گیانلەبەرانەوە بردە سەر کە لەوەوپێش

نەیدیبوون. ئەوکاتە نەخۆشی مەلاریا بڵاوبۆوەو داوای چارەسەری ئەو پەتایەیان لە داڤنشی کرد ئەویش پێش نیهادی ئەوەی بۆ کردن کە جۆگەو ئاوە وەستاوەکان ووشك بکەن بەمەش ڕێژەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە نزم بۆوە.

پاپا کارە هونەریەکانی ڕۆمای نەئەدا بە داڤنشی بەڵکو زیاتر مایکل ئەنجیلۆ و ڕافاییل جێی گرنگی پێدانی بوون، بەڵام داڤنشی گوێی بەمە نەئەدا چونکە ئەو موچەی خۆی لە مەلیکی فەرەنسی و جولیانومیدتشی برای پاپاوە زۆر بە ڕێك و پێکی بەدەست دەگەیشت، بەڵام هێندەی نەبرد مەلیکی فەرەنسی مرد و جۆلیانۆش نەخۆشی‌یەکی کوشندەی گرت و لە فلۆرەنسا مایەوە تا ماوەیەکی تر کۆچی دوایی کرد بە گەنجێتی. باری ژیانی داڤنشی بۆ جارێکی تر خراپ بۆوە و بەرەو میلانۆ جارێکی تر پێداویستی‌یەکانی هەڵگرتەوە کە ئەو دەمە فرانسوای یەکەم پەلاماری دابوو کەوتبۆوە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسی‌یەکان هۆکارێکی تری کۆچکردنی بۆ میلانۆ، تاوانبار کردنی بوو بەوەی توێکاری جەستەی مردوی کردووەو لەشی مرۆڤی نەشتەرکاری کردووە. لە میلانۆ فرانسوای یەکەم زۆر زۆر ڕێزی گرت و داوای لێ کرد لەگەڵیدا بگەڕێتەوە بۆ پاریس، ئەم جارەیان کە داڤنشی تەواو هیلاك و پیر بوو ڕازی بوو، لەوێ کۆشکی میوانداری خۆی بەخشی بە داڤنشی و زۆربەی کات سەردانی دەکرد. هەر لەوێ داڤنشی تابلۆی (پاکیزەو ئانای پیرۆزمەند)[١٣] ی دروست کرد کە تیایدا ویستی هەمان گوزارشتی دەرونی تیا بەرجەستەیە کە لە مۆنالیزادا سەرکەوتنی تیا بەدەست هێنابوو، سۆزێکی دایکانەی تیا بەدی ئەکرێت، لە دەموچاوی هەردوو دایك دا سیمایەکی پڕاوپڕ لە مێینەیی تیا بەرجەستەیە، ئەو خەندەیەی لەسەر لێوی ئانای پیرۆزمەندە یادی ئەو زەردەخەنەیەمان دەخاتەوە کە لەسەر لێوی مۆنالیزیایە.

ئەوەی جێی سەرنجە لەم تابلۆیەدا چونە باوەشی پاکیزەیە بۆ باوەشی ئانای پیرۆزمەند، ئەمەش بە لێکدانەوەی فرۆید بۆ مناڵێتی داڤنشی دەگەڕێتەوە کە دوو دایکی هەبووە، دایکی بنەڕەتی خۆی و ژنی دووەمی باوکی کە مناڵی نەبووەو باوکی وەختێ لە ژنی یەکەمی جیابۆتەوە داڤنشی هێناوەتە لای ئەم ژنەی تری و ئەو دایکایەتی کردووە. واتە داڤنشی هەر بە مناڵی دوو دایك بەخۆوە دەبینێ.

کارەکە بە شێوەیەکی هەرەمی بوونیات نراوە، جوڵەی ئاوڕدانەوەی مناڵەکە پێچەوانەی ئاوڕدانەوەکەی دایکیەتی. هەرچۆن هەست بە بینگەیەکی ئاینی دەکەین لەو بەرخەی مناڵەکە یاری پێ دەکات.

لە دوا ساڵەكانی ژیانیدا لە پاریس تابلۆی (یوحننای پاكژكەرەوە) دروست دەكات و ڕۆژانە بە دیاریەوە كاتێكی زۆر دادەنیشێت، لە زستانی ١٥١٩دا لای ڕاستی دەوەستێ بەڵام بەلای چەپ و دەستەچەپی كار لەو تابلۆیەدا دەكات، كە هیچی كەمتر نییە لە بەهایدا لە تابلۆكانی تری. ساتێكیش هەستی كرد مردن لێی نزیك بۆتەوە ڕاسپاردە درێژەكەی نووسی بۆ پاش خۆی كە لە چەند خاڵێك پێك هاتووە بەڵام لە گرنگترینیان: تكایەك بۆ مەلیك فرانسوای یەكەم، بنیاتنانی كۆشكی (لۆڤەر) تەواو بكرێت كە سێ سەدەیە دەستی پێكراوە، دواتر بكرێتە مۆزەخانەیەك بۆ شاكارەكانی هونەر، (مۆنالیزا) یەكەم تابلۆ بێت كە تیا دابنرێت.

لە ڕۆژێك لە دوارۆژەكانی زستانی ئەوساڵەدا داڤنشی بۆ یەكجاری چاوی لێك نا. لە دوا ساڵەكانی ژیانیدا تابلۆی (مۆنالیزا)ی بەخشیە مەلیكی فەڕەنسی بەو ئامانجەی ڕاسپاردەكەی بۆ بێنێتە دی.

دەگێڕنەوە ئەوكاتەی داڤنشی لە فەڕەنسا نەخۆش بووەو لە دوا كاتەكانی تەمەنی بووە، هەموو بەیانیەك مەلیكی فەڕەنسی پێش چونە سەر كاری خۆی سەردانی داڤنشی كردووە، بەیانیەك وەختێ دەیەوێت سەر لەم هونەرمەندە بدات، یاریدەدەرەكەی پێی ڕادەگەیەنێت كە كۆمەڵێ لە پیاوماقوڵ و دیوك و پیاوانی گەورە چاوەڕووانین، ئەمیش دەڵێت: با چاوەڕووان بن تا دەچمە سەردانی داڤنشی و دوای ئەوە چاوم پێیان دەكەوێت، یاریدەدەرەكەشی لای سەیر دەبێت بە سەرسوڕمانەوە دەڵێت: قوربان كابرایەكی وەكو داڤنشی چیە، تا بەڕێزتان ئەم گەورە پیاوانە چاوەڕووان پێدەكەن لەبەر خاتری ئەو؟! مەلیكیش لە وەڵامدا دەڵێت: هەی بێمێشك من سبەینێ دەتوانم دەیان پیاوماقوڵ و دیوك و پیاوی گەورە دروست بكەم و نەهێڵم، بەڵام تەنها یەزدانی مەزن خۆی دەتوانێ بلیمەتێكی وەكو داڤنشی دروست بكات.

داڤنشی پەرجویەك بوو لە پەرجووەكانی ڕێنیسانس: پەرجویەكی زانستی و پەرجویەكی هونەریی. بەڵام ئەم هونەرمەندە، كە دزواری و پەنهانی زۆر لایەنی ژیانی تەنیوەتەوە، ئەو ڕەخنەگرانەی شەیدای جیهانی ئەوبوون تا ئێستا لە پەناو پاساریدا دەگەڕێن، هەموو ڕۆژێكیش شیكردنەوەو لێكدانەوەیەكی نوێ دەردێنن. بەڵام ئەوەی كە بۆتە هۆكار لەبەر دەرنەكەوتنی تواناكان و داهێنانەكانی ئەم كەڵەپیاوەو كاریگەر نەبوونی دیارو بەرچاوی لەسەر گەشەكردنی زانست و بوارەكانی تری كاركردنی، درەنگ دۆزینەوەی بەرهەمو نووسینەكانی ئەوە كە لە سییەكانی سەدەی بیستەمدا چاپكران و بڵاوكرانەوە. بۆ نمونە سەد ساڵێك بەر لە (گالیلۆ) چەند دیاردەیەكی لە بارەی هەڵهاتن و ئاوابوونی مانگەوە دۆزیەوە،

یەکەمین کەسە کە سەلماندی ڕەنگی ڕاستەقینەی مانگ خۆڵەمێشی‌یە، هەر لەم مەیدانـەدا دژی ئەو بیروڕایانە دەوەستا کە زەوی‌یان بە چەقی گەردون دادەنا.

هەموو سەرنج و تێبینیەکانی کە دەنووسیەوە لـە دەفتـەرە تایبەتـەکانیدا، بـە پێچەوانـەوە دەینووسینەوە واتە دەبوو لە ئاوێنەدا بخوێنرێتـەوە، بۆچوونـەکان و تێبینی‌یـەکانی بـە زمـانی نەتەوەیی نووسیوەو بـە تونـدی دژی زمـانی لاتینـی بـوو لـەم بارەیـەوە وەهـا دەدوێـت و دەڵـێ: لـەناو زمانەکـەی خۆمـدا ئـەوەندەم وشـە هەیـە زۆر لـەوە زیـاترن گوزارشـتیان لـە شـتەکان پـێ بکەمو ناوەڕۆکی بیروڕاکانی پێ دەربڕم.

سەرجەمی نووسینەکانی کە بە دەستمان گەیشتووە تا ئێستا نزیکەی حەوت هەزار لاپەڕەی جیاجیـای دەستنووسـەکانیەتی کـە لـە مۆزەخانـەکانی ئـەوروپا (لـەندەن و پـاریس و میـلان) و هەندێکی تردا پارێزراون. توانیویـەتی بـە هـەردوو دەسـتی چـەپ و ڕاسـتی بنووسـێت و نیگـار بکێشێت، ئادەمیزادێکی کامڵ و بلیمەتێکی هەڵکەوتوی ئەوتۆ بوو، هەموو لقەکانی زانسـتی تیـا ئاوێتەی یەکتر دەبوون هەر لە ماتماتیك و ڕووەك ناسی و میکانیك و فیزیك و ئەستێرەناسی و جیۆلۆجیاو ئەناتۆمیاو فسیۆلۆجیای ئـادەمیزاد و ئـاژەڵ و هونـەرە سـەربازیەکانەوە تـا دەگاتـە تەلارسازی و پەیکەرسازی و نیگارکێشان.

داڤنشی پچڕانی ئەو هێڵەیە کـە لـە هونەرمـەندە خۆڕسکەکانەوە (الفطریـین) سـەرچاوەی دەگرێ و بـە بۆتشـیللی کۆتـایی پـێ دێـت، بەمـەش دەستنیشـانی سـەرەتای سـەردەمی نوێکـاری دەکات، ئەو جیهانێکی پەنهانی لە هونەردا دۆزیەوە کە جیهانی (کـەش) بـوو، ئـەم دۆزینەوەیـە خۆی لـە چارەسـەرکردنێکی نـوێی پێچەوانـە بوونـەوەی ڕوونـاکی لـە کـەش دا دەدیـەوەو کردنـەوەی بینگەیـەکی نـوێ کـە تیـایدا قورسایی شـێوە مادیـەکان نائامـادە دەبـن و دیدنیگـای پەیکەریی چیتر نامێنێت و ڕێگە بۆ بینینێکی نیگارکێشانەی پەیت واڵا دەکات.

دۆزینـەوەکانی لیۆنـاردۆ ڕێخۆشـکەر بـوون بـۆ کـارە پرشـنگدارەکانی کۆریجیـوو، بـە یـەك گەیشتنی سێبەرو ڕوونـاکی لای ڕامـبرانت و دیدنیگـای هونەرمـەندە ئینتباعیـەکان لـە سـەدەی نۆزدەدا.

تەنانەت کاریگەریی ئەم هونەرمەندە کەڵە هونەرمـەندەکانی سـەردەمی خۆیشـی گرتبـۆوە وەك مـایکل ئـەنجیلۆ و رافاییل، هـەرچۆن پەیوەسـتی هـەبووە بـە (برامـانتی)یـەوە لـە میـانی هونـەری تەلارسـازیدا. ئـەو گومەزانـەی داڤنشـی دیزاینـی کێشـاون بـە قۆنـاغێکی گواسـتنەوەی نێـوان گومەزەکـەی (برونلسـکی) لـە فلۆرەنسـاو گومـەزی کڵێسـەی (پیرۆزمـەند پـەترۆس) دادەنرێت کە مایکل ئەنجیلۆ دیزاینی کێشاوە ساڵی ١٥٠٦.

لەو کارانەی پەیکەرن و ماونەتەوە پەیکەری سفورتزایە لە فلۆڕەنسا، پەیکەری سەری سیبو لە لۆڤەر و پەیکەری سوارەکە لە وندسون.

بەڵام کارە نیگارکێشەکانی لە مۆزەخانەکانی میلانۆو لەندەن و لۆڤەر و فلۆڕەنسایە. داڤنشی لە نیگارکێشاندا پەنجەی دا لە لوتکەی باڵای شاعیریەتێك کە نیگارکێشان دەکرێت بگاتە چڵەپۆپەی. پایەی نیگارکێشانیش لای ئەم مەزنە لە هەموو هونەرەکانی تر باڵاترەو خۆیشی هێندە لەم مەیدانەدا لێهاتوو بوو گەیاندیە لوتکەی کەماڵ، ئەو چەند تابلۆ کەمەی لە پاشی بەجێمان، تا ئێستا بە دەگمەنترین بەرهەمی هونەری نیگارکێشان دادەنرێن.

## لیۆناردۆ داڤنشی لە بینگەی دەرون شیکاری فرۆیدیەوە

ئەو توێژینەوەیەی فرۆید دەربارەی لیۆناردۆ داڤنشی کردویەتی لە میانی دەرون شیکاریدا، بە سەرکەوتوترین توێژینەوەکانی ناوزەد دەکرێت و تیایدا وەڵامی زۆرێك لەو پرسیارانەی داوەتەوە کە ڕەخنەگرەکان ئاراستەیان کردووە. لیۆناردۆ کەسایەتییەکە ڕەخنەگران و توێژەرەوەکان لەسەری ناکۆکن و کێشمەکێشم و دیالۆگی زۆری لەسەر کراوە، ئەم کەڵە هونەرمەندە نووسین و بەرهەمێکی زۆری لە دوا خۆی بەجێهێشتووە کە خۆی دەدات بە نزیکی لە پێنج هەزار لاپەڕە، ئەمە بێ لە بەرهەمی هونەریی لە پەیکەرسازی و نیگارکێشان و زۆر بواری جیاجیای تر کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە. لە دیدنیگای فرۆیدەوە داڤنشی کەسایەتییەکی نمونەییە، بەو مانایەی بەرجەستەیەکی زیندووی باڵایە بۆ گشت ئەو خاڵانەی ئەو بۆی چووە لە دەرونی مرۆڤدا لە نەخۆشی و ساغی لە بیروڕاو هزرەکان.

داڤنشی لە دایکێکی جوتیاری هەژار و باوکێکی دەوڵەمەند کە نووسەری داد بووە بە شێوەیەکی نایاسایی لە دایك بووە واتە بەرەنجامی پەیوەندییەکی تابۆیانە لە دایك بووەو لە بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی ساڵی ١٤٥٧ کە بریتییە لە تۆمارێکی باج و خەراج لە فلۆڕەنسادا ناوی داڤنشی لە نێوان ئەندامانی خێزانی (سێربییرۆ)دا هاتووە وەك منداڵێکی نایاسایی بیژوو (زۆڵ) لە تەمەنی پێنج ساڵیدا. دواتر ئەو ئافرەتە جوتیارە کە ناوی (کاترین)ە مێرد بە پیاوێکی جوتیار دەکاتەوە، داڤنشی تا پێنج ساڵی لای دایکی دەبێت، چون وەختێ باوکی ژن دێنێت لە ماڵێکی خانەوادەو منداڵی نابێت ژنەکەی، ناچار دەگەڕێتەوە لیۆناردۆ لە دایکی دەسەنێتەوە و لەلای ژنەکەی خۆی دایدەنێت تا وەك دایکی پەروەردەی بکات. واتە لیۆناردۆ تا ئەم تەمەنەی دوو دایك بەخۆوە دەبینێ. (گەرچی دواتر باوکی ژنی تری هێناوە).

ئەمە ئەو دەوروبەرە پڕ لە کێشەو پاڵەپەستۆیەیە کە منداڵی لیۆناردۆی تیا ئەفراوە لە هەست کردن بە نەبوونی دڵنیایی لە ئاامادەیی باوك تا پێنج ساڵی (کە ئەو ساڵانەیە تیا گشت

سیما کەسایەتی‌یەکان یەکلادەکاتەوە) ئەمە لە لایەك و لە لایەکی تر ئـەو ساڵانەی لـە ئـامێزی ئـافرەتێکدا بـردە سـەر کـە بێبـەش بـوو لـە خۆشەویسـتی مـێرد، ئـەم جێگـەی ئـەو مـێردو خۆشەویستی‌یە وون بوەشی گرتۆتـەوەو کەوتۆتـە بـری ژیـانێکی گـەرم و تێریـەکی سێکسـی. ئەمانـە گشت زۆر شتی پێش وەختی تیا بـە ئاگـا هێنـاو بـوە پاڵنـەر بـۆ هەسـتکردن بـە پێگەیشتویەکی زوو بـە زووی سێکسی، هەمیشە پرسیاری هـەبوو بـە دوای زانینـدا وێـڵ بـوو، کەسێ نەبوو تینوێتی پرسینی ئەو بشکێنێ، ئەمە وایکـرد ئـەو خـۆی بگـەڕێ بـە دوای وەڵامـی شتەکاندا، بەمەش ئالودەیی بەدواداچونێکی بەهێزی تیا دروست بـوو کـە بـووە بنـەمای پایـەی کەسایەتی ئەو وەك "هونەرمەند- زانا".

فرۆید لە کاریگەریی ئەو ساڵانە دەدوێت لەلای دایکی خۆی و لـە باوەشـی ژنەکـەی بـاوکیدا بردویەتـە سـەر، کـە دواتـر بۆتـە مایـەی ئـەوەی خۆشەویسـتی بـۆ دایکـی وای لێبکـات لـە هیـچ ئـافرەتێك نزیـك نەبێتـەوەو وێنــەی دایکـی ببینــێ تیایـاندا. ئــەو خۆشەویســتی‌یەی کردیــە هەڵکەوتوترین نیگارکێشی ڕێنیسانس و بلیمەتێك لەسەر چڵەپۆپەی هونەری کۆن و نوێ.

فرۆید وەهای لێکدەداتەوە کە (لیبیدۆ)[١٣] لە مناڵدا تا پێنـج ساڵی لـە خۆیـدا کۆدەبێتـەوە، واتە هەموو توانای لیبیدۆی بە ئاراستەی خۆیەتی. بە (لیبیدۆی خود یاخود لیبیدۆی من) ناو زەدی دەمات. مناڵ لە ساڵانی یەکەم و سەرەتایدا پێویستی بـە جیهانی دەرەکی نی‌یـە، ئـەوەی بەلایەوە گرنگە تەنیا دایکیەتی، دایکیشی بـۆ ئـەو بەشـێك نی‌یـە لـە جیهانی دەرەوە هێنـدەی بەشێکە لە خۆی.

ئـەم حاڵەتـەش وەك وتمـان تـا چـوار یـاخود پێنـج ساڵی سـەرەتا دەخایـەنێت، لـەدوا ئـەم تەمەنەوە منـاڵ وردە وردە پـەی دەبـات بـەوەی جیهانی دەرەکی هەیـە، بەرامبـەر بـەم زانینـە نوێیەی بۆ ئەم جیهانە نوێیە، لیبدۆی ئاراستەی خۆشویستنی خۆی دەکات، کە پێی دەوترێت (لیبیـدۆی نەرسیسـی یـاخود نێرگسـی)، لـەم قۆناغـەدا زیـاتر خـۆی خـۆش دەوێـت هـەروەك نارسیسۆس[١٤] کە سـیفەتی (نرجسـی) لێ وەرگیـراوە. لـە دوای تەمـەنی شـەش ساڵیەوە کـەمێك دەستبەرداری نەرسیسیەتی خۆی دەبێت و لە بەرامبەردا لیبیدۆی کەسانی تر وەردەگرێت.

لە گەیشتن بە (تەمەنی خەون)دا، توانا سێکسی‌یەکان پێدەگەن و بە هەموو لایـەکی لەشـدا بڵاودەبنەوە، ڕوو لە زیادبوونن بەشێکی تەرخانی پرۆسێسی سێکسی و (زیادبوون و مناڵکردن) دەکات و بەشەکەی تریشی بەرەنجامی چەپاندن (کبت) ئاراستەی باڵابوون (التسامی) دەکرێت.

لێرەدایـە فرۆیـد بـۆ وەسـفکردنی نـەریتی سێکسـی دوو زاراوە دێنێتـە پێش کـە ئــەوانیش (بابەتی سێکسی و ئامانجی سێکسی)ین. کە هەردوکیان پێکەوە نەریتی سێکسی پێك دەهێنن.

بابەتی سێکسی بریتییە لە ڕاکێشانی سەرنجی ڕەگەزی بەرامبەر واتە کەسێکە لە ڕەگەزێکی تر. وەك پیاو بۆ ئافرەت و بە پێچەوانەوە. ئامانجی سێکسیش ئەو مەبەستەیە ڕەمەکی (غریزە) سێکسی لێی دەگەڕێت، کە دواتر پرۆسێسی سێکسی لێدەکەوێتەوە (پرۆسێسێکی ئاسایی). بەڵام لادان (انحراف) ڕوودەدات، لادانێك تایبەتە بە بابەتی سێکسی و لادانێکیش تایبەت بە ئامانجی سێکسی.

لادان لە بابەتی سێکسیدا واتە خۆشویستن و مەیلکردن بەلای هەمان ڕەگەزدا (لوطي) وەك پیاو بۆ پیاو و ژن بۆ ژن. دەربارەی پیاو پێی دەوترێت قەێزەون بوونی ئافرەت (horror feminae).

لادان لە ئامانجی سێکسیدا گەر بە شێوە ئاساییەکەی بڕووات دەمان گەیەنێتە پرۆسێسێکی سێکسی ئاسایی نێوان دوو هاوڕەگەز. بەمەش دەوترێت هاوڕەگەز ویستنێکی دیار یاخود ئاشکرا (لواطة ظاهرة) یاخود (لواطة صريحة). بەڵام شێوە نائاساییەکەی (کە جێی گرنگی پێدانی فرۆیدە بەرامبەر بە داڤنشی) دەمانگەیەنێتە (سێکسی بوونی باڵا). هاوڕەگەز ویستنێکی ون و نادیار (لواطة كامنة). ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە داڤنشی تیا ژیاوە، فرۆید لە مێژووی ژیانی ئەودا هەستی پێکردووە و هەربۆیە ئاماژەی بەو کۆمەڵە گەنجە داوە کە ڕووخسارێکی جوانیان هەبووەو داڤنشی وەك قوتابی لە خۆی کۆی کردونەتەوە، گرنگییەکی تایبەتی پێدوان و خەرجی تایبەتی بۆ کردون. (وەك ئەو تێبینییە وردەکاریەی لە یادەوەریەکانیدا نووسیویەتی دەربارەی کڕینی ئەو عەبایەی بۆ ئەندریا سالاینۆی قوتابییەتی و ئەو خەرجیانەی لە بیست و یەکی ئەبریلی ١٤٩٠دا لە یادەوەریەکانیدا نووسیویەتی [ساتەوەختی کارکردنی لە پەیکەری سفورزا لەسەر ئەسپەکە] بۆ جاکۆمۆی قوتابی بە درێژایی ساڵێك). یاخود ئەو تاوانبارکردنەی کە بە تاوانی (نێربازی) کرا، ئەو کاتەی لە ئەتێلەکەی ڤێریکۆدا کاری دەکرد لەگەڵ کۆمەڵێ لە قوتابی تردا بەڵام تاوانبارکردنە کە پوچ دەرچوو، چون ئەو کوڕێکی کردبووە مۆدێل کە ڕەوشت نزم بوو. ئەمەبێ لەو پرسیارەی هەمیشە خۆی قوت دەکاتەوە کە بۆچی هیچ قوتابییەکی ئەم کەڵە هونەرمەندە نەبوون بە هونەرمەندێکی دیار؟

ئەمەبێ لە (فرانسیسکۆ میلیزی) قوتابی و خزمەت کاری کە دوا قوتابی ئەو بوو تا کۆتایی ژیانی لە فەڕەنسا لە تەکیا مایەوەو خزمەتی زۆری داڤنشی کردبوو ئەویش لە بەرامبەردا هەموو موڵك و سەروەتی خۆی بەو بەخشی.

ئەم ئاماژانە لە لایەن فرۆیدەوە بە چۆنیەتی پەیوەندی هونەرمەند بە قوتابییەکانیەوە بەو مەبەستە نایەت کە فرۆید بیروباوەڕی وا بێت پەیوەندیەکی سێکسی بە قوتابییەکانیەوەی

بەستبێتەوە. بەڵكو بەرەنجامی فەرامۆش كردنی باوكی بۆ ئەو لە منداڵیدا ڕقی لەم باوكێتییە دەبۆوە دووراو دوور لە ڕێی ئەم ڤینەشەوە، نەویستنی دەسەڵات و كڵێسا سەرچاوە دەگرێت. سەرباری ئەم هەستەی ئەو بۆ باوك، بۆ خۆی دەچووە كەسایەتی باوكەوە دووراو دوور، لەگەڵ تابلۆكانیدا هەمان مامەڵەی فەرامۆش كردنی باوكی كرد و هیچ تابلۆیەكی تەواو نەكرد. هەرچۆن مامەڵەیەكی باوكانە (نەك ئوستادانە)ی قوتابیەكانی دەكرد. ئەمە شێوازی ئەو لادانەیە كە لە بابەت و ئامانجی[١٥] سێكسی لیۆناردۆدا فرۆید ئاماژەی پێدەدات.

ئەلێكسەندرا كونستاتینۆڤا لەسەر زمانی ج. بركارد دەربارەی لیۆناردۆ وەها دەدوێت: لیۆناردۆ بلیمەت بوو لە هەموو ڕوویەكەوە، ناكرێت هەست بە كەسایەتی ئەو بكرێت تەنها بە زەین نەبێت، خۆشبەختانە ناتوانین بگەینە قوڵایی كەسایەتی ئەو دووری ئەو لە جیهانی ئافرەت و جیهانی سێكسییەوە، تواناو وزەیەكی لەبن نەهاتوی بۆ باڵاكردن پێبەخشی، هەر بۆیە بە بوارێك و دوان و سیانەوە نەوەستاو داهێنەرانە لە دەرگای چەندان بواری داوە. ڕاستە بەرهەم و شاكارە هونەریەكانی لەبەرچاون بەڵام دۆزینەوەو داهێنانە زانستییەكانی (وەك ئاماژەمان پێدا) زۆر درەنگ وەخت ڕووناكییان بینی. كەسایەتی توێژەرەوەیی هەرگیز لە كەسایەتی هونەرمەندی ئەو نەبۆوە. نەك هێندەو بەس بەڵكو ئەم كەسایەتیەی ئازارێكی زۆری بە هونەرمەندەكەی گەیاند بە ڕاددەیەك لە دواجاردا توێژەرەوەكە هونەرمەندەكە سەركوت دەكات. هەروەك ڤازاری دەیگێڕێتەوە: خودی داڤنشی لە دوا ساتەكانی تەمەنیدا لۆمەی خۆی دەكات و دەڵێت: هەرگیز خوداو خەڵكی لێم نابورن لەبەر بەجێ نەهێنانی ئەركی خۆم بەرامبەر بە هونەرەكەم.

دواتر فرۆید دێتە سەر پرسیارێك و دەڵێت: چی بوو وای كرد كەسایەتی لیۆناردۆ بە دوور بێت لە تێگەیشتنی هاوسەردەمانی؟ ئەو سەرباری هەموو ئەو بوارانەی تیا پسپۆڕ بوو لەو بلیمەتانە نەبوو كە سروشت بەخیلی كردبێت لە بەخشینی جوانیدا پێی، تا كەسایەتیەكی ئاڵۆزی هەبووبێت و بووبێتە مایەی ئەو دوركەوتنەوەیەی لە هاوسەردەمانی. ئەو هێند قسە خۆش و نیان و خاوەن سیمایەكی جوان و گرنگی دان بوو بە خۆی لە كتێبەكەیدا دەربارەی هونەری نیگاركێشان، بەراوردێكی جوان لە نێوان هونەری نیگاركێشان و هونەرەكانی تردا دەكات و دەربارەی پەیكەرساز دەڵێ "ڕووی پیس دەبێت لە كاتی كاركردنداو خۆڵی مەڕمەڕ گشت گیانی دەگرێتەوە، وەك ئەوەی نانەوا بێت و تۆزی مەڕمەڕ وەك بەفر لەسەر شانی نیشتبێت، ماڵەكەی پڕدەبێت لە پارچەی بەردو گڵ و خۆڵ. بەڵام نیگاركێش حاڵی زۆر جیاوازە و بە جلی كاملی خۆیەوە بەرامبەر كارەكەی دادەنیشێت بە ئاسودەییەكی زۆرەوە،

پەڕەموچ بەوپەڕی ناسکی‌یەوە پڕ لە ڕەنگی جوان دەوەشێنێت، حەزی بەهەر جل و بەرگێك بێت لەبەری دەکات، ماڵەکەی پڕدەبێت لە وێنەو تابلۆی جوان و هەمیشە پاك و خاوێنە و دەتوانێ سەردانی کەسانێك بکات و سەردانی بکەن، گوێ لە مۆسیقا بگرێ، یا کەسێك هەندێ لە کتێبی جیاوازی بۆ بخوێنێتەوە لە کاتی کارکردنیدا، هەموو ئەمانە دەتوانێت بە چێژێکی بەرزەوە ئەنجام بدا بەبێ ئەوەی دەنگی زرموکوتی چەکوش وەشاندن و دەنگە دەنگی تر تێکی بدات". ئەمانە گشت وێنەیەکن دەکرێت جێی بڕووابن بەرامبەر داڤنشی بەڵام تا ئەوکاتەی فەرمانڕەوایی لۆدڤیکۆ سفورزا کۆتایی پێدێت و ناچار دەبێت میلانۆ بەجێبهێڵێ.

لە دوا ئەم مێژووە ئەو ئالودەیی و گەرمی‌یەی نامێنێت چ وەك کەسایەتی خۆی و چ وەك کارکردنی لە هونەردا. ئەو ڕووڕەوا خۆشەی نامێنێت و ڕیخۆش دەبێت بۆ بەدەرکەوتنی شازێتی کەسایەتی ئەو. گرنگی‌دانی خۆی هەرچی زیاتر ئاراستەی زانست کرد، ئەم گرنگی دانەش ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیاد بووندا بوو کە بووە مایەی دورکەوتنەوەی لە هاوسەردەمانی. ئەمە بێ لەوەی هاوسەردەمەکانی ئەو سەرقاڵی‌یەی ئەویان بە کات بە فیڕۆدان دەزانی یاخود بە دواکەوتنی ئارەزوی پەرت و کاتی یا هەندێکیان وایان لێهاتبوو وایان دەزانی لە خزمەت "سیحری ڕەش"دایە. بەڵام ئەوەی دەستنووسەکانی ئەو ماوەیەی ببینێ دەزانێ ئەو سەرگەرمی گەڕانە تیۆریەکان بووە کە بەرامبەری بیروڕاکانی فرانسیس بیکۆن و کوبرنیکۆس دەکات. توێکاری جەستەی ئەسپ و مرۆڤ و بنیاتنانی ئامێری فڕینی کردووە، هەرچۆن توێژینەوەی لەسەر ڕووەك کردووەو پەرچەکرداری ڕووەك لە بەرامبەر ژەهراوی بوونیدا جێی گرنگی پێدانی بووە.

ئاسەواری ئەم گرنگی‌دانانە لەسەر کارکردنی هونەریی ئەو بەدەردەکەوێت و وای کردووە کەمتر نیگار بکێشێت، لەوەش خراپتر هەرچیەکیشی بکردایە تەواوی نەدەکرد. ئەم شێوازە مامەڵەیە لە کارکردنیدا بووەتە هۆی سەرسوڕمانی هاوسەردەمانی و هونەرەکەشی بۆتە مەتەڵێك.

زۆرێك لەوانەی سەرسامن بە لیۆناردۆ دواتر ویستویانە بیانوی جیاجیا بۆ ئەم کەم کارکردن و ناجێگیری‌یەی هونەرمەند بێننەوە. کە سیمایەك بێت و لە زۆرێك لە هونەرمەنداندا بوونی هەبێت (بە تایبەت کەڵە هونەرمەندەکان) ئەوەتا مایکل ئەنجیلۆ زۆر کاری خۆی بە ناتەواوی بەجێهێشتووە سەرباری ئەوەی زۆر خۆشی هیلاکی کارکردنی هونەری کردووە. هەندێ کاریش ناتەواو نی‌یە وەك هەندێ کەس دەڵێن بەڵکو ئەوەی لای خەڵکی ئاسایی شاکارە لەوانەیە لای کەڵە هونەرمەندێکی داهێنەر بە کارێکی کەم و کورت لە قەڵەم بدرێت. هەمیشە

لیۆناردۆش سەرگەرمی بەدیهێنانی ئەو کەماڵە بووە تا بەرجەستەی بکات. گەر لە زاری سۆلی مێژوونووسەوە گوێدێرین بۆ یەکێك لە قوتابیەکانی کە دەڵێت: "وەختێ دەکەونە نیگارکێشان وەها دەرئەکەوت هەمیشە دەکەوتە لەرزین، هەرگیز ئەوە تەواو نەدەبوو کە دەستی پێکردبوو. هەمیشە باڵایی و بێ هاوتایی هونەر باڵی کێشابوو بەسەریا، ئەوەی ئەو بە هەڵە دەیبینی لای کەسانی تر وەك شاکارێك دەرئەکەوت لەگەڵ بەهێزی هەموو ئەم هەنجەتانەدا بەلام هێشتا لێکدانەوەیەکی پڕاوپڕ و قەناعەت بەخشمان لە حالەتی داڤنشیدا دەست ناکەوێت، ڕاستە گرنگی نەدان بە دوارۆژی کارەکان و کێشەیەکی پڕ ئازار لەگەڵ هونەردا لە ژیانی زۆر لە هونەرمەندەکاندا دەبینین، بەلام لای داڤنشی تا ئەوپەڕی ئاستی ئەو حالەتە دەرئەکەوێت.

لەسەرخۆیی و خاوو خلیچکی ئەو وەك نمونە هێنراوەتەوە لە کارکردندا، دوای سێ ساڵ لە توێژینەوەیەکی چڕووپڕ دەستی کردە تابلۆی (دواشێو) لە دێری سانت ماریای میلانۆ. یەکێ لە هاوسەردەمانی کە قەشەیەکی گەنج بووەو نووسەر بووە بە ناوی (مایتو باندیللی) هەر لەو دێرەدا بووە. دەڵێ: لیۆناردۆ بەسەر ئەسکەلەی کارکردنەکەیدا کە بەیانیان زوو سەردەکەوت دەستی لە پەڕەموچ بەرنەدەدا تا ئێوارە، بەبێ بیرکردنەوە لە نان و ئاو. کەچی دواتر هەندێ ڕۆژ تێدەپەڕی بەبێ ئەوەی دەست بۆ پەڕەموچەکەی بەرێت، بە چەندان کاتژمێر لە بەرامبەر کارەکەیدا دەوەستا، چێژی لەوە دەبینی لێی بتوێژێتەوە. هەندێ جاریش لە کۆشکی قەلای میلانۆوە (کە تیایدا خەریکی پەیکەرەکەی فرانسیسکۆ سفورتسا بوو) لە پڕێکدا بەرەو دێرەکە دەڕۆیشت تا هەندێ لێدانی پەڕەموچ بۆ یەکێك لە کەسایەتییەکانی زیادبکات کە نیگاری کێشابوون، دواتر یەکسەر دەوەستا. خاوی و لەسەرخۆیی کارکردنیشی لە مۆنالیزیادا شتێکە دیار و ئاشکرا بە ڕادەیەك ڤازاری وای لێکدەداتەوە هۆی تەواونەکردنیەتی نەیداوەتەوە بە خاوەنەکەی، بەلام ئەمە لێکدانەوەیەکە لە ڕاستی دوورە چون ئەو زۆرکاری تری بە ناتەواوی داوەتەوە دەست خاوەنەکانی.

فرۆید ساتێ دێتە سەر باسکردنی ئەم سیفەتەی لیۆناردۆ لەگەڵ بوونی هەموو ئەو دەستنووس و ڕەشنووس و توێژینەوانەدا کە لەبەردەستدایە، هەرگیز ئەو لێکدانەوەیە بۆ هونەرمەند ناکات کە کەسایەتییەکی ڕاکردوو ناجێگیری هەبێت بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە بە دوورترین دووخاڵ لێکدەداتەوەو هەرچی زیاتر خۆ هیلاك کردن و قوڵ بوونەوەو دەوڵەمەندی لە تواناو داواکاری لە ڕاددەبەدەری تێربوون لە پشتی ئەو بەرەنجامانەوە دەبینێت[١٦].

هەر بە هۆی ئەم ویستەوە بووە ناوبەناوێکی باش وازی لە هونەر هێناوە، لە کارکردنیشیدا حەزی بە نیگارکێشانی سەر دیواری گەچ و قسلْ نەبووە (واتە کاری تیمپرا یاخود فریسکۆ) چونکە دەستوبرد و خێراییەکی دەوێت لە جێبەجێکردندا بە تایبەت تا پشتینەکەی تەڕبێت، هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە هەمیشە بۆیەی زەیتی لا پەسەند بووە چونکە وشك بوونەوەی ڕێ لە تەواوکردنی کارەکە ناگرێت بە ئارەزوی خۆی و لەهەر کاتێکدا بیەوێت.

هەندێ سیمای سەیر و دژ بەیەك بە ڕوونی لە کەسایەتی داڤنشیدا هەبووە، وەك ئەوەی لە کاتێکدا هەر کەسێ زیاترین چالاکی خۆی بەکارهێناوە بۆ بەدیهێنانی دەستکەوتی ماددی یاخود مانەوی، ئەو زۆر هێمن و خەم سارد بووە، ئەم مۆرکەشی هەرگیز نەیگەیاندووە بەوەی مەیلی دوژمنایەتی ئەو بۆ کەسانی دەوروپشتی (کە بە پێچەوانەی خواست و سروشتی ئەوەوە هەڵسوکەوت دەکەن) دروست ببێت. بەڵکو هەموو خەڵك سەرسام بوون لە بێوەیی و نیەت پاکی و کەمتەرخەمی و گوێنەدانی ئەو بە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی کێشمەکێشیانە لەسەری. خاوەن هەستێکی ناسك و هەڵسوکەوتێکی نیان بووە، دەوترێت ڕەتی کردۆتەوە گۆشت بخوات چون بە ڕاستی نەزانیوە گیانەوەران ژیانیان لێ بستێنرێتەوە، ڕزگارکردنی مەلەکانیش لەنێو قەفەزەکانیاندا لە بازاڕ یەکێ بووە لە خۆشیەکانی، دژی جەنگ وەستاوەو مرۆڤی نەك بە شای گیانەوەران زانیوە بەڵکو بە خراپترین و دڕندەترین گیانەوەری داوەتە قەڵەم. بەڵام هەموو ئەم هەستە ناسك و نەرم و نیانیە ڕێگر نەبووە لەبەردەمیدا دوای تاوانبارەکان نەکەوێت ساتێ بۆ بەر مەقسڵەیان دەبەن، تا نیگاری سیماو ڕووخساریان بکێشێ ساتێ ترس دەیڕاکێنێ و لێیان بتوێژێتەوە، هەرچۆن ڕێی ئەوەی لێ نەگرتووە ترسناکترین چەکی هێرشبردن دابهێنێ و بچێتە ژێر خزمەتی خوێن ڕێژێکی بەناوبانگی وەك سیزار بورجیا و نازناوی ژەنەڕاڵی لێ وەرگرێ و وەك سەرەك ئەندازیارانی سەربازی پۆست وەرگرێ. لە توندوتیژترین هێرشدا (لەتەك سیزاردا) بۆ سەر روماجنا بەشداربێت بە پێگەیەکی گەورە، بێئەوەی کەس دێڕێك لە دەستنووسەکانیدا ببینێت دەرباری ئەو ڕووداوانەی لەو ڕۆژگارەدا ڕوویان داوە نە بە هاوسۆزی و نە بە ڕەخنە. لە زۆر کاتی ژیانیدا وا دەردەکەوێت بایەخی نەداوە بەوەی چاکەیەو باشە یاخود خراپەو زەرەرمەندە.

لە سەردەمێکی لێوان لێو لە کێشەی بەردەوامی نێوان گومڕاییەکی یاخیانەو زاهیدیەکی پەتیدا، لیۆناردۆ نمونەی ڕەتکردنەوەیەکی سێکسی ساردی وا بوو کە لە هونەرمەند و نیگارکێشێکی جوانی مێینەیی پێشبینی نەدەکرا. هەمیشە ئادەم سۆڵی ئەم ڕستەیەی داڤنشی دەڵێتەوە وەك ئاماژەیەك بە ساردی مەیلی سێکسی ئەو: پرۆسێسی سێکسی و هەر شتێ

پەیوەندیدار بێت بەوەوە قێزەونە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر زوو مرۆڤ دەمرد گەر ئەمە نەبوایەتە نەریتێکی ڕەگ داکوتاوو گەر ڕووخساری شیرین و مەیلی جوانی نەبوایە. ئەو کارانەش کە لە دوای بەجێماون لە گەورەترین مەسەلە زانستییەکانەوە بیگرە تا بابەتهایەکی کاڵفامانە (کە شایەن بە ئاستی لیۆناردۆ نین) هەموو سەرانسەرن بە مەیلێکی زاهیدی. تەنانەت لە بورای هونەریشدا سەرمان دەسوڕمێ لە زاهیدی ئەو، وەك دەزانرێت هونەرمەندە گەورەکان زۆرجار چێژێکی تایبەتیان دیوە لەوەی ئەندێشەکانیان لە فۆرمهایەکی سێکسیدا بەرجەستە بکەن تا ڕاددەی داوێن پیسی، بەڵام لیۆناردۆ پێچەوانەی ئەوان چەند وێنەیەکی توێکاری نەبێت بۆ ناوەوەی ئەندامی سێکسی ئافرەت و بۆ چۆنیەتی بوونی مناڵ لە مناڵداندا.

هەمیشە بوونی پەیوەندیەکی خۆشەویستی (تەنانەت گەر پەیوەندیەکی ڕووحیش بێت وەك ئەوەی نێوان مایکل ئەنجیلۆ فیتوریاکولونا) جێی گومانە لەلای داڤنشی. زۆرێکیش لە مێژوونووسە نوێیەکان ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە پەیوەندی سێکسی هەبووبێت لەگەڵ قوتابیەکانیدا تا ڕاددەی دڵنیایی. بەڵام فرۆید دەڵێت نکوڵی لە پەیوەندیەکی گەرم و توندوتۆڵ ناکرێت لە نێوان لیۆناردۆ و قوتابیەکانیدا، بەڵام ئەو پەیوەندییە نەگەیشتۆتە ئاستی پرۆسێسی سێکسی. لێرەوە بەم شێوەیە نەبێت ناکرێت لە تاکێتی ژیانی سۆزداری و سێکسی تێبگەین. دەربارەی ئەوەی پەیوەست بە سروشتی دولانەیی ئەوەوە وەك هونەرمەند و توێژەرەوە.

فرۆید لەنێو هەموو ئەو مێژوونووسانەی دیدنیگای سایکۆلۆجی پشت گوێ دەخەن، کەسیان هێندەی ئیدم سوڵمی EdmSolmi بە دۆزەرەوەی ئەو مەتەڵە نازانێت، کاتێ لەسەر لیۆناردۆ دەڵێت: "بەڵام ئارەزوی تێرنەبووی ئەو بۆ تێگەیشتن لە هەموو شتێکی دەوروپشتی و بۆ گەیشتن بە قوڵترین ڕازەکانی هەموو شتێکی کامڵ بە بیرکردنەوەیەکی سارد، ئەمانە هەموو کارەکانی لیۆناردۆی لەناوبرد و وای کرد بە ناتەواوی بمێننەوە." هەرچۆن لە جێگەیەکی تردا وتەیەکی داڤنشی بەرچاو دەکەوێت کە پەردە لەسەر باوەڕی لادەبات و کلیلی کەسایەتیمان دەداتە دەست. کە دەڵێ: (مرۆڤ مافی ئەوەی نییە شتێکی خۆش بوێت یا ڕقی لێی بێت، گەر زانینێکی کامڵ بە سروشتی ئەو شتە بەدینەهێنێت.) لیۆناردۆ هەر ئەم وتەیە دوبارە دەکاتەوە ساتێ بەرگری لە خۆی دەکات کە پەنجەی بێباوەڕی بە ئاین بۆ ڕادەکێشن: "نمونەی ئەو ڕەخنەگرانە ڕەنگە وا باشتر بێت هەر هیچ نەڵێن، لەبەرئەوەی بە زانین گەورەیی و بێهاوتایی شتەکان دەزانرێت و هەر بەم ڕێگەیەش خۆشەویستی دۆزەرەوەیەکی مەزنی وا بەدی دێت، لەبەرئەوەی خۆشەویستی مەزن لە واقعدا نایەتەدی بە زانینێکی کامڵ نەبێت بۆ بابەتی

خۆشەویستی‌یەکەو، گەر تۆ خاوەن زانینێکی کەموکورت بیت بەرامبەری ئەوا ناتوانیت خۆشت بوێت هێندەی ئەو کەمیە نەبێت، ئەمە گەر هەر خۆشت بوێت"

فرۆید دەڵێت لیۆناردۆ خۆشی دەزانێت کە خەڵکی ناتوانن وەها شتەکانیان خۆشبوێت چون ناتوانن زانیاری تەواو دەرباری ئەو شتانەی خۆشیان دەوێت بەدەست بێنن لەبەرئەوە هەر بە هاوسۆزی خۆشویستنی شتەکان هەڵدەبژێرن و خۆبەخۆ. بەمەش لیۆناردۆ ڕەنگە ئەوەمان پێ بڵێت: خۆشەویستی وەك ئەوەی خەڵکی دەیکەن ئەو خۆشەویستی‌یە ساغە بێگەردە نی‌یە. هەر لەم ڕێیەشەوە پێمان دەڵێت ئەو وەها خۆشەویستی دەکات و پێویستە هەموو کەسیش وەك ئەو بکەن.

ڕەنگە ئەمە بۆ خۆی وەها بێت چون زۆر زاڵ بووە بەسەر هەست و سۆزی خۆیدا. ئەو گۆڕانکاریانەش کە لە زانست و سروشتدا پەی پێبردون ڕێگەی ئەو بووە بۆ باوەڕهێنان بە ئاین. لێرەدایە فرۆید شێوازی بیرکردنەوەی لیۆناردۆ ئەچوێنێ بە سپینۆزا[١٧]. شتێکی سەیر نی‌یە لە نێوان دەستنووسەکانیدا هەندێ وتە بدۆزینەوە کە هەستی ناسکی مەسیحیەکی ئیماندار بریندار بکات لەسەر ئەو نوێژو دوعایانەی بۆ پیرۆزمەندەکان دەکرێت: "خەڵکی لەگەڵ خەڵكانێکدا دەدوێن و قسەیان بۆ دەکەن کە هیچ شتێ تێناگەن، خەڵکانێ چاویان کراوەیەو بەڵام نابینن. لەگەڵیان دەدوێن بەڵام کەس وەڵام ناداتەوە، خەڵکی خەڵکانێ دەپەرستن کە گوێیان هەیەو بەڵام هیچ نابیستن، مۆم بۆ کەسانێ دەسوتێنن کە نابینرێن". دەربارەی هەینی غەمناکیش دەڵێ: "لە سەرانسەری ئەورووپادا میللەتانێ دڵگەرمی دەنوێنن بەرامبەر مردنی تاکە مرۆڤێ لە ڕۆژهەلات". چۆنیەتی ئەم بیرکردنەوانەشە وای لە لیۆناردۆ کردووە تا دوا سیمای ئاینی لە کەسایەتی‌یە ئاینی‌یەکانی بسەنێتەوە لە هونەرەکەیدا و لەسەر شێوەیەکی مرۆڤانە دووبارە بیان خەملێنێتەوەو هەستێکی باڵای جوانی مرۆڤانە لەخۆبگرن.

سۆلی دەڵێت ڕاستە لیۆناردۆ گەڕان و بەدواچونەکانی و هەڵوەدایی لە هونەرەوە و بە مەبەستی هونەر دەست پێکرد. هەر لە گەڕان بە شوێن ڕێساکانی ڕووناکی و ڕەنگ و سێبەرو بەربینە. پێدەچێت ئەو ڕۆژگارە لیۆناردۆ زێدەڕۆیی لە بەهای زانیندا بۆ هونەرمەند کردبێت تا ئاستێك ئەو زانینی لە پێناوی هونەردا تێپەڕاندو زانستی خوازی ئەکەوتە خزمەتی خودی زانست خۆیەوە. ئەو هێند لە بوارە جیاجیاکانی زانستدا قوڵ بۆوە کە نەیتوانی جارێکی تر بە یەکجاری بگەڕێتەوە بۆ بواری هونەر. بەرەنجامی توێژینەوەی وردی لە زانستی جوڵەدا گەیشتە ئەو بەرەنجامەی بە پیتی گەورە لە نووسینەکانیدا نووسیویەتی (خۆر ناجوڵێتllsole non simove). دڵەڕاوکێی ئەو لە بەدیهێنانی هەرچی زیاتر لە هەموو ئەو

بابەتانەی ئەو تیا ڕابەرو داهێنەر بوو بواریان نەدا هەست بە کامڵی و تەواویی کـارکردنی ئـەو بکات لە بواری هونەردا، بۆیە ناچار بوو بانگهێشتی ناتەواوی کارەکانی بکات.

لای فرۆید پەیوەست بوونی پێش وەخت بە گرنگی دانی سێکسی (واتە گرنگیدان لە ماوەی منالّیدا) سێ ئەگەری جیاواز بەرهەم دێنێ کە لیۆنـاردۆ لـە جـۆری سـێهەم دا دەپۆلێنـێ، ئـەم جـۆرەی سـێهەم لـە نـاوازەترین یـاخود دەگمـەنترین و کامڵـترین جـۆرە لـە ناویـاندا کـە تیـایدا لیبیدۆ لە چارەنووسی چـەپاندن بـە بـاڵابوون دەردەچێـت هـەر لـە سـەرەتاوە خـۆی لـە خۆیـدا دەبێتـە خۆشەویسـتی بـەدواداچون و زان خـوازی بەمـەش بـە پـێزی و گوڕێـك دەبەخشـێتە هۆکـاری بـەهێزی گـەڕان و توێژینـەوە. هۆکـاری ئـەم گـەڕان و بەدواداچونـە چیـتر لـە توانـایدا دەبێـت خـۆی بخاتـە خزمـەت گرنگـی دانـی هزریـەوە، لێرەشـدا قـەرزارباری ئـەو چەپاندنـە سێکسـییەیە کـە وەهـا بـەهێزی دەکـات تـا لیبیـدۆی بـاڵابوو پیـایدا بگـات و بـە جۆرێکـی وا وابەستەی بکات کـە خـۆی لەسـەر قـاڵی بەهـەر هزرێکـی سێکسـی بپـارێزێ و بـە دوور بگرێـت. لیۆنـاردۆ دوای ئـەوەی هـەموو ئـارەزوی لـێزانین و بـەدوادچونی منـاڵی خسـتە خزمـەتی گرنگیدانە سێکسییەکانیەوە، ئەو دەمە توانی بەشی هەرە گەورە لە هێزی زیندوی لیبیدۆ باڵا پێ بکات تا بیکاتە هۆکارێك بۆ بـەدواداچون و گـەڕان. ئەمـەش نـاوەڕۆك و نـهێنی خوڕەوشـتی ئـەوە. سـەلماندنی ئـەم تیۆریـەش (هـەروەکو فرۆیـد دەڵێـت) هـەروا ئاسـان نیـیە. بـەڵام بـۆ سـەلماندنی ئـەوەی دەوترێـت وا پێویست دەکات بچینـە قوڵایـی ئـەو پەرەسـەندنە دەرونیـەی ساڵانی سەرەتای منالّی ڕوویان داوە، هەرچەندە زانیاری دەرباری ئەو تەمەنەی (لیۆنـاردۆ لـەوە بـترازێ کە ئاماژەمـان پێداوە پێشتر) شتێکی ئـەوتۆ نـازانرێت و کەمـە و دڵنیـا نیـیە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە چارەسـەری بـە بوونـی زانیارییەکە دەکـەین بـە هەڵوێسـتهایەك کـە نـە لـە هاوسەردەمانی خۆی و نە لە نەوەی ئێمەش کەس ئاوڕی لێنەداوەتەوە و سەرنجی ڕانەکێشاوە.

## یادەوەری سورەداڵ(١٨)

لیۆناردۆ هێندەی زانرابێت دەرباری منالّێتی خۆی هیچی ئـەوتۆی نـەوتووە تەنـها جـارێك نـەبێت لـە میـانی نووسینەکانیا لـەو برگـەیـەی سـەبارەت بـە فڕینـی داڵ دەدوێـت، لـە پڕێکـدا دەوەسـتێت و یادەوەریـەکی زووی منـاڵی خـۆی بیردەکەوێتـەوە و دەنووسـێت: "وا دیـارە لەوەوپێشـەوە لـە چارەنووسمـا بـووە بـە سـورەداڵەوە سـەرقاڵ ببـم، چـون دێتـە بـیرم وەك یادەوەریەکی زووم، وەختێ لە لانکەدا بووم، سوورە داڵێك هاتە سەر لانکەکەم و بە کلکی دەمـی کردمەوەو چەند جارێك بە کلکی کێشای بە لێومدا".

ئەم یادەوەریە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی شیرەخۆرەی لیۆناردۆ، ڕەنگە شتێکی ستەم نەبێت مرۆڤ لە یادەوەریدا بتوانێت ڕووداوێك بهێڵێتەوە کە لە قۆناغی شیرەخۆرەیدا لێی ڕوویدابێت، بەڵام ناکرێت وەك ڕاستیەك بە تەواوی خۆمانی بدەینە دەست. یادەوەری لیۆناردۆ دەڵێت داڵەکە بە کلکی دەمی مناڵەکەی کردۆتەوە، کە ئەمە شتێکە ڕوونادات و نوقمی خەیاڵە. زۆر بەوە دەچێت ئەم دیمەنە یادێك لە یادەوەریەکانی منداڵی لیۆناردۆ نەبێت بەڵکو ڕیشگاو (وهم)ێکی سەرکەوتوی دوادوایی خۆی بێت و دواتر گۆڕیویەتییە سەر منداڵی. ناکرێت ئەم ڕووداوە بە یادەوەریەکی ڕاستەقینە دابنرێت چون خۆی لە خەیاڵ و ڕیشگاو بۆ جیاناکرێتەوە. ڕەنگە باشتر لە سروشتی ئەم حاڵەتە تێبگەین، گەر ئەو شێوازە بێنینەوە یاد کە مێژووی میللەتە سەرەتاییەکانی پێنووسراوەتەوە. تا میللەتێ لاوازو بچوك بێت بیر لە نووسینەوەی مێژووی خۆی ناکاتەوە، زەویەکەی دەکێڵێت و بەرگری لە بوونی خۆی دەکات دژ بە دەوروبەری، هەرچۆن هەوڵ دەدات دەست بەسەر زەویەکانیاندا بگرێت و دەوڵەمەند ببێت، زەمەنی میللەتە سەرەتاییەکان زەمەنی نەبەردی تۆمارکردن و نووسینەوەی مێژوو نەبوو. لە پاشان زەمەنێکی تر دێت، قۆناغی بەدیهێنانی خود، میللەت تیا هەست ئەکات بەهێزو بە توانایە، ئەودەمە پەی بە پێویستی پشکنین و دەرخستن و دۆزینەوەی بنەچەی مێژوویی و چۆنیەتی پەرەسەندنی خۆی دەبات.

نووسینەوەی مێژووش کە بە دواداچونی ئەزموونەکانی ئەمێستادا دەست پێدەکات و ئاووڕدانەوە بۆ ڕابوردوو، دواتر ئەفسانەکان و ڕێساکان کۆکراونەتەوە کە لە هەوڵی لێکدانەوەی ژیان لە سەردەمە کۆنەکاندا لە ڕووی ئاکار و داب و نەریتەوە، بەم شێوەیە مێژوویەك بۆ سەردەمە کۆنەکان جێماوە، بێگومان ئەم مێژووە خێڵەکییە یاخود ئەم مێژووەی پێش مێژوو، هێندەی گوزارشتێك بووە لە بیروڕاو ئارەزووەکانی ئێستا بەرامبەر بەو دەمە هێندە وێنەیەکی دەقاودەقی ڕابوردووی پیشان نەداوە، لەبەرئەوەی یادەوەری میللەتان زۆری لە دەست داوەو زۆری شێواندووەو زۆری بە هەڵە تێگەیشتووە و زۆریشی لەبەر تیشکی ئێستاداو بەرژەوەندی ئێستادا دەسکاری کردووە. هەرچۆن میللەتان مێژووی خۆیان بە هۆکاری مەبەستێك و خۆشەویستییەکی گەڕانی بابەتی نانووسنەوە، بەڵکو مەبەستی مێژوونووسان (یاخود بەشێکی باشی) کاریگەری خستنە سەر هاوسەردەمانیانە بە شێوەیەکی تایبەتی، جا یا ئەیانوروژێنن یا بە باڵایاندا هەڵدەدەن ، یاخود ئاوێنەیەك دەدەنە دەستیان و دەیخەنە بەردەمیان. بیرکەوتنەوەیەکی هوشیارانەی مرۆڤ بۆ ئەزموونەکانی قۆناغی پێگەیشتنی دەکرێت بەراورد بکرێت لە هەموو لایەنەکانەوە بە نووسینەوەی مێژوو، هەرچۆن دەکرێت

بەراوردی یادەوەریەکانی منالی، (لە سەرهەڵدانی و ڕاستێتی) بە مێژووی پێش مێژوو یاخود مێژووی قۆناغێکی سەرەتایی میللەتێ لە میللەتان بکرێت، کە لە دواییدا کۆدەکرێتەوە و بە ئەنقەست ڕاست دەکرێتەوە.

گەر بێینەوە سەر یادەوەری داڵەکە، کەسانێك وەهای لێك دەدەنەوە کە ئەم یادەوەریە شایەنی گرنگی پێدان نییەو بەرەنجامی خۆ خەریك کردن و ئالودەیی لیۆناردۆیە بۆ تێگەیشتن لە فرین. بەڵام فرۆید بیروڕای وایە بە هێندایی گرنگی ئەفسانەکان بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی ژیانی میللەتە سەرەتاییەکان، ئەم یادەوەریەش بۆ تێگەیشتن لە کەسایەتی لیۆناردۆ گرنگە.

خەیاڵی ئەم داڵەی لیۆناردۆ شتێکی نامۆ نیەو هاوشێوەی وەها زۆر دەبینینەوە لە خەوندا، لە دوای وردبینی کردن لە خەیاڵی ئەم ڕووداوە (چونکە چیتر فرۆید یادەوەریەکە بە خەیاڵ یاخود ڕیشگاو "وهم" ناوزەد دەکات) بە چاوی دەرون شیکارێکەوە، دەتوانین ئەم خەیاڵە لە زوبانە نامۆکەیەوە بگۆڕینە سەر ووشەگەلێك ئاشنا بە هەمووان، وەرگێڕانەکەشمان لەسەر پێودانێکی سێکسی دەڕووات.

کلك کە بە ئیتالیەکەی پێی دەوترێت (Coda) هێمایەکی دیارەو لە هەموو هێماکان ئاشکراترە، هێمایە بۆ ئەندامی نێرینەی پیاو لە زوبانی ئیتالیی و هەندێکی تریشدا. هەلوێستی خەیاڵەکەش کە داڵەکە تیایدا دەمی منالەکە دەکاتەوەو بە کلکی پیادەکێشێت، چونیەکی بیرۆکەی خستنی ئەندامی نێرینەی کەسێکە بۆ ناو دەمی کەسێکی تر. (کە بەم پرۆسێسە دەوترێت fellatio) ئەوەی سەیرە لەم خەیاڵەدا بوونی نەریتێکی نەرێتی تەواوە، لە خەون و خەیاڵی دیاریکراوی ئافرەت و نێربازە نەرێتییەکان دەچێت (نێربازی نەرێتی بەو کەسانە دەوترێت کە ڕۆڵی مێینەیی دەبینن لە پەیوەندی سێکسیدا).

لەبەرامبەر ئەم لێکدانەوەیەدا فرۆید داوای هێمنی لە خوێنەر دەکات بۆ ساتێك چون مەبەست لە شیکاری دەرونی لەکەدارکردنی پیاوێکی مەزن نییە، توڕەبوونیشمان ئەو خەیاڵەی منالی لیۆناردۆمان بۆ لێکناداتەوە.

پرۆسێسی فیلاتیۆ دروست بووی ئەم سەردەمە نییە بەڵکو لادانێکی سێکسییە لە دێرزەمانەوە پەیڕەو کراوە بە پێی پەیکەری نێو ئاسەوارە کۆنەکان کە ئاماژەی بە لادانێکی وەها تیایە، ئەم هەلوێستەش شتێك نییە پەرەسەندنی هەلوێستێکی تر نەبێت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان تیا هەستمان بە ئاسودەیی کردووە، کە ئەو هەلوێستەش بریتییە لە تەمەنی شیرەخۆریی (کاتێ منالەکە لە لانکەدا دەبێت) ئەو دەمەی منالْ مەمکی دایکی (یاخود دایەنی)

دەمژێت. کاریگەری ئەندامی ئەم پرۆسێسە وەك لەزەتێکی یەکەمین لە ژیانماندا ئاسەوارێکی چەسپیومان تیا بەجێ دێڵێ کە ناسڕێتەوە.

بەم شێوەیە هۆکاری گێڕانەوەی ئەزمونی ئەو داڵە لە لایەن لیۆناردۆوە بۆ کاتی شیرەخۆرەیی تێدەگەین، بەڵام تێبینی شتێك دەکەین کە چیتر لێی تێنەگەیشتوین، ئەویش گۆڕانکاری پێکردنی لیۆناردۆیە بۆ ئەو یادەوەرییە بەرەو خەیاڵێکی نێربازی نەرێتی و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە لیۆناردۆ وەك کەسایەتییەکی خاوەن هەستێکی سێکسی شاز بەدەردەخات. هەڵبەتە مەبەست لێرەدا سروشتی هەست کردنەکەیە نەك کارتیاکردنێکی کردەوەیی بۆ شازبوونی سێکسی، هەر ئەم سروشتی هەستکردنەشە بڕیاری ئەوەمان بۆ دەدات ئایا ئەکرێت سیفەتی شازێتی سێکسی بدەینە پاڵ کەسێك. سەرباری ئەو خاڵەی ئاماژەمان پێدا لای فرۆید جێگرتنەوەی داڵە سورەکە لە جێی ڕۆڵی دایك جێی پرسیارەو دەڵێ: بنەچەی ئەم داڵە چییە؟ چۆن هاتە ئەم جێگەیە؟

لە نووسینە هێرۆگلیفیە پیرۆزەکانی میسری کۆندا وێنەی دایك لە شێوەی داڵێکدا بەرجەستەکراوەو میسریە کۆنەکان پەرستویانە وەك خواوەندێك کە لەشی مرۆڤ بووەو سەری داڵ، یاخود چەند سەرێکی هەیە، بە لایەنی کەمەوە سەرێك یا دوانی لە شێوەی سەری داڵدایە. ناوی ئەم خواوەندە (مت Mut) بووە. جێی پرسیارە کە بپرسین نزیکی و هاوشێوەییەك کە لە نێوان وشەی (مت Mut) و وشەی دایك (Mutter)دا هەیە، ئایا بەرەنجامی ڕێکەوتە؟ کەواتە پەیوەستییەکی جۆرێك لە ڕاستی لە نێوان داڵ و دایك دا هەیە، بەڵام بەهای ئەمە چییە بۆمان؟ دەکرێت زانینی ئەم ئەفسانەیە بدرێتە پاڵ لیۆناردۆ لەگەڵ ئەوەی بۆ یەکەمین جار فرانسوا شمبلیون سەرکەوتنی بەدەست هێنا (لە نێوان ساڵانی ١٧٩٠ و ١٨٣٢) لە خوێندنەوەی هێما هیرۆگلیفیەکان؟

هەڵبەتە ئەم پرسیارانەمان بەرەو پرسیارێکی تر پەلکێشمان دەکات، ئەویش ئەوەیە بۆچی میسریەکان داڵیان وەك هێمای دایکایەتی هەڵبژاردووە؟ ئەو هۆکارە چی بووە پاڵی پێوە ناون تا ئەم هەڵبژاردنە بکەن؟

گریك و ڕۆمانەکمان گرنگییەکی زانستییان بە ئاین و کەلتوری میسری داوە، پێش ئەوەی بتوانرێت ئاسەوارە میسریەکان بخوێنرێتەوە، هەندێ زانیاری لە بەردەستا بووە دەربارەیان (واتە دەربارەی کلتور و ئاینی میسری) لەنێو ئەو بەرهەمە پارێزراوانەدا کە دەربارەی ئاسەواری کۆنن. نووسەر و خاوەنی هەندێك لەو سەرچاوانە دیارو ناسراون و دڵنیاین لێیان بەڵام نووسەری هەندێکی تریان دیار نین یاخود گەر دیاریش بن نەناسرێن[١٩]. لەم سەرچاوانەوە

ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە داڵ هێمایەك بووە بۆ دایکایەتی چون لەلای میسریە کۆنەکان وا زانراوە کە ئەم جۆرە باڵندەیە هەموویان مێیەن و نێرینەیان تیا نیە یاخود نێرینەی نیە. مێژووی سروشت ناسی کۆنیش گوخلێنکە (قالۆنچەی دەشت کە تەرس کۆدەکاتەوە) یاخود قالۆنچەی ڕەش لە هەمان پلە دائەنێت، میسریە کۆنەکان لایان پیرۆزە، لەلای ئەوان ئەم جۆرە قالۆنچە تەنها نێرینەن و مێ‌ی تیا نییە.

گەر بێینەوە سەر ئەفسانەی داڵەکەو بپرسین ئەی بە بیروباوەڕی ئەوان گەر داڵەکان هەموو مێ بن چۆن زاوزێ دەکەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بە ئامادەیی و کاملی لە یەکێ لە بەندەکانی هۆراپۆللۆدا دەدۆزینەوە، کە تیایدا ئەو جۆرە باڵندەیە ئەندامی مێینەیان دەکەنەوەو با دەیپیتێنێ.

ڕەنگە لیۆناردۆ ئەم ئەفسانە زانستی‌یەی بیستبێ کە میسریەکان بیرۆکەی دایك لە وێنەی داڵدا دەبینن، چون لیۆناردۆ خوێنەرێکی چلێس بووە و بە هەموو بوارەکان گرنگی داوە لە ئەدەب و زانین، لەم میانەشدا زێدەڕۆیی ناکەین لە ژمارە زۆری ئەو کتێبانەی خوێندویەتیەوە پشت بەو هەڵبژاردنانەی Fr. Richter لە نیگارەکانیا کردویەتی.

لەنێو ئەم سەرچاوەو کتێبانەدا خەروارێك لە دانراوە کۆن و هاوسەردەمەکانی بواری مێژووی سروشتناسی تیابووە. ئەو کتێبانە لە کاتی ئەودا بەردەست بوون و وەهاشی ڕێکەوت کردووە کە میلانۆ سەنتەری هونەری چاپی نوێ بووە لە ئیتالیادا. گەر زیاتر بچینە پێشەوە ڕێکەوتی ئەوە دەکەین کە هەرچی زیاتر دڵنیامان دەکات لە بیستنی لیۆناردۆ بۆ ئەفسانەی داڵەکە. قسەکەر و پەخش کەری هۆراپۆللۆ کە خاوەن ڕۆشنبیری و زانینێکی فراوانە ئاوا ئاماژە بەم ڕووداوە دەدات لە (لاپەڕە ١٧٢)داو دەڵێت: "پیاوانی کلێسا بە پەرۆشی و هۆگریەکی توندەوە ئەفسانەی داڵی پاکیزەیان گرتبوو وەك دیاردەیەکی سروشتی تا لە توانا بوونی بەدیهاتنی بەسەرهاتی مریەم و منداڵ بوونی مەسیحی پێ بسەلێنن، لەبەر ئەم هۆیە باسکردنی ئەم چیرۆکە لە زۆربەی کلێساکاندا بەردەوام دووبارە دەبۆوە".

باوکانی کلێسا بە شادمانیەوە ئەم ئەفسانەیەیان وەرگرت تا وەك بەڵگەیەك لە مێژوودا بەکاری بهێنن دژ بەوانەی گومانیان لە لەدایك بوونێکی پاکیزانە هەیە (واتە لە دایك بوونی مەسیح لە دایکی بەبێ باوك). هەروەك چاکترین سەرچاوە کۆنەکان دەڵێن: گەر بشێت داڵەکان لە با بپیتێن، بۆ ناشێت هەمان شت لەگەڵ مێیەی مرۆڤدا ڕووبدات گەر بۆ جارێکیش بووە؟ لێرەدایە فرۆید دەڵێت چی‌تر نابێت گومان لەوە بکەین کە لیۆناردۆ ئەم ئەفسانەیەی نەبیستبێت، گەر لە هەمان ئەم سەرچاوە بەهێزەشەوە بێت.

لێرەوە لە یادەوەریەکی بروسکە ئاسادا کە دواتر لێ بۆتە خەیاڵ، ئاواتی ئەوەی خواستووە ئەویش منالی سوورە دالێك بوایە و دایکی هەبوایەو باوکی نەبوایە، چونکە بێبەش کردنی لە لەزەتی کۆشی دایکی بیرناچێتەوە لەلایەن باوکییەوە، لە ڕاستیدا هەر بەم ڕێگایەش خۆی وەك مەسیحی منال دەبینێت. لە لایەکی تریشەوە لە دایك بوونە ناشەرعییەکەی ڕێك دەکەوێت لەگەڵ خەیالی سورە دالەکەدا. بەرەنجامی زۆر بیرکردنەوەی لە تەنهایی خۆی و دایکی و چۆنیەتی دروست بوونی ئەم.

گەر بگەڕێینەوە سەر پرسیاری یەکەممان کە وتمان بۆچی ئەم یادەوەریە بەرەو هەلۆیستێکی نێربازی یاخود شازی سێکسیمان دەبات؟ وتمان وێنەی دایك گۆڕا بۆ دالێك و لە هێمای کلکی دالەکەشمان کۆلیەوە، بەلام ئەوەی سەیرە لێرەدا ئەوەیە چۆن ئەم چالاکییە ئەندێشەیە ئەندامی نێرینە دەبەخشێتە بالندەیەکی دایك؟

زۆر جار خواوەندی دایك (مت Mut) کە خاوەن کەللەسەرێکی دالە لای میسریەکان تێکەل بە خواوەندی دایك (ئیزیس Isis) (گەورە ژنە خواوەندی میسریەکان و ژنی ئوزیریس و دایکی حورس) و هاتۆر Hathor خواوەندی جوانی و خۆشەویستی و مێردکردن لای میسریە کۆنەکان کە ئامادەکاری گشت منال بوونێکە، دەکرێت، بەلام ئەم دوو خواوەندە خاوەن کەسایەتی خۆیانن بە ڕوون و ئاشکرایی.

بەلام میسریەکان خواوەندی دایکی خاوەن سەری دالیان (وەك لە هەموو پەیکەرەکانیدا دەرئەکەوێت) بە شێوەیەك دروست کردووە کە مێینەیەتی لەشیان بە دوو مەمك دەرخستووەو بەلام هەندێ نێرینەیەتیشیان لە شێوەی ئەندامێکی زاوزێی نێرینەدا پێ بەخشیوە. خواوەندی مت هەلگری هەمان سیفەتی نێرینەو مێینەیە کە لە ڕیشگاوی سورە دالەکەدا هەیە وەك ئەوەی لیۆناردۆ وێنای کردووە. لێرەدا فرۆید دەگاتە ئەو بەرەنجامەی بپرسێت ئایا دەکرێت وای لێکبدەینەوە کە لیۆناردۆ لە ڕێی خوێندنەوەوە زانیویەتی کە دالی دایك نەریتێکی نێرە موکانەی هەیە؟ بۆچونێکی وا زۆر جێی گومانەو بوونی نەریتێکی نێرەموکانە تەنها تایبەت نەبووە بە خواوەندی متەوە بەلکو وەك وتمان ئیزیس و هاتورو نیت Neith کە دواتر خواوەندی ئەسینای گریکی لێ دروست کرا ئەمانە گشت وەك نێرەموکێك نمایش کراون، بە تایبەت کۆمەلەی دیونیسیۆسی و ئەفرودیت.

زانستی ئەفسانەکان ئەوەمان پێ دەلێت کە ئەندامی نێرینە خستنە سەر لەشێکی مێینە مەبەست لێی هێمایەکی هێزی سروشتی سەرەتایی بووەو گوزارشتێك بووە لە یەکگرتنی توخمی نێرینەو مێینە کە تاکە ڕێگەیەك بووە بۆ بەدی هێنانی وێناکردنێکی پڕ شکۆ بۆ

کەماڵێکی یەزدانی. نەك بەرجەستەکردنی وێنەی ئەو نێرەموکە ڤێزەونەی ئەمڕۆ. (چون پرسیار دەربارەی ڕەگەزی خودا هەمیشە خولیای مرۆڤ بووە هەر لە ئەفسانەکان و ئاینە سەرەتاییەکانەوە هەتا جەخت کردنەوەیەکی تایبەتی ئاینە ئاسمانیەکان لەسەر نە نێرو نە مێ بوونی ڕەگەزی یەزدانی، هەرچۆن ئاینە ئاسمانیەکان و ئەفسانەکان بە بەخشینی هەردوو ڕەگەزەکە بە خواوەندەکانیان جۆرێك بووە لە وەڵامی ئەو پرسیارە لە لایان یاخود دەتوانین بڵێین بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکەیان داوەتەوە).

گەر هەنجەتی بەخشینی ئەندامی نێرینە بە لەشێکی مێینە لەسەر ئاستی کۆمەڵگای سەرەتایی بەم شێوەیە تێبگەین و هۆکارەکەی لێك بدەینەوە، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە ئەو مەتەڵە سایکۆلۆجیەمان بۆ شیناکاتەوە. مەتەڵی بەخشینی هێزی نێرینەیی لە وێناکردنی گەوهەری دایکایەتیدا کە سیمایەکە دژ بە مێینەیی دایکایەتی. لێکدانەوەی ئەمە لە تیۆریە سێکسییە منالیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، چون منالێتی مرۆڤ (تاك) هاویەکە لەگەڵ سەرەتای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، هەربۆیە پەرەسەندنی دەرونی تاك شتێك نییە دووبارەکردنەوەیەکی کورتی پەرەسەندنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی نەبێت.

کاتێك منالْ (کوڕ) خۆشەویستی گەڕان و زانینی ئاراستەی ئەندامی نێرینەی خۆی دەکات وەك بەشێکی بە بەها لە لەشیداو لەو باوەڕیشدا نییە هەرکەسێ لەم بچێت (واتە مرۆڤ بێت) خاوەنی ئەندامێکی وەها نەبێت تەنانەت ئافرەتیش، ئەم لێکدانەوەو وێناکردنە زۆر بەهێز خۆی دەچەسپێنێت لەلای منالْ، تەنانەت وەختێ هاوتەمەنەکانی خۆی دەبینێت لە ڕەگەزی مێ و ئەندامیان لەم جیاوازە، ڕەتی ئەوە دەکاتەوە ئەم ئەندامێکی پێوە بێت بەوانەوە نەبێت یا بە پێچەوانەوە، لەبری ئەمەش خۆی قەناعەت پێ دێنێت کە ئەوانیش هەمان ئەندامی ئەمیان هەیە، بەڵام هێشتا بچوکەو پێی نەگەیشتووە، کاتێ دواتر لە قۆناغێکی تردا چاوی پێی دەکەوێتەوە بەوە لێکیدەداتەوە کە ئەندامی نێرینەی گەورە بووە بەڵام بۆیان بڕیوە، چون خۆی زۆر کەوتۆتە ژێر هەڕەشەی بڕینی ئەم ئەندامەیەوە ساتێ خەریکی ئەم ئەندامەی بووە. بەمەش دەوترێت گرێی خەساندن[٢٠]. لە دواییشدا کە دڵنیا دەبێت ئافرەت ئەندامی نێرینەی نییە هەموو حەزو ئارەزووی پێچەوانە دەبێتەوەو لە بری ئەو هەستە توشی ڤێزهاتنەوەیەك دەبێت کە ڕەنگە ببێتە هۆکاری توش بوونی بە پەککەوتنی سێکسی دەرونی لە ساڵانی پێگەیشتنیدا و وازهێنان لە ئافرەت و وەرگرتنی شازێتیەکی سێکسی تاسەر.

بۆ مرۆڤ نالوێت تێگەیشتنێکی ڕاست لە چالاکی سێکسی منالْ تێ بگات، لەسەر ئەمەشەوە ڕەنگە ئەم تێبینیانە بە چەند شتێك وەرگرێت کە شایەنی بڕواپێهێنان نین تا ئەو

ڕۆشنبیریەی لە ئارادا بێت کە نەفرەت لە ئەندامەکانی سێکسی دەکات سەرجەم. کەواتە بۆ ئەو تێگەیشتنە ڕاستەی ئاماژەمان پێداو لە پێناویدا دەبێت لە دوای شتهایەکی هاوشێوە بگەڕێین لە سەردەمە سەرەتاییەکانی مرۆڤدا تا لە ژیانی دەرونی منالٚ تێبگەین. نەوەهایەکی یەك لە دوایەك سەریان لێ تێك داین و ونیان کردین بە دانانی ئەو نەریتە باوەی ئەندامەکانی سێکسی بە کۆمەلێ بابەتی شەرمو شورەیی کردن بزانین، خۆ ئەگەر توشی بارێکی چەپاندنی تەواو بووینەوە ئەوا لامان دەبنە بابەتهایەکی قێزەون. زۆربەی خەلکی ئەم سەردەمە بە سوێیەکەوە پەیڕەوی یاسای زاوزێ دەکەن، وا دەزانن بە ملکەچ پێکردنیان بۆ سێکس و ناچاریان بۆ ژن و مێردایەتی قێزیان لە خۆیان دەبێتەوەو زۆر لە خۆیان دەکەن. هەموو ئەو بیروباوەڕە مێژوویانەی لەسەر سێکس هەمان بوو چیتر نەمان ماو، هاتە دواوە تا بوونە پاشەڕۆی ئەو هزرانەمان کە بەبێ ئابڕوویی و تڕۆیی دادەنرێن و چینە کۆمەلایەتیە نزمەکان دەیگرنە خۆ. بەلام سێکس لە نێوان چینە بالاو هەرچی زیاتر شارستانیەکاندا دیارنەماو گۆشەگیر بوو وەك شتێکی سوك و ڕیسوا و کەم بایەخ لە لایەنی ڕۆشنبیریەوە، چیتر نەیتوانی جەخت لەخۆی بکاتەوە لەژێر سەرزەنشتێکی تالٚی ویژدانێکی هەست بە خەتا کردودا. بەلام ڕۆژگاری سەرەتای مرۆڤایەتی مەسەلەکە جیاواز بوو، ئەندامە سێکسیەکان بگرە جێی شانازی و هیوای بوونەوەرانی زیندوو بوو. بە پیرۆز تەماشایان دەکرد هەتا سەردەمی دیارنەمانی پەیوەندیە ڕەسمیەکانی نێوان ئاین و چالاکی سێکسی لە وشیاری گشتیدا. هەندێ ڕێبازی نهێنی ئاینی لە هەولی ئەوەدا بوون لە نێوان هەلگرانی ئەو ڕێبازانەدا هیچ نەبێت مەسەلەکە بە زیندویەتی بهێلنەوە. دواتریش کە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری بەرپا بوو زۆرێك لە بالایی و پیرۆزمەندی سێکسی داڕووخێنرا هەتا ڕمانی دوا پاشماوەکانی بۆ ناو قولایی قێزەونی و تڕۆیی. ئاماژەمان دا بەوەی پەرەسەندنی دەرونی تاك دوبارە بوونەوەیەکی کورتی پەرەسەندنی ڕەگەزی مرۆڤایەتیە، ئەمەش وا دەکات دۆزینەوە شیکاریە دەرونیەکان دلنیابێت لە دەرونی منالٚ دەربارەی گرنگی پێدانی منالٚ بە ئەندامی زاوزێ. هەرچۆن وا پێزانینی منالٚ کە دایك ئەندامی نێرینەی هەیە سەرچاوەی بنەڕەتی گشتی وێناکردنی نێرەموکی خواوەندی دایکە.

تا ئێستا خەیالی سورە دالەکە لای لیۆناردۆ جێی گرنگی پێدانمانە، لیوناردۆ گەرمی پەیوەندی سێکسی نێوان خۆی و دایکی بەو وشە ئاشکرا بێژە سێکسیانە دەردەخات کە دەلێ (بە کلکی زۆری‌دا بە لێومدا). هەرچۆن دەتوانین بەرەنجامی تر لە ناوەڕۆکی ئەم خەیالە بە دەست بێنین لە پەیوەست کردنەوەی جولەی دایکەکە (یاخود دالەکە) بە ناوچەی دەمولێوەوەو

دەتوانین لێکدانەوەی ئەم پەیوەستی‌یە وەها بکەین: (دایکم چەندان ماچی گەرمی لە ژمارە نەهاتوی لێومی کرد). فرۆید دەڵێ: ئەوەی تابلۆکانی لیۆناردۆی دیبێت و لەیادبێت ئەو خەندە ئەفسونیە سەرسوڕهێنەرەی بیرناچێت کە نیگاری کێشاوە، وەك بڵێی ئەفسون بازو جادوگەر بووبێت، ئەم خەندەیەی لەسەر لێوی زۆرێك لە کەسایەتیەکانی (بە تایبەتی ئافرەت) کێشاوە. خەندەیەکە جێگیر لەسەر لێوێکی لاکێشی ترازاو بۆتە سیمایەکی تایبەت بە داڤنشی (کە بە خەندەیەکی لیۆناردی) ناوزەد دەکرێت. بەجێهێشتن و بەرجەستەکردنی ئەم خەندەیە لەسەر ڕووخسارێکی جوان و بێهاوتای خانمێکی فلۆڕەنسی "مۆنالیزا دیل جیوکندا" مەزنترین ئاسەواری جێهێشتووە لەسەر بینەرانی و توشی سەرسامی کردون. دەبوایە پەرژێن (تأویل) بکرایەو پەرژێنەکان چەندان هۆکار پێشکەش دەکەن، بەڵام هەمویان لێکدانەوەیەکی چڕووپڕوو تێر نەبوون. هەروەك جرییە گوزارشتی لێ‌کردووەو وتویەتی: (چوار سەدە تێپەڕی بە نزیکی‌و مۆنالیزا سەری هەموو ئەوانە دەخولێنێتەوە کە ماوەیەکی زۆر چاودێرییان کردووەو لێیان تۆژیوەتەوە، دەیانەوێت دەرباری بدوێن).

مۆسەر دەڵێ: ئەوەی بینەر بە کێش دەکات ئەم ئەفسونە شەیتانی‌یە یەخسیرەیە لەو خەندەیەدا. بە سەدان شاعیر و نووسەر دەرباری ئەم ئافرەتە نووسیویانە کەوا پێدەچێ ئەمێستا بزەیەك دەیگرێ بۆمان، بزەیەکی سەرلێشێوێنەرانە، دواتر بە ساردیەکەوە لێمان ڕادەمێنێت و دەڕووانێتە دوور، بەرەو پانتاییەك وەك ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نەبێت، کەسێك نەبووە بتوانێ ڕازی ئەم خەندەیە بدۆزێتەوە، کەسێك نییە توانیبێتی هزری بخوێنێتەوە. هەموو شتێك لە تابلۆکەدا نادیار و ئاڵۆز و خەونیەو لەرزیوە بە گەرمی‌یەکی حەزلێ‌کردن و برسێتی‌یەوە، هەتا دیمەنە سروشتی‌یەکەی پشتیشی".

زۆرێك لە ڕەخنەگران هەست بەوە دەکەن کە ئەم خەندەیە کۆکەرەوەی دوو توخمی جیاوازە لەناو خۆیدا، کامڵ ترین بەرجەستەکردنێکە بۆ ئەو دژایەتیەی ژیانی هەر ئافرەتێکی تەنیوە، دژایەتی نێوان پۆشتەیی و ڕووتی و نێوان ئایەتە پڕ سۆزە خۆبەدەستەوە دەرەکان و جوان پۆشیەکی بێ دەربەستانە کە تیایدا پیاوان دەکەونە داوی حەزێکی سوتێنەرەوە. مۆنتز دەڵێ: ئێمە دەزانین چ ڕازێکی ئەفسوناوی دورەدەست لەهەر لێکدانەوەیەکە، مۆنالیزا پێشکەشی سەرسامبوانی خۆی کردووە، ئەوانەی نزیکەی چوار سەدەیە دەوریان داوە.

نووسەرێك لەژێر ناوی پیردی کورلای دەڵێت: ڕووی نەداوە هونەرمەندێك بەم شێوازە، پەنهانیەکانی گەوهەری مێینەیەتی بەرجەستە بکات لە: نیانی و چەپخونی (شقاوة)، بە شەرمی‌و هەوەس بازی، هەموو پەنهانی و شارراوەییەکی ناو دڵ کە بە دووری دەگرێت لە

خەڵکی، ئەو ئاوەزەش کە بیردەکاتەوەو ئەو کەسایەتیەی هەڵکوڕماوی ناخی خۆیەتی هیچ شتێك نابەخشێ و نادات بە دەستەوە تەنها دەروشاوەیی و ڕەونەق نەبێت.

ڕەخنەگری ئیتالی ئەنجیلۆکۆنتی دەڵێت: ئافرەتەکە لە هێمنی‌یەکی شاهانەدا خەندە لەسەر لێویەتی، خۆماکەکانی سەرکەوتن و والاکردن و توندوتیژی و ئەوانەی گشت لە کلتوری مرۆڤدان، ویستێك بۆ تێکەوتن و فریودان و جادویەك بۆ خەڵەتاندن و ناسکی‌یەك کە ئامانجێکی توندوتیژی تیا پەنهانە، هەموو ئەمانە دەرکەوتن و دیارنەمان لە پشت خومارییەکی پێکەنیناویەوە، تواوەوە لە هۆزانی خەندەیدا.. خێرو شەڕ، بەزەیی و دڵڕەقی پێکەوە پێدەکەنن. پێدەکەنی پێکەنینێکی شیرین بەڵام وەك پێکەنینی پشیلەکان.

و. پاتر لە کتێبی ڕێنیسانسەکەیدا دەڵێ: ئەو خەندەیەی ئەستەمە دەستمان بە ڕەهەندەکانیدا بگات، کە دەست لێدانێکی توندوتیژی تیا جێگیرەو دواتر لە کارەکانی تری لیۆناردۆدا دەردەکەوێت. گەر شایەتە مێژووییەکان نەبوایە دەمان وت ئەم خانمە نمونەی باڵای ئافرەت بووە لەلای کە بۆ دواجار پێی گەیشتووە.

فرۆید لە دوا ئەم پێودانگە دەڵێ هیرزفیلد شتێکی وەك ئەم بابەتەی پەی پێ بردووە کە وتویەتی: لیۆناردۆ لە مۆنالیزایادا بە خودی خۆی گەیشت. فرۆید زیاتر دەڕوواو دەڵێ: دڵنیا دەبین لە هەستکردنمان کە خەندەی مۆنالیزا یادەوەری ساڵانی یەکەمی منالی لە لیۆناردۆدا بەئاگاهێناوە کە دواتر لە تابلۆی خێزانی پیرۆز و ڕووخساری ئانای پیرۆزمەنددا دڵنیاتر دەبێت.

لیۆناردۆ سەرکەوتنی بەدەست هێناوە کە مانایەکی دوو ڕوو ببەخشێتە خەندەکەی مۆنالیزاو دوو ڕووخسار لەم خەندەیە بەرجەستە بکات، ڕووخسارێکی سۆزبەخش بەبێ سنور، ڕووخسارێکیش هەڕەشەیەکی بەدی لەخۆگرتووە. دواجار دێتە سەر ئەوەی بڵێت ئەم خەندە دژوارە خەندەی دایکیەتی ئەو خەندەیەی لێیان ون کردو لە دەستی چو، کە کاتێکیش سەرلەنوێ لەلای خانمێکی فلۆرەنسی بەدیکردەوە شەیدای بوو بە بلیمەتی‌یەکەشی لە نیگارکێشاندا بەرجەستەی کرد.

دواجار گەر لە هەموو بۆچونەکان وردبینەوە، (بە وانەی فرۆیدیشەوە) دەبینین زۆری (گەر نەڵێم هەمووی) لە دەوری خەندەو دەمولێو خول دەخۆن و ئاراستە دەبن هەرچۆن هێڵی سەرەکی ریشگاوی سوورە داڵەکەش هەر دەربارەی دەمولێوە، بۆیە بوونی پەیوەستیەکی ساتەوەختی بە دوور ناگیرێ لەنێوانیاندا.

لە دوا مۆنالیزا فرۆید ئاماژە بە یادەوەریەکی لیۆناردۆ دەدات لەسەر هەواڵی مردنی باوکی کە تیایدا دووجار کاتژمێری مردنەکەی تیا نووسیوەتەوە، هەرچۆن ئاماژە بە رێو رەسمی بە خاك سپاردنی دایکی دەدات بە هەموو خەرجیەکی وردەکاری و گرنگی پێدانێکی زۆرەوە کە بە پێچەوانەی یادەوەری نووسینەکەی باوکیەوە لێکدانەوەیەکی ئەرێتی بۆ کردووە. دواتر دێتە سەر باسی زیاتر دەرخستنی کاریگەریی مناڵی لەسەر کەسایەتی لیۆناردۆ پەنا بەر ئەو وتەیە دەبات کە دەڵێ: هەموو مەزنەکان دەبێت شتێك لە مناڵییان تیا مابێت. بۆیە کۆمەڵێ هەڵسوکەوتی مناڵانەی هەیە، ڤازاری دەڵێت: "هەندێ شتی دادەهێنا کە کەس لێی داوا نەکردبوو، لە رۆما لە هەویرێکی مۆم هەندێ ئاژەڵی بچوکی دروست کرد کە ناوەکەیان لە هەوا بۆش کردبوو، فوی پیا ئەکردن دەفرین لە هەواداو وەختێ هەواکەشی تیا نەما بەردەبوونەوە. یا جارێکیان دوو باڵی لە چەرم بۆ مارمێلکەیەکی گەورەی سەیر دروست کرد (کە مەی گێڕی بلفدیر راوی کردبوو) هەردو باڵەکەی بە جیوە پڕکرد، هەر کە مارمێلکەکە دەجولایەوە باڵەکانیشی دەجولان، دواتر دوچاوی گەورەو ردێن و قۆچی بۆ کردو خستیە ناو سندوقێکەوەو هاورێکانی پێ دەترساند". زۆر جاریش ریخۆڵەکانی مەڕی چاك پاك دەکردەوەو دەیبردە ژورێکی فراوانەوەو فوی تێئەکرد(بەموشەدەمەیەك کەبەنهێنی لەژوورێکی تردانابوو) هەتا هەمو ژورەکەی دەگرتەوە و خەڵکەکانیش لە لایەکی شوێنەکەوە دەوەستان و سەیریان دەکرد. سەرباری ئەم حاڵەتانە لیۆناردۆ هەندێ شتی سەیری کردووە کە مێژوونووسەکان زۆرجار لێی تێنەگەیشتون، لە دەستنووسەکانی میلانۆیدا (مۆنتزو هیرزفیلد لە تێبینی دەقە نامەییەکانەوە وەریان گرتووە) رەشنووسی چەند نامەیەکی تیایە بۆ (دیوداریۆی سوری بریکاری سوڵتانی بابلیۆنی پیرۆز" تیایدا خۆی وەك ئەندازیارێکی سەفەرکردوو بۆ ئەو شوێنانەی رۆژهەڵات پیشان دەدات تا هەندێ پرۆژە لەوێ جێبەجێ بکاتو باسی جوگرافیای شارو شاخەکانی دەکات و دواجار ئاماژە بە رووداوێکی مەزن دەدات کە لەوێ روویداوە. یاخود وەك ج ب. رختر هەوڵدەدات بیسەلمێنێ کە ئەو تێبینییانەی لیۆناردۆ دەربارەی سەفەرێك بۆ میسر نووسیویەتی و لە خزمەت سوڵتانی میسریدا بووە ساڵی ١٤٨٣ بووەتە ئیسلام لەوێ، کەسێ دەینووسێ کە بە جیدی خۆی چوبێت بۆ ئەو سەفەرەو بە نیگارکێشانەوە.

هەندێ دەڵێن ئەمە تەنها خەیاڵی خۆیەتی هیچیتر کە حەزی بە سەرکێشی و سەفەر کردووە. یا لە جێیەکی تردا پێنج بۆ شەش دروشمی بۆ ئەکادیمیەك دروست کردووە لەوپەڕی جوانی و هونەرو وردەکاریدا، ئەکادیمیەکە بە ناوی خۆیەوەیە و دروشمەکەی لەسەر مس دروست کردووەو لە ناوەڕاستیا زۆر بە ئاشکرایی نووسیویەتی: ئەکادیمیەی لیۆناردۆ داڤنشی.

ڤازاری باس لەم دروشمانە دەكات بەڵام باسی ئەكادیمیاكە ناكات. لەدوا دوایدا فرۆید دەڵێ: گەر لیۆناردۆ كەسێكی تر بوایە هەرگیز نەیدەتوانی سەرەكیترین بەشی لیبیدۆی خۆی لەژێر فشاری چەپاندندا دەركێشێ و باڵای پێ بكات بۆ ئارەزوو لە زانیندا. هەر بۆیە لە ئەزموونەكانمانەوە زانیمان سەركوت كردنی كامڵی ئارەزووە سێكسییەكان مەرج نییە گونجاوترین هەلومەرج بۆ باڵاپێكردنی بخەملێنێ.

## مایكل ئەنجیلۆ بۆناروتی (Michelangilo Bonarroti) (١٤٧٥-١٥٦٤)

"ئاسودەیی من لە حەسرەتدایەو.. هەزاران شادی لەلای من زریانێك لە زریانەكانی ڕۆح ناهێنێت"

**(مایكل ئەنجیلۆ)**

مایكل ئەنجیلۆ كەسێك نیە لە سنوری چوارچێوەی ژیانیدا بۆمان ڕاگیرێت لە نێوان لەدایك بوونیدا لە دەوروبەری فلۆرەنسا لە ٦ی مارسی ساڵی ١٤٧٥ بۆ مردنی لە ١٨ فبرایر ساڵی ١٥٦٤. هەرچۆن ئەو لە بازنەی سەردەم و جێگەدا ئارام ناگرێ، كە سەردەمی ڕێنیسانس و ئیتالیایە، بەڵكو بەرز دەفڕێ و سنورەكانی سەردەم و شوێن دەبەزێنێ و دەگاتە ئاسۆی مرۆڤایەتی سەراپا وەك هێمای بلیمەتی كە لە چوار هونەری گەورەدا ئەفراندنی كردووە: پەیكەرسازی و نیگاركێشان و تەلارسازی و شیعر. جگە لەمانە بە وێنەیەك ناوزەد كراوە لە كێشەی مرۆڤ دژ بە چارەنووسی و كێشمەكێشمێكی هەمیشەیی لەگەڵیدا. مایكل ئەنجیلۆ لە ژیانیدا كە خەریك بوو سەدەیەك لە زەمان تەواو بكات هێمایەك بوو بۆ ململانێیەكی بەردەوام و لەسەریەك لە نێوان بلیمەتییەكی قارەمانی و ورەیەكی لە جەنگدا بوو لەگەڵ كارەسات و ئازار و دڵەڕاوكێ.

ئەو هێندە نەبوو لە دایك بوو بوو كە دایكی مرد، مناڵیەكی بێ دایكی بردە سەر لە باوەشی ژنە بەخێوكەرەكەیدا كە ژنی پیاوێكی بەرد هەڵكەن بوو، دەوترێت ئەو ژنە لەگەڵ شیردا بەهرەی پەیكەرسازی داوەتێ.

لەشاری كاستل كابریزی پەروەردە بوو نزیك بە هەندێ ناوچە كە بەردی مەرمەڕیان لێدەرئەهێنا. وەختێكیش خێزانەكەیان چوە فلۆرەنسا، ئەو ئارەزوی لەگەڵ هونەر هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە ناردیانە ئەتێلەی (جیرلاندایو)ی نیگاركێش كە گەورەترین نیگاركێش و ئوستادی ئەو سەردەمەی فلۆرەنسا بوو. بەڵام ئەو خواستی لەگەڵ نیگاركێشاندا نەدەگونجا و ڕێكنەدەكەوت و مەیلێكی تایبەتی بۆ هونەری پەیكەرسازی هەبوو، پەیوەندی كرد بە قوتابخانەی لۆرینزۆ دی میدتشییەوە لە باخچەكانی سان ماركۆ. باوكی مایكل ئەنجیلۆ زۆر حەزی دەكرد كوڕەكەی لە بازرگانیدا كاربكات و بۆ خۆی دادوەر بوو، بەڵام ئەو خواستەی

باوکی نەهاتەدی، ئەو دەمەی مایکل ئەنجیلۆ لـە ئەتێلـەی (دمنیکو جیرلاندیو)دا کاری دەکـرد تەمـەنی سیانزە ساڵان بـوو، سێ ساڵ لـەوێ مایـەوە لـە دوا ئـەوە لـە قوتابخانـەی باخچەکـەی میدتشـیدا، کـە لۆرینـزۆ دایمـەزراندبوو زوو بـە زوو لـە لایـەن خـودی لۆریــنزۆوە هەسـت بـە بـەهرەی ئـەم مێردمناڵـە کـرا، ئـەو دەمـە هونەرمـەندی پەیکەرساز (برتۆڵدۆ) ئوسـتادی بـوو کەئەم هونەرمەندە قوتابی دۆناتێللۆ بوو.

نزیـك بوونەوەیـەکی خـێرا لـە نێـوان مـایکل ئـەنجیلۆو خـێزانی لۆریـنزۆدا ڕوویـدا و بـووە هاوڕێی کوڕی لۆرینزۆ و موچەیەکی مانگانەیان بۆ تەرخان کرد.

لە کەشی بنەماڵەی میدتشیدا، لە نێوان ڕێنوماییەکانی ئـەفلاتون و نمونـەی ژیـانی هزریـی لە ڕێنیسانسدا، دنیایەکی بێ برووایی و دنیایەکی مەسـیحی کێشـەیان بـوو لـە دەرونیـدا، بـەڵام ئـەم ماوەیـە گریکـی بـوو، سـەرەتای کارەکـانی بـە پەیکـەری (سـاتێر) و (ئـەپۆلۆن) و (شـەڕی قـەنتورس) دەسـت پـێکرد و داوتریـش (پـاکیزەی سـەرپەیژە)ی بەرجەسـتە کـرد. لـە سـاتێکدا نیگارکێشـان لای داڤنشـی گوزارشـت بـوو لـە بێهاوتـاترینی هونـەرەکان لەبـەر ئـەوەی گشـت دیاردەکـان لـە ژیـاندا کۆدەکاتـەوە، دەبینـین بەختـەوەریی لای (مـایکل ئـەنجیلۆ) لـە تاشـینی بەرددایە بۆ پەیکـەر و ڕزگـارکردنی جەسـتەی سـێ ڕەهـەندیی ئـادەمیزادە لـەناو بارسـتاییەکی بەردینی کەتەدا. لەبەرئەوە وا بیری دەکردەوە کە نیگارکێشان دەبێت هەڵتۆقیوی و دەرپەڕیوی کەسەکان دەرخات لە ڕووی وێنەکەوە تا بەمە لاسایی پەیکەرسازی بکاتەوە.

پێشتر باسمان لـە پـەیوەندی پتـەوی نێـوان خـێزانی میدتشـی و مـایکل ئـەنجیلۆ کـرد، ئـەم پەیوەندیـە زۆری نـەخایاند و بـەرەنجامی شۆڕشـێك کـە فەرمانڕەوایـەتی خـێزانی میدتشـی کۆتاپێهێنا، هونەرمەند شاری فلۆرەنسای بەجێهێشت ساڵی ١٤٩٤ بەرەو ڤینیسیاو بولونیا.

ساڵی ١٤٩٦ ساڵی دەرکەوتنی ناو و ناوبانگی هونەریی ڕۆما بوو، هەر بۆیە مایکل ئـەنجیلۆش خۆی گەیاندە ئەوێ و دەستی کـرد بـە پەیکـەری (بـەزەیی) بـۆ کڵێسـای پیرۆزمـەند پـترۆس لـە نێوان ساڵانی (١٤٩٨-١٤٩٩) ئەوکاتە تەمەنی بیست و سێ ساڵ دەبوو (وەك هەندێ سەرچاوە بۆی دەچـن) ئـەم پەیکـەرە (کـە یەکـەمین پەیکـەرێك بـوو لـە بارسـتاییەکدا دوو جەسـتەی مـرۆڤ لەخۆی بگرێ) لەژێر کاریگەریی و سەرسامی هونەرمـەنددا کـراوە بـەو بیروبـاوەڕوو شۆڕشـەی سافوناروڵا کە بـە ئـاگر سـوتێنرا. ئـەم پەیکـەرە دیـالۆگی هەمیشـەیی دەروونـە لەگـەڵ خـەم و خەفـەتدا. مریـــەم دانیشـــتووەو لەســـەر ڕووی خـــەمێکی هێمـــن هەیـــەو مەســـیح لەســـەر ئەژنۆکانیەتی. ئەم پەیکەرە سەرەتای ناسین و بەناوبانگ بوونیەتی و ڕزگاریەتی لە هەژاریی.

وەختێ ساڵی ١٥٠١ گەڕایەوە بۆ فلۆڕەنسا کارە پەیکەریەکانی و شێوازی کارکردنی کەوتبووە ژێر کاریگەریی پەیکەرەکانی سەردەمی هێلینییەوە کە خاوەن ماسولکەی گەورەو دیارو دەرکەوتون، ئەم کارانەشی لە ڕۆما بەرچاوکەوت. زووبەزوو ئەم کاریگەرییە ڕەنگی دایەوە تیایدا لە پەیکەری (داود)دا، کە فلۆڕەنسییەکان پێیان دەوت (زەبەلاح) لەبەر گەورەیی و ئەو گوزارشتە پاڵەوانێتییانەی شێوازی پڕ بلیمەتی مایکل ئەنجیلۆ دیاریکردبوون. پەیکەرەکە شەش مەتر بەرزەو سەرەتا ویستیان لەسەر یەکێك لە پایەکانی دیواری کاتیدراڵی فلۆڕەنسا دایبنێن، بەڵام پیاوانی ئاینی و هونەرمەندان وایان بە باشتر زانی لەو گۆڕەپانەدا دانرێت کە لە بەردەم کۆشکی سەرۆکایەتیدایە لە فلۆڕەنسا[٢١]. ئەمەش لەبەرئەوەی نمایشی چیرۆکە ئاینییەکە ناکات، چون شتێکی تیا نیە هێمابێت بۆ کەسایەتی جالوتی دڕندە کە لە بەسەرهاتەکەدا هەیەو لە پەیکەرەکانی دۆناتێللۆ و ڤێریکۆدا بەرچاومان کەوت.

دوابەدوای ئەم کارە مایکل ئەنجیلۆ دەستی دایە ئەو پرۆژە دیواربەندەی بە هاوبەشی لەگەڵ داڤنشیدا دروستیان کرد. (لە باسکردنماندا بۆ داڤنشی ئاماژەمان پێدا) ئەم کارانە گشت کارێکیان کرد کە مایکل ئەنجیلۆ ناوبانگ پەیدا بکات و ئەم ناوبانگ پەیداکردنە بچێتە دەرەوەی فلۆڕەنساو شارەکانی ئیتالیا، لێرەدا بوو پاپا یولیوسی دوهەم بانگهێشتی کرد بۆ ڕۆمای پایتەخت ساڵی ١٥٠٥ تا گۆڕستانێکی مەزنی بۆ بنیات بنێت کە شایەنی ئەو بێت. هونەرمەند دەستی کرد بە خۆئامادەکردن بۆ ئەم مەبەستە، سەردانی کانەبەردی کرارای کرد تا مەرمەڕی گونجاو بە کارەکەی هەڵبژێرێ‌و دەستی کرد بە کارکردن تەنانەت هەندێ پەیکەریشی دروست کرد بۆ گۆڕستانەکە، بەڵام پاپا زووبەزوو داواکەی ڕەت کردەوە نەك دروست کردنی ئەم گۆڕە ببێتە نوقلانەیەکی ڕەش بۆی، لەوەو دوا مایکل ئەنجیلۆ گەڕایەوە بۆ فلۆڕەنسا. هەرگیز دەرکەوتنی ئەم کەڵەپیاوە ڕێی لەوە نەگرتووە ئەوانەی سەرسامی ئەون داوای نیگارکێشانی لێ نەکەن، هەرکە گەڕایەوە لەلایەن پیاوێکی خانەدانەوە[٢٢] داوای تابلۆیەکی لێکرا لەسەر (خێزانی پیرۆز) ساڵی ١٥٠٦ تابلۆکەی بە بۆیەی ڕۆنی دروست کردو تەواو کرد، تایبەتمەندێتی پەیکەری زۆر تیا زاڵە ڕەنگی کەم تیا بەکارهاتووە، فیگەرەکانی زیاتر لە بارستایی پەیکەر دەچن و بەرجەستەن بە تایبەت کەسایەتی مریەم. هەر لەم ماوەیەدا بۆ جارێکی تر پاپا یولیوسی دووەم بانگهێشتی ڕۆمای کردەوە، بۆ نیگارکێشانی بنمیچی نوێژگەی کلێسای "سستینا". مایکل ئەنجیلۆ ئەم کارەی پێ خۆش نەبوو ئەو هەرگیز خۆی بە نیگارکێش نەدەزانی نەك هەر ئەوەندە بگرە نیگارکێشانی بە شتێکی کەم دەزانی لەچاو پەیکەرسازیدا و دەیوت: ساتێ نیگارکێشان کامڵ و باڵا دەبێت نزیك دەبێتەوە لە

پەیکەرسازی، بەڵام ساتێ پەیکەرسازی لە ئاستی خۆی دائەبەزێت و بێپێز دەبێت لە نیگارکێشان نزیك دەبێتەوە.

لەم ڕووانگەیەوە داوای لە پاپاکرد ئەو پرۆژەیە بدات بە رافاییل، بەڵام پاپا هەر سور بوو لەسەر ئەوەی ئەو کارەی بۆ بکات. لە دەی ئازاری ساڵی ١٥٠٨دا، مایکل ئەنجیلۆ ئەم دەستەواژەیەی نووسیوەو دەڵێ: (ئەمڕۆ منی مایکل ئەنجیلۆی پەیکەرساز، دەستم کرد بە نیگارکێشان لە بنمیچەکەدا) لە ساڵی داهاتوودا جارێکی تر نووسیویەتی (دانی پیا دەنێم ئەمە ئیشی من نیە تەنها کاتم لێ دەڕووا). تا لەسەرەتای کارەکەدا جارێکیش ڕادەکات و خۆی دەدزێتەوە، بە دوایدا دەگەڕێن.

هەرچەندە یارمەتیدەرو بەردەستی زۆر بوو بەڵام نەیهێشت و قایل نەبوو هیچ کەسێك بە ڕاستەوخۆ کاری لەگەڵدا بکات، هەموو کارەکەی تەنها خۆی ئەنجامی دا بە ماوەی چوار ساڵ، توشی ئازارێکی زۆر بوو بەرەنجامی پاڵکەوتنی زۆر و درێژخایەنیەوە لەسەر سەکۆ تەختەییەکان، کە دواتر کارێکی لێ کەوتەوە جێ شانازی هونەری ئیتالی و وەك دیاردەیەکی سەرسوڕهێن تەماشا دەکرێت و پەرجویەکە نەمری هێنا بۆ ئەفرێنەرەکەی ئەم کارە مەزنە لە سێ بەش پێك هاتووە.

**کۆمەڵەی یەکەم: بابەتهایەکە پەیوەست بە یەزدانەوە**

(أ) خوداوەند ڕووناکی لە تاریکی جیادەکاتەوە.

(ب) خوداوەند ئەستێرەکان دروست دەکات.

(جـ) خوداوەند زەوی موبارەك دەکات.

**کۆمەڵەی دووەم: نمایشی**

(أ) ئەفراندنی ئادەم

(ب) ئەفراندنی حەوا.

(جـ) گوناهکردن و دەرکردن لە بەهەشت.

**کۆمەڵەی سێهەم: دەرباری چیرۆکی نوح و لافاوەکەیە**

(أ) خۆبەخت کردنی نوح.

(ب) لافاو.

(جـ) خۆشی نوح.

ئەم بابەتانە گشت لە چیرۆکەکانی نێو توراتەوە وەرگیرابوون. چواردەوری ئەم نیگارە گەورانە بە چوارچێوەیەك گیرابوو کە وێنەی پەیامبەران و پیرۆزمەندانی تیابوو ژمارەیان

دوانزە بوو بە شێوەیەکی ڕووت دروستی کردبوون تا بتوانێ تواناو کارامەیی خۆی لە توێژینەوەی جەستەی ئادەمیزاددا دەرخات. هەڵبژاردنی ئەو دوانزە کەسایەتیە لەسەر بنەمای ئەوە بوو کە ئەو کەسایەتیانە موژدەی هاتنی مەسیحیان داوە، ئەمە بێ لە هەندێ کەسایەتی مێژوویی و کۆیلەی ڕووت. ئەم کەسایەتیانە وەك نەخشێکی دەرکەوتوی ڕەنگاوڕەنگ لە سەر ڕووی بنمیچەکەوە دەرئەکەوتن. بە لێکدانی ئەرکی تەلارسازی و نیگارکێشان جێ دەستی پێشڕەوایەتی خۆی دیاریکرد بۆ سەرهەڵدانی هونەری بارۆك.

بەم کارەی ویستی دەستەواژەی خۆی لە ڕێگەی کۆمەڵێ هێماوە وەرگێڕێ تا خەڵکی پێ بدوێنێ لە بنمیچی سستیناوە، هێماگەلێك کە زیاد لە سێ سەد نیگار دەبێت و پێیان سەرو وەیدامەدانی ڤوتابخانەی ڤینیسی و سەرڤاڵیە ڕەنگەیەکەی کەوت، هەرچۆن گوزارشت لە مانای مادی شتە بینراوەکانی نێو ڤوتابخانەی فلۆڕەنسی بەجێهێشت، تا ئەو تۆوە کامڵ کات کە لە هونەری جیۆتۆدا سەوز بوو و لە هونەری مازاتشیۆدا ڕاگەیەنرا، ویستی بوو بە شێوازێکی زەبەلاحی نزیك بە پەیکەرسازی ئەفراندنی دونیاو مرۆڤ و دەرهێنانی ڕووناکی لە تاریکی و گوناە و لافاو و جەستەی مرۆڤ بکاتە شانۆیەك بۆ گوزارشت کردن لە قوڵترین هەست و سۆزەکان، لە نیگارکێشاندا هێماگەلێکی زەبەلاحی وەهای دانا تا چیرۆکی دنیا بگێڕنەوە. بەم کارە مەزنە کە ساڵی ١٥١٢ لێبۆوە چاوی کز بوو و تەندروستی تێك چوو، بە هۆی مردنی پاپاشەوە خەڵاتی کارەکەی نەدرایە. بەم ڕووداوەش دیسانەوە ئەو خەونەی تیاچوو کە ویستی دوای کارکردن لەم بنمیچەدا بگەڕێتەوە سەر دروست کردنی گۆڕەکە. بەڵام ئەم پرۆژەیەی هەر جێبەجێکرد لەسەر داوای خێزانی پاپا یولیوسی دووەم هەرچەندە سێجار لێی بڕاو تا تەواو بوو سیو پێنج ساڵی خایاند.

چەند پەیکەرێکی گۆڕستانەکەی لە سەرەتادا ئامادەکرد وەك پەیکەری موسا کە وەختێ تەواوی کرد هەر بە پیاوێك و مرۆڤێکی ڕاستەقینە دەچوو بۆیە پڕ بە دەم هاواری لێکرد: دەی بدوێ!!

ئەم کارە سەرباری دروست کردنی پەیکەری کۆیلەکان و پەیکەرێك بۆ پاپا. پەیکەری دوو کۆیلەکە یەکێکیان هێمایەکە بۆ خۆ بە دەستەوەدان و نەمانی وورە، ئەوی تریشیان هەڵگەڕانەوەو شۆڕشگێڕی دەکاتە هێمای خۆی، هەردوو کارەکە وێنایەکە بۆ تواناو کارایی مایکل ئەنجیلۆ لە گوزارشت کردنیدا بۆ هەڵچونە دژ بە یەکەکان.

پاپا لیۆی دەهەم کوڕی لۆرینزۆی مەزن بوو لە خێزانی میدتشی، وای بە باش زانی بە سەلیقەیی و بلیمەتی ئەنجیلۆ بەکاربێنێت بۆ جوانکاری شاری فلۆڕەنسا گەرچی پێشتر

پرۆژەیەکی تەلارسازی پێ سپاردبوو کە ڕووی کڵێسای سان لورینزۆو نوێژگەی بنەماڵەی میدتشی بوو، ئەویش زۆر بە دڵگەرمیەوە وەریگرتبوو لەسەر ئەم کارە وتویەتی (ویستێکی بەرجستەکردنی ئەم کارەم هەیە کە دەیکاتە ئاوێنەی تەلارسازی و پەیکەرسازی سەرانسەری ئیتالیا). ئەمە بێجگە لەوەی هەر لەم میانەدا پاپا کلیمنتی حەوتەم، کێشانی دیزاینی کتێبخانەکەی پێ سپارد، ئەمەشی وەرگرت بەو هەنجەتەی تەلارسازی نزیکە لە پەیکەرسازیەوە، پەی پێ بردنی هەست کردن بە فۆرمی مرۆڤ و کۆمپۆزشنی دەخوازێت.

هەر ئەوکاتە بۆ ڕازاندنەوەی فلۆرەنسا چووە ئەو شارەو دەستی کرد بە ڕازاندنەوەی هەردوو گۆڕی جولیانۆ و لۆرینزۆ میدتشی، لەسەر داوای لیۆی دەهەم کارەکانی ڕۆمای ڕاگرت، بۆ ئەم دوو گۆڕەش داوای دروست کردنی بینایەکی کرد لە فلۆرەنسادا کە سەر بە کەنیسەی پیرۆزمەند لۆرینزۆ بێت و هەردوو گۆڕەکەش بگرێتە خۆی، کارکردن لەم پرۆژە گەورەیەدا لە ساڵی ١٥٢٠ وە تا ساڵی ١٥٣٤ی خایاند (دیارە بە لێبڕانەوە)، ئینجا هەردوو گۆڕەکە کۆتاییان پێهات، لەسەر گڵکۆی جۆلیانۆی کوڕی لۆرینزۆی شکۆمەند کە برای پاپالیۆی دەهەم دەکات، پەیکەرێکی کەسایەتی دانیشتوی جل و بەرگ ڕۆمانی دروست کرد کە لە بەردەمیا دوو پەیکەری پاڵکەوتوی هێما بۆ (شەو و ڕۆژ)ی داناوە. لە بەردەمی پەیکەری لۆرینزۆشدا دوو پەیکەری پاڵکەوتوی تری دانا کە هێمابوون بۆ (بەیان و ئێوارە). لەم چوار پەیکەرەدا تێبینی ئەوە دەکەین تا چ ڕادەیەك هونەرمەند کەوتۆتە ژێر کاریگەریی پاڵەوانە وەرزشیەکانی گریکەوە کە رووتن.

پێش ئەوەی کارکردنی لەم پەیکەرانەدا تەواو ببێت دیسان پاپا ناردیەوە بە شوێنیا بۆ ڕۆما، بەڵام ئەمجارە هەڕەشەی میراتگرانی یولیوسی دووەم بۆ تەواوکردنی پرۆژەی گۆڕستانەکەی و ڤینی هاوسەردەمانی و هەستەکانی دەرونە جۆش خواردووەکەی لە قوڵاییەکانی ناخیدا ترس و دڵەڕاوکێیان بەرجەستە دەکرد، ژیانی ئاسودەو پڕ نیعمەتی لەو ماڵەدا کە کلیمنتی حەوتەم بۆی تەرخان کردبوو ڕەت کردەوە، ئاگری شۆڕش هەڵیگرت بەرەو فلۆرەنسا دژ بە ئیمپراتۆریەتی پاپا، نوقمی شۆڕش بوو هەر لە ساڵی ١٥٢٧ وە تا ڕووخانی شۆڕش ساڵی ١٥٣٠. ماوەی یانزە مانگی ڕەبەق شان بە شانی دانیشتوانی فلۆرەنسا و عاشقانی ئازادی و کۆماریی دیموکراسی وەك سەرەك ئەندازیارانی جەنگ ئەرکی پاراستنی شوراکانی شاری گرتە ئەستۆ. کە دواجاریش فلۆرەنسا خۆی دا بە دەستەوە، (ئەنجیلۆ) خۆی ون کرد و خۆی لەبەر چاوان شاردەوە. پاپا بە مەرجێ لێی خۆش بوو کە چەند کارێکی هونەریی بۆ ئەنجام بدا، بەڵام ئەمە تەنها ڕووکەشێ بوو تا بکەوێتەوە بەردەستی پاپا دەنا دەستی لێ هەڵ

نەگرت، بەڵام لە دوا ئەم کارەساتەوە چیتر ناخی ئەنجیلۆ هێندەی تر رووخا، پێدەچێ بە دەستێ خۆی بە نقوم بوون لە ئایندا هەڵواسیبێ و بە دەستێکیش بە توانەوە لە تەنهاییدا و هەڵکورمان بەناو ناخی خۆیدا.

لە ساڵی ١٥٣٤دا پاپا پولسی سێهەم بانگی کرد بۆ ڕۆما تا تابلۆی دیواربەندی (دوا دادگایی، ڕۆژی دوایین)ی بۆ دروست بکات وەك تەواوکەرێك بۆ تابلۆی بنمیچی کڵێسەی سیستینا، ڕووبەری ئەو دیوارە ١٦م × ١٤ م دەبوو کەوتبووە پشت قوربانگەکە لە نوێژگەی کڵێسەی سیستینایە، ئەو دیوارە گەورەو ڕووبەرە پان و پۆڕەی بە نیگارێکی زەبەلاح پڕکردەوە کە لە بابەتەکەیدا سودمەند بووە لە داستانی (دۆزەخ)ی دانتی چونکە وێنەی دۆزەخ و بەهەشتی وەك وەسفەکانی ئەو دروست کردووە، ئەم کارە مەزنە تا ساڵی ١٥٤١ی خایاند. ئەمە لە دوا کارەکانی نیگارکێشانیەتیو، لە مۆزەخانەی لەندەن دوو تابلۆی تەواونەکراوی لێیە. هەروەها لە کڵێسای باولین وێنەیەکی دیواربەندی لەسەر هەردوو پیرۆزمەند پۆڵس و پترۆس بەرجەستە کردووە.

لە ماوەی سی ساڵی دوایینی تەمەنیدا زیاتر خۆی سەرقاڵی تەلارسازی و شیعر کرد (لە دوا تەواوکردنی پرۆژەی گڵکۆی یولیۆسی دووەم) لە دوای ئەوەی ئەو ماوە دوورو درێژە جێی هێشتبوو، هەرچەندە لەو دوادوایەشدا پاپا بۆ ئەو تابلۆ دیواربەندەی بانگ کردەوە کە لە کڵێسای (بولین)ەو پێشتر ئاماژەمان پێدا تابلۆکە فریسکۆیەو لەسەر لە خاچ دانی پیرۆزمەند پترۆسە، کە خەڵکی زانییان سیمای پیرۆزمەندی ئازارچەشتوی بە ڕووخساری خۆی دروست کردووە لەسەر هەمان شێوەی کۆستی پیرۆزمەندی شەهید.

پیریی زۆری بۆ هێنابوو کە سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەمجارە گڵکۆی یولیوس هەر تەواو بکات ئەو چل پەیکەرەی لە ئەندێشەی زویدا بوو بۆ ئەم کارە دەستبەرداری بوو بۆ کۆمەڵێ پەیکەر کە لە نێوەندیاندا پەیکەری زەبەلاحی موسا ڕاوەستاوە، نمایشی سەرکەوتن دەکات بەسەر لاوازیی هونەری پەیکەرسازی دوای گریك، بەڵکو بە سەرکەوتنێ دادەنرێ بەسەر ئەو پەیکەرسازە یۆنانییە کۆنانەشدا کە خولگەی هونەرەکەیان تەنها کردبووە بەرجەستەکردنی جوانی جەستە. ئەمە لە ساتێکدا مایکل ئەنجیلۆ ئەم خولگەیەی تێپەڕاند تا پەیکەرسازی بکاتە داستانێك بۆ گوزارشت کردن لە قوڵایی گەردون و بیرۆکەی هەتاهەتایی.

(چاوەکانم شتە فانیەکان نابینێ.. گەر ڕۆحم هاوشێوەی یەزدان نە ئەفرایە قەناعەتم بەو جوانیە دەرەکیانە دەکرد کە چاو دەفریوێنن، بەڵام ئەم جوانیە بۆشە، کەوابێ ڕۆحم چیتر بەرەو جوانیەکی گەردوونی ئاراستە دەگرێت).

(ئاگرێ گەرمی لەگڕ جودا بێتەوە، هەروا‌ش جوانی لە هەتاهەتایی بوون جوێ نابێتەوە) بەم دەستەواژانە دیالۆگی لەگەڵ بەردا دەکرد هەر بەم رۆحەش کەرەسەکانی پەیکەرسازی و نیگارکێشانی پێکەوە هەلگرت. لە پێناو ئەم چەمکانەدا بوو دەرونی ئامادەی گۆڕانکاریەکی سۆفیانەی قووڵ بوو: ئەم هونەرمەندە کە لە کێشەی نێوان بت پەرستی و مەسیحیەتدا ژیا، ماوەیەکی پێشوزای کرد لە بێگەردی رۆحانی و دڵ، کە لەسەر کلێسای پیرۆزمەند پەترۆسی ڕاگرت وەك ئەندازیارو سەرپەرشتیارێ ساڵی ١٥٤٧، ئەم ڕاسپاردەیەی وەك ئەرکێکی پیرۆز وەرگرت. لەم ساتانەدا بۆ برازاکەی دەنووسێ و دەڵێ: زۆرێك باوەڕیان وایە کە خودا منی بۆ ئەم جێگەیە هەڵبژاردووە.. لەبەرئەوە ناتوانم بەجێی بێڵم.. من لێرە کە خزمەت دەکەم لە خۆشەویستیمەوەیە بۆ یەزدان، لەژێر گومەزی ئەم نوێژگەیەدا هەموو هیواو ئامانجەکانم دائەنێم.

بەڵام چاوی دوژمنەکانی لێ نەدەگەڕان (کە برامانتی یەکێك بوو لەوانە) لەم جێگەیەدا هەرچەندە ئەم داندەنێ بە بلیمەتێتی برامانتیدا وەك ئەندازیارێك سەرەڕای ئەم ڤینەبەرایەتیە، لە دیزاینی یەکەمی کە ئامادەیکردووە بۆ کلێساکە "ئاشکرا بێژییەك لە گوزارشتدا و ڕوونی و ئازادیەك دەبینێت، کە ئەوەی خۆی لێ هەڵە بکات واتە خۆی لە ڕاستی هەڵە دەکات".

مایکل ئەنجیلۆ لەم ماوەیەی ژیانیدا هەڵۆدایی پاکێتی ڕۆح و ئاسودەیی بوو، بەڵام سوێ و پەژارە خۆیان دەکێشا بەرەو دەروونی. هەمیشە دەیوت "من هاوڕێی تەنهاییم".

ئەو دەمەش کە مارکیزە بسکارا فیتۆریا کولونیای ناسی، ئەو ئافرەتە ئایەتێك بوو لە جوانی ڕێنیسانس و هەموو ئەو تیشکدانەوانەی لە هزر و خەونەکان و هەڵۆدایی ڕۆشنبیریدا بوون، هەموو ڕۆژانێکی یەك شەمموان ژوانیان کلێسەی سان سلفاسترو بوو، ئەو ئافرەتە ناسکترین دەستودیاری دنیا بوو بۆ ئەو.

گەلێ جار ویستی وابوو خۆشەویستیەکەی بخاتە دوتوێی تابلۆیەك یا پەیکەرێکەوە بەڵام ئەو سروە ئاسمانیەی ڕووخساری کەوی نەدەکرا بۆی، بەڵام توانست و بەهرە کۆنەکانی وەك شاعیرێك ڕاچەنیەوە دەستی کردە نووسینی ڕۆمانسیات لە پێناو خۆشەویستیە پتەوەکەیاندا. پیتۆریاش وەك ئەو زام زەدە بوو، ئازارەکانی ناخی بە سوێ بوون، بە شەیدایی خودایی و نزیك بوونەوە لە ڕۆحی ئەم هونەرمەندە بێبەختە دەیویست زامەکانی هەتوان کات. لە سێبەری ئەم خۆشەویستیەدا لە ناوازەترین کارەکانی ئەفرا "ڕۆژی هەستانەوە"، تابلۆکانی کلێسای بۆلین، شاکارەکانی کلێسای پیرۆزمەند پەترۆس. ئەودەمە ئەنجیلۆ لە شەست

سالآن تێپەڕی کردبوو کە ئەو بەرەو پەنجا سالّی دەڕۆیشت، ئەڤینیان لە دەوری ئاین و هونەرو گشت شتێکی خاوەن ڕۆحێکی هەلّکەوتو لە ژیاندا دەخولایەوە.

ئەم دلّە ناسکە نەیتوانی هێند بمێنێتەوە تا بۆ ماوەیەکیش بێت ئارامی ببەخشێ بە ژیانە پڕ زریانەکەی، مەرگ بە پەلە بوو، هەورێك لە زام و سوێ دەوری ژیانی ئەنجیلۆیان دا ساتێ ئەو ڕووخسارە تیشکییەی بینی ژیان تیا دەکوژێتەوە، هاوارێ لە ناخی بەرزبۆوە: چۆن ئەم هەموو هەلّکەوتویی و بالآیی ڕۆحانی و هزرە دەمرێت؟ نەهامەتیەکان بە دوایەکدا دێن، دوای مردنی فیتۆریا هاوڕێ خۆشەویستەکەشی دەمرێت کە یارمەتیدەری بوو، ئۆربینۆ کە لە گلّکۆی یولیوسی دووەمدا کاری لەگەلّ کرد، لە ساتەوەختی مردنیا ئەم هاوارەی بۆ برازاکەی نارد: "دوێنێ ئێوارە ئۆربینۆ مرد.. بەجێی هێشتم دلّشکاو و وون، هەتا وام دەزانی لەگەلّیدا دەمرم لە پێناو خۆشەویستیم بۆی.. پیاوێکی مەزن و بە ئەمەك بوو.. لەو ساتەوەی کۆچی کردووە ئارەزوی ژیان ناکەمو، ئاسودەیی بەجێی هێشتم".

زامەکان ڕۆحیان تواندەوە، ئەم گوزارشتە درامیە گەورانە نیشتەجێی دەرونی بوون کە دواتر هێمنی هونەریان سەراپاگیر کرد لە ڕۆما، هەر لەوێ لە ڕۆما لە دواین سالّەکانی ژیانیدا ئەوەی بەرهەمی هێنا لە بواری تەلارسازیدا ناوی ئەوی وەك ئەندازیارێك بە نەمری گەیاند لە مێژوودا، چونە ژورگەی کتێبخانەی لاورنتیانی دروست کرد لە فلۆرەنساو هەموو ئەو بینایانەشی بوونیات نا کە دەوری گۆڕەپانی پەیکەری (مارکوس اوریلیوس)یان داوە سالّی ١٥٤٥. بەلآم مەزنترین کاری تەلارسازی هەر لە گومەزە مەزنەکەی کلّێسای پیرۆزمەند پەترۆسە لە ڕۆما لە نێوان سالآنی ١٥٤٦-١٥٦٤ دوای خۆشی ئەندازیار (جیاکۆمو دیلابورتا) تەواوی کرد سالّی ١٥٩٠.

لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیدا ئاماژەی وەها دا بە ژیانی خۆی: "هەست بە غەمناکی دەکەم، لەبەرئەوەی دەمرم پێش ئەوەی هەموو شتێ لە پێناو ئاسودەیی دەرونما پێشکەش بکەم، لەبەرئەوەش کە ساتە وەختێ دەمرم سەرەتامە لە وتنی هونەرەکەمدا". مایکل ئەنجیلۆ لە مەزنترینی ئەوانە نەبوو کە فلۆرەنسا بەخشینی، نمایشکاری ڕۆحی ئیتالیای پارێزگەرا نەبوو، بەلّکو لە هەرە بلیمەتە شکۆمەندەکانی دنیایە.. بلیمەتیەك کە تەنها لەگەلّ بەردا نەدوا، بەلّکو دیالۆگی ئەو ڕووی لە شێوازهایەکی گوزارشتی مرۆڤایەتی کرد، ئەم دیالۆگە هونەرێکی خودیی جێهێشت کە درێژکراوەی هیچ قوتابخانەیەك و ڕێخۆشکەری هیچ ڕێبازێکی دوای خۆی نەبوو، بەلّکو هەلّچونی ژیان و بلیمەتێتی خۆی بوو هەر بە تەنها بە ناوی خۆشیەوە دەژی و هەمیشە دوا وتەکەیمان بیردێنێتەوە کە دەلّێ "هونەرو مەرگ هەرگیز پێك ناگەن".

## ڕافائیل سانزیۆ (Raphael Sanzio) ١٤٨٣-١٥٢٠

"بۆ ئەوەی جوانی کیژێك دەربخەین، پێویستە لە چەندین ئافرەتی جوان وردبینەوە. جا لەبەر ئەوەی ئافرەتی جوان کەمن و هەڵبژاردنیشیان کارێکی ئاسان نییە، نیگارکێش ناچار دەبێ پەنا بباتە بەر بیرو ئەندێشەو بە وێنە دەری ببڕێ" ڕافائیل

هونەرمەندی بلیمەت ڕافائیل سانزیۆ کە سێهەم بلیمەتی ڕێنیسانسی زێڕینە، نیگارکێش و ئەندازیاری تەلارسازی بوو، لە هەمان ئەو ڕۆژەی تیا لە دایك بوو دوای سی و حەوت ساڵ مرد، تەمەنێکی کورت و بەخششێکی درێژ، هێند شەیدای دروست کردنی کەسایەتی مریەم بوو بە نیگارکێشی مریەم ناوی دەرکرد لەو وتەیەی سەرەوەیدا هەمان بیروباوەڕوو بینگەی هونەریی داڤنشی و ئەنجیلۆمان بۆ دوپات دەکاتەوە، کە باوەڕ بوونە بە جوانی نمونەیی ئەویش خۆی لە خۆیدا پەل کێشی هزری کەماڵ مان دەکات، کە دیدنیگایەکی (کۆتای)یانەی لەخۆ گرتووە، کۆتایی و جێگیریی.

ڕافائیل دواهەمین هونەرمەندێکە کە پابەندی دەقاودەقی خواستی کلاسیکی بوو، بیروباوەڕوو بینگەشی هەر لە پابەندبوونی بەو خواستەوە سەرچاوە دەگرێ.

ئەم کەڵە پیاوە لە ئۆربینۆ لەو شارۆچکەیەی باوکی "جیوڤانی دی سانتی" نیگارکێش بوو. ساتێ باوکی مرد ڕافائیل تەمەنی یانزە ساڵان بوو، دایکیشی چوار ساڵ پێش ئەو مێژووە کۆچی دوایی کردبوو. خاڵی پەروەردەکردنی ئەم کوڕەی لەخۆ گرت و ناردیە ئەتێلەی تیمۆ تیوڤیتی (Temoteo Viti) بۆ فێربوونی نیگارکێشان، هەر لەوێ تابلۆی (بینگەی سوارێك)[٢٣] ی کێشا، ئەودەمە تەمەنی شانزە ساڵان دەبوو، لەم تابلۆیەدا شێوازێکی تایبەت کە دامەزراو بوو لەسەر پلەهایەکی ڕەنگی گەرم و لەسەر بابەتهایەکی هێمن و دیمەنی بەرفراوان، ئەم شارۆچکەیە بچووك بوو لەو هەرێمانەدا، بۆی نووسرابوو دوورە دەست بژی لە تەوژمە هونەرییەکان، گەر فریدریك دی مۆنتفیلتر سەنتەرێکی ڕۆشنبیری گەورەی تیا نەکردایەتەوە. ئەم شارە دوو لە گەورەترین هونەرمەندانی جیهانی بەخشیوە کە ئەوانیش: (برامانتی و ڕافائیل)ن.

ساتەوەختێ بەهرەی پەرەیسەندو زیاتر باڵا بوو، چوو بۆ پیرۆجیاو بووە قوتابیەك لە ئەتێلەکەی نیگارکێش (بیروجینۆ)دا لە میانی ساڵانی ١٥٠٠ بۆ ١٥٠٤. لەوێ هەرچی زیاتر ناوناوبانگی دەرکرد بەرەنجامی سودوەرگرتنی لە ئاسەوارەکانی تەختی ئۆربینۆو کاریگەریی مامۆستاکەی لەسەری بە تایبەت لە لایەنی شێوازی کارکردنیەوە ئەمەش بە ڕوونی بە تابلۆی

"مێردکردنی پاکیزە"دا دەردەکەوێت کە لە ساڵی ١٥٠٤دا کێشاویەتی. لەو ساڵەوە ڕوو لە فلۆڕەنسا بەڕێکەوت بە نامەیەکی تایبەتەوە بۆ ناسینی گەورەپیاوانی ئەوێ.

لەوێ ئەو کێشەیەی بینیو پیێ ئاشنا بوو کە لە نێوان داڤنشی و ئەنجیلۆدایە، باس و خواسی خەڵکی ئەوکاتەی شار لەسەر کارەکانی ئەو دوو بلیمەتە بوو، داڤنشی بە دەستێ خەریکی مۆنالیزاو بە دەستێ خەریکی بابەتی "شەڕی ئینجاری" بوو، هەرچی مایکل ئەنجیلۆشە لە پەیکەری زەبەلاحی داود ببۆوەو ڕۆحی پێشبڕکێ بۆ هەواری سەربازە ڕووتەکانی هەڵگرتبوو بۆ هەمان پرۆژە، ڕافائیل ئەوددمە ئەو دوو فیلەتەنەی هونەری بینی، ئەو دوو توانا لەبن نەهاتوەی بینی، هەر زوو بە زوو زانی ئەو ناتوانێ خۆ بدا لە سنوری بەرامبەرایەتی ئەو دوو کەڵەپیاوە. ئەو نە دەرەقەتی هێزو توانای شێوازی ئەنجیلۆ دەهات نە ناسکی شێوازی داڤنشی.

بۆ سەلماندنی خۆی سەلماندنێك کە وەك هونەرمەندێکی مەزن دیدنیگای ئیستاتیکی خۆی بۆ زیاد لە سێ سەدە بەسەر ئەورووپادا بسەپێنێ، کەوتە کارکردن و خۆڕاهێنان تا ئاستی سەرقاڵیەکی بێوێنە لەم کایەیەدا سەرگەرمی سودمەند بوون بوو لە کاری هونەرمەندە هاوچەرخەکانی خۆی ئەوانەی هەڵبەتە پێیان سەرسام بوو، ئەمە بێ لە فەرامۆش کردنی بەهرەی بیژۆکی ڕابوردوی وەك بارتۆلیمیۆ و FraBartolommeo، لیۆناردۆ، ئەو گەرانەی ئەو ئاماژەی پێداوە لە وتەکەی خۆیدا بۆ جوانییەکی نمونەیی کیژێك دەق لەو جوانیە دەکات کە داڤنشی عەودالی بوو بۆ بەدیهێنانی ئەسپێکی نمونەیی لە کۆکراوەی جوانیەکانی گشت ئەسپەکان لە ئەندێشەیەکی زیرەکانەدا، لە جوانی هەموو ئەسپەکان. ئەمەیە کاریگەریی داڤنشی و هەر ئەمەشە کاریگەریی خواستی کلاسیکی.

لەدوا ئەم قۆناغەو گەلاڵەبوونی هەرچی زیاتری تواناو پسپۆڕی و بەهرەمەندیەکانی، داواکاریەکان بەسەریا دابارین لە گشت لایەکەوە، تا وای لێهات لە زۆری ئەرك و ڕاسپاردەو کارەکانیدا ناچار پەنا بەرێتە بەر قوتابیەکانی، لەم دەمەدا بوو تابلۆیەکی مریەمی بە شێوازێك دروست کرد کە بووە مایەی سەرسامی و بزوانی هەموو هونەرمەندانی هاویارانی.

ئەم شێوازە بە سانایی ڕووحی شێوازێ لە پشتیەوە دەژیاو بۆ چاوێکی هەستیار ئاماژەکانی دەنارد، کە ئەویش شێوازی قەشە بارثلمیو بوو وەك بنەواشەیەکی پان و پۆڕ بەڵام بە تێکەڵ کردن و لێکدان بە جوانترین و باشترین لەو شێوازە هاوسەردەمانەی بەرهەڤ بوون. ئەوە ڕافائیل بوو کە توانی لەم لێکدان و تێکەڵ کردنە شێوازێکی تایبەتی جیا بئەفرێنێ.

گەر سەرنجمان ئاراستەی (بالآبوونی پاکیزە) و (مریەم لەسەر عەرشی پیرۆزمەندان) بکەین کە لە تابلۆکانی سەرەتایینی بەزویی هەست بە بەجێهێشتنی کاریگەریەکانی شێوازی ئوستادەکەی دەکەین، نەك هێندەو بەس بەڵکو ناسکی و نیانیەکی ڕوون و ڕەنگهایەکی ئاشکرابێژ هاودەمی فۆرمن، ئەمەش ئەو سیمایانە بوو لە کاری پیرۆجینۆی ئوستادیا نائامادەگی هەبوو کە نمونەیەك بوون بۆ پتەوی و هاوئاهەنگی لە دابەشکردنی سێبەرو ڕووناکیدا.

لە نمونەی هونەرمەندانی هاوسەردەمی تابلۆی (مریەمی گوڵ)ە کە بە سانایی هەست بە کاریگەریی تابلۆی "مریەمی بەردەکان"ی داڤنشی دەکەین تیایدا کە سالآنی (١٥٠٥-١٥٠٦) ئەنجامی داوە. بەڵام کاریگەریی ئەنجیلۆ لەسەری لەپاش چونیدا بۆ ڕۆما بەدەرکەوت.

پێش ئەوەی بگەینە چونی ئەو بۆ ڕۆماو بەربەرەکانیەتی ئەنجیلۆ دەبێت ئەوە بڵێین کە ماوەی پێش ئەوە گەڕایەوە بۆ ئۆربینۆ بۆ دروستکردنی وێنەی باڵدەساری سەفیری بەریتانیا، دواتر بۆ جارێکی تر سەفەری فلۆڕەنسای کردەوەو تابلۆی "کچە باخەوانە جوانەکە"ی دروست کرد کە بەکارهێنانی ڕەنگی شینی تیا گەیاندە بێهاوتاییەکی کەم وێنە، کۆمپۆزشنی کەسایەتیەکان هەڕەمیە، ئەمێستا هەردوو تابلۆکە لە لۆڤەردان. ڕافائیل پیاوێکی قۆزو جوان بوو، نیگاری خۆی دروست کردووە بەدەستی خۆی و چەندان گەنجی سەرسام بەو لاساییان کردۆتەوە، خاوەن بەخت بووە لە کارکردنداو زیرەك و بەهێز بووە سەرباری سادەیی و خۆش خوانی و زمانێکی شیرین.

ڕاستە ڕافائیل بەشی زۆری لاوێتی لە فلۆڕەنسادا بەسەر بردو بە هۆی داهێنانەکانیەوە زۆر شتی نوێی خستە سەر کەلەپوری هونەریی ئەو شارە، بەڵام بەشی زۆری کارەکانی لە ڕۆمادا جێبەجێ کردووە. سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا لە جەخت کردنەوەیدا "لە نیگارەکانیدا" بۆ یەکەیەکی نێوان چەمکە فەلسەفیە ئەفلاتونیەکان و سەرەتاگەکانی ئاینی مەسیحی، دواتریش لە نێوان دەسەڵاتی ڕۆحانی و دەسەڵاتی زەمەنی و نزیك کردنەوەی بیرۆکەی زانست لە سروشتی هونەر.

خاڵی یەکەمی سەرکەوتنەکانی ڕافائیل هەمان ئەو خولیایە بوو کە مایکل ئەنجیلۆ ساتەوەختی خوێندنی لە باخچەکەی لۆرینزۆدا هەیبوو، هەرچی خاڵی دووەمیشە لەو وتەیەی داڤنشیدا ئاوێزانی یەکتر دەبن کە دەڵێ: پەیوەندییەکی لە پچڕان نەهاتوو هونەرو زانست بە یەکترەوە دەبەستێتەوە.

ئەمێستاش کاتی ئەوەیە باس لە چونی رافائیل بکەین بۆ ڕۆما و لە نزیکەوە ناسینی مایکل ئەنجیلۆ و کەوتنە ژێرکاریگەرییەوە، بێجگە لە کاریگەری ئەو ئاسەوارە کۆنە هێلینی و ڕۆمانیەی ڕاستەوخۆ لە ڕۆمادا یەکانگیر بوو لەگەڵیاندا. رافائیل لەسەر بانگهێشتی پاپا یولیوسی دوهەم گەیشتە ڕۆمای پایتەخت ساڵی ١٥٠٨ تا هاوبەشی بکات لە ڕازاندنەوەی هۆڵەکانی کۆشکی ڤاتیکان، هەر ئەودەمەش براماانتی سەرپەرشتیاریی چاکسازیکردنی لە کڵێسای پیرۆزمەند پەترۆس دەکرد، هەڵبەتە هەر ئەوکاتەش بوو مایکل ئەنجیلۆ دەستی کرد بە نیگارکێشانی بنمیچی سستینا، رافائیل لە سودمەند بوونیدا لەم پرۆژەیەی قەرزارباری برامانتییە، چون ئەو بە پاپای وت تا رافائیل بۆ ئەنجام دانی پرۆژەیەکی وا بانگهێشت بکات. پاپا یولیوس باڵێکی تایبەتی خۆی دایە لە بینای ڤاتیکاندا تا نیگاری تیا بکێشێ، کە ئەمرۆ پێی دەوترێت ژورەکانی رافائیلۆ. ژوری یەکەم بە ژوری ئیمزاکردن بەناوبانگە Chambre de la Signature هەر لە ساڵی ١٥٠٩ کاری تیا کرد تا ساڵی ١٥١١، گونجاندنێکی دیار هەیە دابەشکردنی بابەتەکە. لە ڕەهەندەکانی وێنەکەدا.

ژووری دوهەم کە بە ژوری هیلیودور Heliedore دەناسرێت، لە گرنگترین ڕووداوەکانی مێژووی پاپەویەت لەخۆ دەگرێ.

ژوری سێهەم تابلۆی گڕتێبەربوونی شارەکەی تیایە، ئەم تابلۆیە توێژینەوە گشتییەکەی رافائیل خۆی کردویەتی و بەپێی نەخشەیەکی دانراویش (لەلایەن خۆیەوە) هەردوو قوتابیەکەی ڕۆمان J.Romain و فراپینی Fra. Penni جێبەجێیان کردووە، هەرچۆن پێکڤە ڕازاندنەوەی ژوری قوستەنتین یان جێبەجێ کرد. رافائیل زۆربەی بابەتی تابلۆکانی بۆ ئەم ژورانە لە شارستانیەتی گریکی و ڕۆمانییەوە وەردەگرت.

تابلۆی "قوتابخانەی ئەسینا" بە بەناوبانگترینی ئەو تابلۆیانەو لە هەرچی زیاتریان ئاماژە بەخشی خواستی کلاسیکییە کە تایبەتمەندێتی دیاری تەرزی ئەو سەردەمە بوو.

رافائیل وەختێ لەم کارانەدا بەردەوام بوو بێئەوەی پێ بزانێ لە شێوازێکی تایبەتی خۆیدا کاری دەکرد، دوای ئەوەی گشت کاریگەرییەکانی لەناوخۆیدا توانەوە، ئەم تابلۆیانە نمونەی سەردەمی ڕێنیسانس بوون: هەر لە فەلسەفە، جوانی، شیعر، داد- ئەمەش لە خەونەکانی پاپا یولیوسی دووەم بوو.

تابلۆی "قوتابخانەی ئەسینا" پێگەیەك بوو تیا لوتکەی فەیلەسوفەکانی یۆنان و ئەدیبەکانی تیا بەرجەستەیە. کۆمەڵێ فەیلەسوفی وەك سوکرات و فیساگۆرس و ئەرخەمیدس.. هتد دەبینین، دەوری ئەفلاتون و ئەرستۆیان داوە لە بارێکی وەهادا کە

سروشتی هەرکامێکیان جیادەکاتــەوە. ئـەفلاتون ئاماژە بـۆ سـەرەوە دەکات وەك گوزارشـتی بـۆ ئایدیالیەتی بالاّ، بەلاّم ئەرستۆی قوتابی بەرەو خوارەوە ئاماژە دەکات وەك گەیشتنی ڕێساکانی ماموّستاکەی مەبەسـتیەتی بـە مـرۆڤ. بـەکارهێنانی بەرینییـەکی زۆر لـەم کارەدا نیشـانەیەك نـیـە بـۆ بێکۆتـایی وەك لـەلای پـیرجینۆ، بــەڵکو بــۆ بــەجێهێنانی ئەرکێکــە پەیوەســت بــە دابەشکردنی کەسەکان و پێداویستی کۆمپۆزشنی وەستاو لەسەر ئاشکرابێژێکی تەلارسازیی.

ئاشکرا دیارە رافائیل پێش ئـەوەی لـەم کارەدا دەسـت بـەکار بێـت بنمیچی سستینی دیوە، دیزاینی کارەکە تابلۆی دوا شێوی داڤنشی‌مان بیردێنێتەوە، بەلاّم هەمیشە رافائیل بەوە ناسراوە توانای توانەوەی توخمهای شێوازی هونەرمەندانی سەردەمی خـۆی هـەبووە لـە بۆتـەی شـێوازی تایبەتی خۆیدا.

باشترین نمونە بۆ ئەم بەرەنجامە تابلۆی (سـەرکەوتنی جالیتـا)یـە کـە لەسـەر دیـواری ڤیـلا ڤارنیزینا لە ڕۆما ساڵی ١٥١٣ دروستی کردووە، ئەم بابەتە ئەفسـانەییە بابـەتی لـە دایـك بوونـی ڤینۆسمان بیردەخاتەوەو جێبەجێکردنەکەشی هەردوو بلیمەت داڤنشـی و مـایکل ئـەنجیلۆ مـان دێنێتەوە یاد.

ئـەو پێگەیـەی ئـەم هونەرمـەندە پـەیدای کـرد لـەلای جیولیوسـی دووەم مـایکل ئـەنجیلۆش نەیتوانی شان لە شانی بدا، هەر بۆیە لە لایەن مایکل ئـەنجیلۆوە ئـیرەیی پـێ دەبـرا. دواتریـش کە پاپا جیولیوسی دووەم کۆچی دوایی کرد و لیۆی دەهەم هاتە جێگەی گرنگی‌دان بـە رافـائیل زیاتر بوو کەمتر نەبوو، بگرە ئەم پاپا تازەیە زۆر زیاتر سەرسامی بلیمەتێتی ئەم هونەرمەندە ببوو. بۆ زیاتر بەراوردکردنی کاری ئەم بە مایکل ئەنجیلۆ داوای لێکرد دیزاینی فەرشێکیان بـۆ بکات بۆ نویژگەی کلێسای سستین کە بە یـەکێك لـە کـارە نایابـەکانی ئـەم هونەرمـەندە نـاوزەد دەکرێت. لە بەرامبەر ئەو بە گەورە زانین و نوازشەی پاپا لیۆ بـۆ رافـائیلی دادەنـا، رافـائیل لـە یەکێ لە تابلۆکانیدا وەك پاڵەوانێکی مەزن بەرجەستەی کردووە. لەم کارانە بترازێ ژمارەیەکی زۆر تـابلۆی ئـەنجام داوە کــە دەربـاری مریــەم و منالّەکـەی و منــاڵێتی یوحەننایــە لــە کــاتی مانەوەیدا لە فلۆرەنساو ڕۆما، بەو دیزاینە هەرەمی‌یەی بەکاری دەهێنا لـە جوانـترین تابلۆکـانی بۆ ئەم بابەتە دروست کرد کە دابەش بـووە بەسـەر مۆزەخانـەکانی جیـهاندا، "مریـەم و ماسـی زێڕیـن" ١٥٠٥-١٥٠٦ و "مریـەم لـە مـێرگدا" ١٥٠٥ مۆزەخانــەی ڤینــا، "مریــەمی گرانــدوّك ١٥٠٥ کۆشکی بیتی لە فلۆرەنسا"، "مریەمی ئەلبا" ١٥٠٨ مۆزەی ئـەهلی واشـنتۆن، "مریـەم و ماسـی" مۆزەی پرادۆ مەدرید، "مریەمی چەتر" ١٥١٦ مۆزەی میونـخ، بـەلاّم جوانـترینی ئـەم دەسـتەیە "مریەمی کورسی" کە لە ڕۆما دروستی کردووە ساڵی ١٥١٦ هەندێ دەڵێـن سروشـی ئـەم تابلۆیـە

لە ڕێکەوتێکی هونەرمەندەوە دێت کـە دایکێکـی بینیـوە گـەنج لـە بـەردەمی ماڵەکـەی خۆیـداو منداڵەکەی لەباوەش گرتووە، ئەمیش یەکسەر قەڵەمەکەی دەردەهێنێ و هەر لـەویا هـەمان کـات نیگاری دەکێشێ کە پڕیەتی لە جوانیـەکی دایکایـەتی سروشـتی. ئەمـە جگـە لـە مریـەمی گـوڵ ١٥٠٥-١٥٠٦ مۆزەی ئۆفیتزی فلۆرەنسا.

لە سەرو هەموو کارێك و ناوبانگێکی لە ڕۆما رافائیل بە دروست کردنـی وێنـەی کەسـایەتی ناوی دەرکرد، لە هەموو لایەکەوە داواکاری بۆ دەهات بە تایبەت لە کەسایەتیە دیارەکانەوە، لـە دیـارترینی ئـەم تابلۆیانـە (خـانمی سـەرپۆش بەسـەر)ە خەنـدەکـەی سـەر لێـوی بـیری بـزەی سەرلێوی مۆنالیزیامان دەخاتەوە.

لەو کەسایەتیانەش کە پۆرترێتی بۆ کردون، پاپا (جیولیوسـی دووەم) ١٥١١، ١٥١٢، پاپـا لیـۆی دەهەم لەگەڵ کوڕەکانی براکەی کاردینال جیلیو ولیومی ساڵی ١٥١٨.

سەرباری بابەتە مێژووییەکانی کە لەسەردەمی لێوی دەهەمدا زیاتر هۆگری بوو، داهێنـانی لە چەند تابلۆیـەکی تایبـەتی کەسـایەتی‌دا کـرد لەوانـە نیگـاری خۆشەویسـتەکانی بـوو، مێـژوو چیرۆکی خۆشەویستی ئەم هونەرمەندەمان بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ مـارگرێتی کچی نانەواکـەدا، کە تا مـرد بـۆی دڵسۆزو بەئەمـەك بـوو، هـەرچۆن چیرۆکی پـەژموردەی نیشانەکردنی (ماریـا بیبینا)مان بۆ باس دەکات کە ئەم ئافرەتە پێش مێرد پێکردنی دەمرێـت، لـە تابلۆیـەکی دا بـە ناونیشانی (پاکیزە) ئەم ڕووخسارەی بەرجەستە کردووە، تابلۆکە لە مۆزەی پولونیایە.

بلیمەتێتی ئەم پیاوە هەر بە نیگارکێشانەوە نەوەستا، بەڵکو کرا بـە گـەورەی ئـەندازیارانی کڵێسای پیرۆزمەند پەترۆس و سەرپەرشتیاری ئاسـەوارەکانی نـاو شـارو کۆشـکەکانی، هـەر ئـەم کاتە بوو تابلۆی (مریەم لە نێوان پاپا سکستیوسی دووەم و پیرۆزمەند باربارە) مۆزەی درسدن. چـون هــەرگیز ســەرقاڵی بــە تەلارســازیەوە وای نــەکرد لــە نیگارکێشــان بــەدوور بێــت. زۆر گۆڕانکاری لە بیناکانی ڕۆمادا ئەنجام دا، ئەمە بێ لە دیزاین کێشانی بۆ کۆشکی بـاندولفینی لـە فلۆرەنسا.

دوا کاری کەکردی تابلۆی "هەڵکشان Transfiguration"ە کە لە ڤاتیکانە، خۆی فریانەکـەوت تابلۆکـە تـەواو بکـات بـەڵکو لـە دواجـاردا قوتابیـەکانی تـەواویان کـرد، نمونــەی لوتکــەی گەڕانەکانیەتی لە کۆمپۆزشـنی بابـەت و لـە بەربینـەو ڕوونـاکی، پوسـان ئـەم کـارە بـە لوتکـەی هونەری نیگارکێشان دەزانێت.

رافائیل لە تەمەنی سی و حەوت ساڵیدا دەمرێت سەرئەنجامی توش بوونی بە پەتایـەك لـە شەشی نیسانی ١٥٢٠دا، واتە ڕێکەوتی هەمان ڕۆژی لەدایك بوونی.

گەر قۆناغەکانی کارکردنی رافائیل بەپێی شێوازی کارکردنی بژمێرین:

**قۆناغی یەکەم:** ئەوکاتەیە کە لە ئەمبریا قوتابی پیروجینۆ بوو، شێوازێکی وردەکاری لە گوزارشت کردن و کۆمپۆزشن دا هەبوو، ڕەنگەکانی ئاوی بوون.

**قۆناغی دووەم:** لە فلۆرەنسا کامڵ بوو، وەختێ ڕێگەکارکردنی سەری هەڵداو پێگەیشت و باڵابوو بۆ ئاستی هونەرمەندە گەورەکان.

**قۆناغی سێهەم:** لە ساڵی ١٥٠٩وە دەست پێدەکات لە ڕۆما، هونەرەکەی پتەو بوو بە تازەگەری و بەپێزی لە هێڵکاری و کۆمپۆزشندا. لە تابلۆکانی ئەم سەردەمەی (خێزانی پیرۆز).

لە دوا تابلۆکانیشی تابلۆی (سەرکەوتن بەرەو ئاسمان)ە کە تیایدا مەسیح لە نێوان موسا و یەشوع دا بە ئاسمانەوەیە. ئەمە دوا تابلۆیەتی کە خۆی تەواوی کردبێت. رافائیل لە دوا خۆی ژمارەیەکی زۆر تابلۆی بەجێهێشت کە بۆ کەسانێك تەمەنێکی هێند کورت بژین ئەستەمە بەرهەم هێنانی.

لەو کەشە پڕ کێشمەکێشم و هەراو زەنایەی ڕۆمادا مرد بە گڕی کارکردنێکی جیدی و نەبڕاوە سوتا، بەڵام ڕۆما زانی چۆن ناوی یەکێك لە بلیمەتەکانی شکۆدار دەکات، جەستەی خستە نێو پانتیۆنی نەمرەکانەوە. لە گەنجێتیەکەیدا نمونەی ڕۆحێکی ئارامگرتووی بە خولیابوو بۆ هەڵکشان، لە هونەرەکەشیدا هەوڵی نەوەیەکی لەخۆ گرتبوو کە لە پێناو ئەزموونەکانی شارەزایی و خستنە سەرێك بۆ زمانی هونەر لە بەرەنجامی بەروبومی ئەزموونەکانی لە گەڕاندا بە دوای پانتایی و پێکهاتن و تونێکاری و بەربینەدا.. رافائیل شتێ نەبوو بەرهەمی ئەم نەوەیە نەبێت و منالێکی پیرۆزی هەڵبژێرراو کە ئەفسوونی هونەری نیگارکێشان دەنوێنێت. هەر ئەم ئەفسوونە بوو وای کرد لەسەر گۆڕەکەی بنووسن:

"سروشت دەترسا رافائیل بەسەریا زاڵ بێت تا زیندووە، ساتێکیش کۆچی دوایی کرد، ترسا لە پاش ئەو ئەمیش بمرێت".

## هونەرمەندە نیگارکێشەکانی پاش رافائیل

لەو نیگارکێشە فلۆرەنسیانەی وەك پاشکۆی رافائیل مانەوە لە ڕۆمادا هونەرمەند "جولیۆرۆمانۆ"یە Julio Romano (١٤٩٩-١٥٤٦) کە وەك سەرۆکی یاریدەدەرانی رافائیل کاری لەگەڵدا دەکردو زۆرجار ئەو کارانەی تەواو دەکرد کە مامۆستاکەی دەستی پێکردبوون. رۆمانۆ لە شاری مانتوا ساڵی ١٥١٤ جێگیر بوو، زۆر کاری دیواربەندی لە تەلارو بیناکانی ئەو شارەدا ئەنجام داوە.

لە رۆمانۆ بترازێ هونەرمەند و قەشە "فرابار تلمیو FraBartolomio" (١٤٧٥-١٥١٧) بەشداریەکی دیاری هەیە لە پەرەسەندنی هونەری نیگارکێشاندا، ئەم هونەرمەندە هاوسەردەمی (جیرلاندیو) و (بۆتشیللی) بووەو هەروەك هاوکاتی قەشە (سافۆنارولا) بووەو کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕەکانیەوە. ئەو نیگارانەی خۆی سوتاندووە کە دەربارەی بابەتە گریکییەکان بووە، ماوەیەکی باش لە دێرەکاندا گۆشەگیر بووە. نازناوی بە (بارتلمیۆ)ی برا دەرچووە. ئەو دەمەی سافۆنارولا سوتێنراو لەناوچوو، جارێکی تر گەڕایەوە سەر نیگارکێشان بەڵام زیاتر بابەتە ئاینییەکانی بەرجەستە دەکرد. تابلۆکانی بە گرنگی دان بە قوڵایی و پشتینەیەکی تەخت کە دەوری کەسەکانی داوە دەناسرێتەوە، شێوزای بە ڕوونی لە تابلۆی "شوکردنی پیرۆزمەند کاترین"دا دەردەکەوێت کە ساڵی ١٥١٢ دروستی کردووە.

کاریگەریی شێوازی لیۆناردۆ و مایکل ئەنجیلۆو رافائیل کەوتە سەر نیگارکێشانی فلۆرەنساو سیمای هونەری ئەم سێ کەڵە هونەرمەندە لە ئاوێنەی هونەرەکەیاندا ڕەنگی دایەوە، لەو هونەرمەندانەش نیگارکێش ئاندریا دێل سارتۆ (١٤٨٦-١٥٣١) کە تایبەتمەند بوو لە دیواربەندو پۆرترێتی کەسایەتیدا.

## کۆریجیۆ، هونەرمەندێ لە ڕەنگ A. Allegri (Corregio) ١٤٨٩-١٥٣٤

ناوی بنەڕەتی ئەنتۆنیۆ ئەلیگرییە لە شارێکی بچوکی پێدەشتی ئیملی لەدایك بووە، زیاترین ساتی ژیانی لە شاری بادۆڤا بردۆتە سەر، شتێکی کەم دەربارەی مێژووی دەزانرێت، کوریجیۆ نمونەی پەڕینەوەی کاریگەریی بلیمەتانی ڕێنیسانسە لە نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەدا بۆ هەموو لایەکی دەوروبەری ڕۆما. لە شاری بارما پەروەردە بووەو بەوە ناسراوە کاریگەریی هونەرمەندانی سەردەمی خۆی تیا کۆبۆتەوە، لە باشترین هونەرمەندەکانی ئەوکاتە کەم تا زۆر کاریگەریی خۆیان لەم نیگارکێشەدا جێهێشت بە شێوازی کارکردن و تابلۆکانیدا پێوەی دیارە شارەزای شێوازی (لیۆناردۆ) بووەو سەردانی (رافائیل)ی کردووە ساڵی ١٥٢٠. هەر ئەو ساتەوەختە مایکل ئەنجیلۆ کاری تێکردووەو چاوی بە کارەکانی ڕۆمای کەوتووە.

ئەمەش لەوکارانەدا کە دوای ئەو مێژووە بەرجەستەی کردون شتێکە ڕوون و ئاشکرا وەك تابلۆکانی (هەڵکشان بەرەو ئاسمان) و تابلۆی (مریەم و پیرۆزمەند جیرۆم) کە ساڵی ١٥٢٧ نیگاری کێشاون.

لە گەنجێتیدا ئەم هونەرمەندە کاری بۆ کڵێساکانی هەندێ وڵاتی دەوروبەرکرد، لەوانەش بارما کە وەك شانۆیەکی شکۆمەندی ئەو وایە، هەرچەندە بەشی هەرە گەورە لە هونەری

کۆریجیۆ بۆ کلێسا تەرخان بوو، بەڵام کۆمەڵێ تابلۆی میسیۆلۆجی بەرهەم هێنا لە دیارترینیان (رابواردنەکانی جۆبیتر) و (فێرکردنی کیوبید)ە.

کۆریجیۆ توێژینەوەی هونەری لەبەردەستی مەزنترین ئوستادەکانی هەرێمی خۆیدا کردووە، زووبەزوو سەرسامی کارەکانی (مانتێنا) بووە، زیاتری ئەم کاریگەریەش لە میانی توێکاری و بینای بەربینەیەکی ئەندازەیدا بوو. ئەمەش یەکەیەکی پێبەخشی لە کۆمپۆزشنەکانیدا، بەڵام پێگەیشتن و کامڵ بوونی شێوازی کۆریجیۆ سەرئەنجامی سەرسامی بوو بە کارەکانی لیۆناردۆ و توێژینەوەکانی لە بواری سێبەرو رووناکیدا.

قۆناغەکانی پیا تێپەڕبوونی کۆریجیۆ شتێك لە قۆناغەکانی ژیانی رافائیل دەچێت. زیاترین سیمایەك بۆ کاری کۆریجیۆ گوزارشتی پشت بەستووە بە رەنگ و رووناکی لە سیماکارەکانی مایکل ئەنجیلۆ کە لە بنمیچی سستینا ئەنجامی دابوو، هەڵبەتە ئەم ناتوانێ وەك ئەو هەڵکشێ بۆ گوزارشت کردن لە درامای ناوەکی مرۆڤ. هەرچۆن نەیتوانی بەو گونجاندنە شێوەکاریەدا بگات کە رافائیل پێی گەیشتبوو بۆ گوزارشت کردن بەم گونجاندنە لە باڵاییەکی ئیستاتیکی.

هەستیاری هونەرەکەی و توانستەکانی لە بواری رەنگدا جێی ستایشی هاوسەردەمانی بووە، هەستاوە بە رازاندنەوەی گومەزی کلێسای سان پۆل لە بارما، دواتر رازاندنەوەی کلێسەی (سان چان)ی لە ئەستۆ گرتووە ئەوەدەمەی تواناو شێوازی کارکردنی روو لە کامڵ بوون بوو. ئەم کارە ئاینیانەی هێندەی گوزارشت بوون لە ناسکی و شۆخ و شەنگییەکی هەستی، هێند دەرخستنی رەهەندە ئاینیەکانی مەبەست نەبوو.

سەرباری هەموو ئەمانەو گشت گیری کارەکانی بەڵام تابلۆی (رابوردنەکانی جۆبیتر)ی هەر بە نایابترین کارەکانی دەدرێتە قەڵەم، کە خاوەن رەمەکییەکی گوزارشت کردن و رۆچونە لەگەڵ بابەتەکەو لە هەمان کاتدا تۆمارکردنی لایەنێکی ئەفسونی ژیانی رێنیسانسە. کۆتایی لێدوان دەرباری ئەم هونەرمەندە بەو وتەیەی ڤازاری بێنین کە دەڵێ: کۆریجیۆ هەژار بوو، فورسایی خێزانێکی گەورە لەسەر شانی ئەو بوو. مردنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بڕێکی زۆر لە پارەی مس هەڵدەگرێت بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەژێر خۆرێکی توندوتیژدا، بەمەش توشی پەتا بوو مرد.

## قوتابخانەی ڤینیسیا

لە سەرەتاکانی سەدەی شانزەدا لە شاری ڤینیسیا قوتابخانەیەك دروست بوو لە میانی نیگارکێشاندا خاوەن رۆڵێکی تایبەت لە بردنە پێشەوەی هونەری نیگارکێشانی ئیتالی، ساتێ

جیاوازیەکی دیارو ئاشکرا لە نێوان هونەری سەرەتای ڕێنیسانس و زێڕین لە فلۆرەنساو ڕۆما هەیە، هەرگیز هەمان جیاوازیمان بەسەر هونەری شاری ڤینیسیادا بۆ پیادە نابێت.

ڤینیسیا لە میانی ئەم سەدەیەدا بێهاوتایە بە چەندان سیمای تایبەت کە وای کردووە هونەرە شێوەکاریەکەی خاوەن فەلسەفەو ڕێچکەی جیاوازی خۆی بێت لە چاو هونەرەکانی ئیتالی ئەم سەدەیەدا.

بارو گوزەرانی تایبەتی ئەم شارە بووە مایەی هاتنە ناوەوەی ئەم ڕێچکە تایبەتە، چون هەر ئەم شارە بوو ببووە هێمای زیندوێتی بۆ گێڕانەوەی ئازادی و سەرکەوتن لەم سەدەیەدا بۆ سەراپای ئیتالیا، نووسەران بە گەوهەرو هێمای شکۆمەندی ئیتالیای ناوزەد دەکەن، تەنها ئەم شارە بوو دەستبەرداری ئازادی نەبوو و سەری بۆ هیچ ڕێسایەك نەنەواند تەنها یەزدان و ڕێساکانی نەبێت.

لەم کەشەدا و لە پێگەیەکی وەهادا، بلیمەتی ڤینیسی پێ دزکیی کردوو ڕووەو تولەڕێی نیگارکێشان بەڕێ کەوت تا خۆی لە شارێی ئەم هونەرەدا دیەوە بە گیانێکی پڕ گەشبینی پشت بەستوو بە باوەڕێکی سواو بە کلێساو ئامێزێکی گەرم بە دەسەڵاتی ڕامیاریی هەنگاوی دەنا.

جگە لەم گیانە (کە بۆ ئەو ڕۆژە ناوازەو تاقانە بوو لە نێوان هەموو شارەکانی ئیتالیادا گیانێکی وەها هەڵبژێرێت) ڤینیسیا زۆر نزیك بوو لە ڕێبازە شێوەکاریەکانی میللەتانی جێرمانی و زەویە نزمەکانەوە، ئەمەش بۆ خۆی کاریگەریی خۆی کردو بەجێهێشت لەسەر ڕەوتی هونەری ئەم شارە، ڕاستە ڤینیسیا بێبەش نەبوو لە کاریگەریی ڕێسا فلۆرەنسیەکان لە هونەردا بەڵام هاوکات سەرگەرمی دارشتنی ڕێسا شێوەکاریەکانی خۆی بوو ڕووەو ڕیساکانی بروج.

گەر فلۆرەنسا (وەك ڕاستیەکی گرنگ) ژوانی نێوان ڕێبازە شێوەکاریە ئیستاتیکییەکان و گیانێکی زانستی بووبێت ئەوا ئەو دەمە ڤینیسیا سەرقاڵی ئەزموونە فۆرمیەکان بوو. سیمای سەرەکی و جیاکەرەوەی ئەم ئەزموونانەش لە یەکێتی دیدنیگادا خۆی دەبینێتەوە بۆ شێوەو ناوەڕۆك و یەکگرتنیان لە ڕاستیەکی بەرجەستەکردندا کە شێوەو ڕەنگ تیا یەکانگیربن. خۆپاراستن لە دژایەتییە توندوتیژەکانی سێبەرو ڕووناکی بەمەبەستی دەرخستنی ڕاستیەکی هەستی ئیستاتیکی پەیت کە لە سیماکانی هونەری ڤینیسییە. ڕەنگ و ساو و گونجاندنی شتەکان لە سیماکانی هونەری ئەم شارە بوون کە دواتر ئاسۆکانی بۆ هونەری مۆدێرنە واڵاکرد، وایکرد نیگارکێشان ببێتە خاوەن زمانێکی جیای خۆی کە تیایدا ڕەنگ وەك توخمێکی زاڵ خۆی نمایش بکات. دوای ئەوەی دەسەڵات بۆ فۆرم بوو لە هونەری فلۆرەنسیدا. کەواتە دەکرێت

بڵێین دیدنیگای فلۆڕەنسا پەیکەریی بوو، دیدنیگای ڤینیسیاش نیگارکیشانی. هێند بەسە بۆ ناسینی جیهانی ڕازاوەی ڤینیسی لە دەروازەی چوار کەڵە هونەرمەندیان بدەین ئەوانیش:

جیۆرجیۆنی و تیسیانۆو تینتۆریتۆو ڤیرۆنێزەن، کە توانییان هونەری نیگارکێشانی ڤینیسی لەدەست سەدەکانی ناوەڕاست قوتاربکەن و بیگەیەننە بینگەیەکی مۆدێرن، هەرچۆن فلۆڕەنسا بۆ رزگار بوون لە ئاسەوارەکانی ئەو سەدەیە پشتی بە داڤنشی بەست و ڕۆماش ڕەهابوونی خۆی لەسەر دەستی هونەرمەندان مایکل ئەنجیلۆ و رافائیل ڕاگەیاند.

## جیۆرجیۆنی (هونەرمەندی بوێر) (Giorgione) ١٤٧٨-١٥١٠

جیۆرجیۆنی هونەرمەندی بابەتە بوێرەکان لە شارۆچکەی کاستل فرانکۆی جوتیاریی پەروەردە بووە، باوکی جوتیار بووە. هەر لە منالیەوە مۆسیقاو نیگارکێشانی خۆشویستووەو مۆسیقاژەنینی لەسەر نای زۆر باش زانیوەو ئەمە سەرباری ئەوەی گۆرانیشی وتووە. ئەم هونەرمەندە سەرەڕای کورتی ژیانی بەڵام ویستویەتی شۆڕشێك لە هونەردا بەرپا بكات لە ڕێی هەڵبژاردنی بابەتە بوێرەکانیەوە، وەك بەرجەستەکردنی ئافرەتی ڕووت لە سروشتداو گرنگی دان بە بەربینەی هەوایی لەجێی بەربینەیەکی فۆرمیانە، لێرەدا ڕەنگ کەرەسەی سەرەکی گوزارشت کردنیەتی وایکردووە تیایدا کە گرنگیەکی وردی کلاسیکی نەداتە کارەکانی.

ئەم هونەرمەندە ساتێ چووەتە ڤینیسیا لەسەر دەستی نیگارکێش "جیوفانی بیللینی" بەهرەمەندی دەرکەوت لەو کارانەدا کە ئوستادەکەی خستیە ئەستۆی. یەکەم کارێك کە ئەنجامیدا لەسەر تابلۆیەکی بچوك بابەتێ بوو پڕ لە ئاڵۆزی، بۆتەیەك بوو بۆ کۆکردنەوەی شاعیریەتی "بیللینی" و ڕیتمە مۆسیقیەکانی ویستی بیخاتە سەر خەرواری تابلۆکەی. خۆشەویستی ئەو بۆ مۆسیقا کاریگەریەکی گەورەی بەجێهێشت لەو ئاوازانەی پێچەوانە بووەوە لە تابلۆکانیدا. تابلۆکانی سەرەتای ژیانی بەکارە ئاینیەکان دەست پێ کرد کە تیایدا جارێ لەژێر کاریگەری بیللینیدا بوو.

ئاوازێکی ڕەنگی و ئاشکراییەکی بینگە لە کارەکانیدا لە سیما دیارەکانی ئەو بوو، ئەو هەرچەندە کەم ژیاو مردنیشی سەراسیمەی ئاڵۆزیی بوو وەك ژیانی، کارەکانیشی جێی مشت و مڕوو ناکۆکی بوو بە درێژایی چەندان سەدە، تا بیروڕاکان یەك نەبوون لەسەر خاوەندارێتی ئەو بۆ هەندێ تابلۆ بەشێکی کەم تابلۆ نەبێت، ئیتر مێژوو هێندەی کار پێنەبەخشیوە.

دەوترێت جگە لە قوتابێتی ئەم هونەرمەندە بۆ (بیللینی) ماوەیەکیش لە هاوڕێیەتی تیسیانۆدا کاری کردووە. جیۆرجیۆنی دادەنرێت بە ڕووی شێوازێك بۆ چارەسەرێکی هونەریی نوێ لە نیگارکێشاندا ئەویش بە ڕەت کردنەوەی هێڵی دیاری کراوی فۆرمەکان و یەك پێ

گرتنیەتی بە دیمەنەکانی دەورووپشتی، بێ لە چونە ناوەوەیەکی ڕاستەوخۆ بێ هیچ ئامادەکاریەکی پێشوەخت کە هاوسەردەمانی پابەندیەکی تەواویان پێوە هەبووە. ئەو جگە بە ئاراستەی دیمەنی سروشتی چوونی بە ڕاددەیەك هەندێ جار خودی دیمەنە سروشتییەکە بۆتە خودی بابەتەکە، هەروەك چۆن لای ئینتیباعیەکان ڕوویدا دوای سێ سەدە. ئەم گرنگیدانە بە دیمەنی سروشتی و تەرخان کردنی بەشێکی باش یاخود سەرەکی لە تابلۆ بۆی شتێك بوو بۆ ئەو دەمە سەیرو پڕ بوێری و نوێ. کەسایەتیەکان لە زۆرێك لە کارەکانی جیۆرجیۆنیدا پێگەیەکی پلەدوو وەردەگرن و دیمەنە سروشتیەکان بە پلەی یەکەم دێن.

ئەوەی لە دوای ئەم تایبەتمەندێتیانەی هونەرەکەی جیۆرجیۆنی دێت هەستیاریی گوزارشتی ئەوە، ئەو جیهانە خەونیەیە کە تیایدا وێنەکانی لەناو شەپۆلەکانی ڕووناکیدا مەلە دەکەن وەك کازیوەو زەردەپەڕ.

ئەو پێشڕەوی نەوەیەکە دوای خۆی دێن، نەوەیەك کە لە پێناو کلێسادا هێند کارناکەن یاخود لە پێناو دەسەڵاتدا هێندەی لە پێناو ململانێی سەردەمەکەیاندا لە ئەفراندندان.

بەم شێوەیە جیۆرجیۆنی لە بازنەی هونەری ئاینی و هونەری ڕەسمی مێژوویی دەرچوو، بابەتی کردە هەنجەتێك بۆ چارەسەری کێشەکانی ڕەنگ و ڕۆشنایی و فۆرم و گوزارشت کردن لە دیدگا ئیستاتیکیەکان، ئەو کارو بەرهەمە کەمەی بەجێیهێشت جێ ئاماژەی ئەزمونهایەکی نیگارکێشانن.

سەرباری تابلۆکانی "زریان" و "سێ فەیلەسوفەکە" و "پاکیزە" لە ڤینیسیادا خاوەنی تابلۆکانی "مریەم لەسەر عەرش" و "مەسیح خاچی هەڵگرتووە" و لە لۆڤەریش تابلۆ بەناوبانگەکەی "ئاوازی چۆڵەوانی"ی لەخۆ گرتووە. "ڤینۆسی نووستوو"ش لە مۆزەخانەی درسدنە، هەندێك دەڵێن بەشی خوارەوەی ئەم تابلۆیە دەستکردی تیسیانۆیە. تابلۆی زریان نمونەیەکی سەیرو ئاشکرای گرنگیدانی ئەم هونەرمەندەیە بە دیمەنی سروشتی. دەربارەی بەرجەستەکردنی مریەم لێکدانێکی دروست کردووە لە نێوان پیرۆزیی و جوانیەکی مێینەیی کچانی ڤینیسیادا.

جیۆرجیۆنی نەبووە خاوەن شێوازێکی تایبەتی کارکردنی خۆی لە دوادواییەکانی تەمەنیدا نەبێت، ئەمەش لەو کارانەیدا دەردەکەوێت کە گرنگی زیاتری داوە بە سروشت، ئەو دیمەنە سروشتیانەی لە پشت فیگەرەکانیەوە بەکاری هێناون، مامەڵەیەکی پشتینەی لەگەڵدا نەکردون بەڵکو لە تابلۆی زریاندا هێندەی گرنگی بە دیمەنە سروشتییەکەو بوونی سەرەتاکانی زریانێك لەناو هەورەکەدا داوە هێند سەرڤاڵی کەسایەتیەکانی ناو تابلۆکە نەبووە، تەنانەت ناونیشانی

تابلۆکەی بە حاڵەتی کەشی سروشتی تابلۆکەوە بەستۆتەوە وەك لە بابەتی پابەند بە فیگەرەکانیەوە کە ئاگاداری ڕوودانی یاخود دەستپێکردنی زریانەکە نین.

نمونەی خۆشەویستی و ئالودەیی ئەم هونەرمەندە بۆ هونەری مۆسیقا تابلۆی "ئاوازی چۆڵەوانی یاخود ئاوازی لادێی"یە (کە هەندێ لە مێژوونووسان بەکاری تیسیانۆی دەزانن) دەربارەی دوو پیاوە بە جلی ڕەسمییەوەن و دانیشتون لە چۆڵەوانیەکی سروشت دا بە هاوڕێیەتی دوو ئافرەتی ڕووت.

لە تابلۆی "ڤینۆسی نووستوو"دا بەو شاعیریەتە ناسکەی لە دوتوێی هەستی هونەرمەندایە توانیویەتی کۆکردنەوەیەك بکات لە نێوانی توێژینەوەیەکی سروشت و گرنگیدانی بە جوانی مێینەیی سەرزەوی، ئەو خوداوەندەی بەرجەستەکردووە بە پاڵکەوتویی لە نێوەندی دیمەنێکی سروشتی پڕ سۆزی ناسکدا سێبەری درەختێ بۆتە سایەی، دووراودووریش چەند درەختێکی تر دیارن. ئەم شێوازەکارکردنەی کاری کردە کەسانێك کە دوای ئەم هاتن بە گرنگیدانی بە کاریگەریی ڕووناکی و سێبەر لەسەر فیگەرەکانی.

جیۆرجیۆنی نمونەی گەنجێتی هونەری ڤینیسییەو سەرەتای بەهارێکیەتی کە تیایدا بینگەی چەندان وەك تیسیانۆ شکۆفەی کرد، ئەو -لە میانی هونەرەکەی و ژیانە کورتەکەیەوە کە تاعون زام زەدەی کردو کۆتایی پێ هێنا- دروشمێك بوو بۆ ئەم گەنجێتییە.

ئەو دەمەی تاعون بەرۆکی گرت (ساڵی ١٥١٠) ئەم کەڵە هونەرمەندە بوێرە لەتەمەنی سیو چوار ساڵیدا بوو.

## تیسیانۆ فیشللی "Tiziano" ١٤٨٨-١٥٧٦

تیسیانۆ لە دێیەکی بچوکی (پیف دی کادور) سەر چیای ئەلپ لەدایك بووەو لە ڤینیسیا پەروەردەو نیشتەجێبوونی یەکجارەکی خۆی بڕیارداوە تا تەمەنی گەیشتۆتە نەوەد ساڵی. کەسێك بووە خۆشەویست و بەڕێز لەبەر باڵایی ئاکاری و بێهاوتایی هونەرەکەی.

لە ڤینیسیا ڕێساکانی هونەری خوێندووە لەلای (جنتیل بللینی) وەك سەرەتا دواتر چووەتە ئەتێلەی برای ئەو هونەرمەندە کە (جیۆڤانی بیللینی)یە، هەر لەوێش لەگەڵ جیۆرجیۆنیدا یەکتر دەناسن کە ئەویش بە مەبەستی خوێندن لە ئەتێلەی ئەو هونەرمەندەدا بووە. تەمەنی ئەوکاتەی تیسیانۆ نۆ ساڵان دەبوو کە هاتە ڤینیسیا و مامی گرتیە خۆی و سەرپەرشتیاری خوێندنی هونەری ئەوی کرد.

وەختێ جیۆرجیۆنی لە جیوڤانی مامۆستای جیابۆوەو خۆی کەوتە کارکردنی هونەریی، تیسیانۆی لەگەڵ خۆیدا دەبرد تا یارمەتی بدات لە ڕازاندنەوەی هەندێ کۆشکدا، ئەم

هاوڕێیەتیەیان چوار ساڵ بەردەوام بوو لە میانیدا چەندان وڵات گەڕان بە مەبەستی کارکردن، لەم چوار ساڵەدا کاریگەریەکی تەواوی مامۆستاکەی کەوتە سەر بە ڕاددەیەك شتێکی قورس بوو بۆ خەڵکی کارەکانیان جیابکەنەوە، بە تایبەت ئەمیش وەك مامۆستاکەی سەرسامی دیمەنی سروشتی بوو و بەهایەکی تایبەت و گەورەی پێدەبەخشی. تیسیانۆ سەربارى ڕەونەقی ڕووخساری و ڕووکاری زیرەك و گورجوگۆڵ و چالاك بووە.

ساتێ جیۆرجیۆنی هاوڕێو مامۆستای ساڵی ١٥١٠ کۆچی دوایی دەکات و (بیللینی)یش لە ساڵی ١٥١٦دا دوا ماڵئاوایی خۆی دەکات لە ژیان، تیسیانۆ دەبێتە نیگارکێشی یەکەمی شاری ڤینیسیا بێ هیچ چەندوچونێك و کارامەترین هونەرمەندی سەردەمەکەی. بەرەنجامی بڵاوبوونەوەی تاعون ناچار دەبێت بۆ ماوەیەك ڤینیسیا جێبێڵێ و بچێتە بادوا، ئەمیرو پیاوانی دەوڵەت هاتوچۆیان دەکرد بە مەبەستی کارکردنی هونەری بۆیان، لە ساڵی ١٥٢٣دا دۆستایەتی ئەم هونەرمەندە لەگەڵ دیوك ئەندریا جیبرتی دەستی پێکرد، ئەو هاوڵاتیە ڤینیسیەی پیاوی ڕامیاری و جەنگ بوو، ڤینیسیای بە وریایی و ئەزموونی خۆی لە داگیرکاری تورك ڕزگارکرد. هەرچۆن ساڵی ١٥٢٦ لەگەڵ یەکێك لە پیاوانی خانەدان (بیزو ئارتینۆ)دا یەکیان ناسی، ئەوکارانەی لێوان لێوی بینگەیەکی پڕخۆشی ژیان بوون لە ئەفرێنراوی ئەم سەردەمەیەتی وەك تابلۆی "خۆشەویستی پیرۆزو خۆشەویستی گڵاو" کە ساڵی ١٥١٥ دروستی کردووە، لەم تابلۆیەدا دوو ئافرەتی نیگارکێشاوە دانیشتون لە چۆڵەوانیەکی سروشتدا، یەکێکیان بە ڕووتی و ئەوی تریان بە جلەوە، ڕووتەکەیان هێمایە بۆ خۆشەویستیەکی دنیایی و پۆشتەکەشیان ئاماژەی خۆشەویستیەکی ئاسمانی دەکات. ساتێ لە کەشی گشتی ئەم تابلۆیە دەڕووانین زووبەزوو تابلۆی (ئاوازی چۆڵەوانی یاخود لادێ)ی جیۆرجیۆنیمان وەبیر دێتەوە. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەیدا گەلێك بابەتی جۆراوجۆری بەرجەستەکردووە، پۆرترێتی گەورە پیاوانی سەردەمی خۆی بە خستنەڕووی باری دەرونیانەوە ئەفراندووە، لە بەناوباتگترین کارەکانی ئەم ماوەیەی تابلۆی "پیاوە دەستکێش لە دەستەکە"یە ساڵی ١٥١٨. ئەم ناوبانگەی تیسیانۆ لە بەرجەستەکردنی وێنەی کەسایەتیدا لە دوای مردنی رافائیل هێندەی تر چووە پێشێ و ئیتالیای سەراپاگیر کرد.

خۆشی و ڕێزو گرنگیپێدانی تیسیانۆ لە بەردەم مەرگی ژنەکەیدا ساڵی ١٥٣٠ دەستەوسان بوو، ماڵەکەی بەجێهێشت، لە ماڵێکدا دەستی بە ژیان کردەوە لەسەر دەریاو لە بەردەم دورگەی مۆرانو، ماڵێك بوو جێی بەیەك گەیشتنی بیرمەندان و هونەرمەندان و بلیمەتانی سەردەمەکەی.. لەوێوە کارکردنی لەپێناو مارکیز دی مانتوا دەست پێکرد هەر لە ڕێی ئەم

پیاوەشەوە میانەی لەگەڵ تەختی کۆشکی ئۆربینۆ دروست کرد. سامانێکی زۆری کۆکردەوە، کارکردنی تا ئەوکاتەی بە ڕەنگ و ڕۆشنایی کردنی ڕاستیەکانی بوو، کە ئەم دوو توخمە نمایشی میزاجێکی سەرکەوتوی ئەویان دەکرد لە هونەرەکەیدا.

ئەو کاتەش کە شارلکانی مەلیکی ئیسپانیا بە بانگهێشتی کلیمنتی حەوتەم هاتە ئیتالیا، تیسیانۆ نیگارێکی کەسایەتی بۆ کێشا کە بووە مایەی پتەوبوونی پەیوەندی بە کۆشکی ئیسپانیەوە. لەم تابلۆیەدا مەلیك شارلی پێنجەمی دروست کردووە لە جل و بەرگی جەنگیدا و بە سواری ئەسپەکەیەوە. ئەم جۆرە بەرجەستەکردنە بۆ وێنەی مەلیك بە جلی سەربازی و ئەسپ سواریەوە لەپاش ئەم تابلۆیە وەك ڕێسایەکی تایبەتی لێهات و ڕەنگی دایەوە لە کارەکانی دوای خۆی لای "ڕۆبنزو ڤان دایك" و چەندانی تر. مێژووی ئەم تابلۆیەی هونەرمەند دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٣٣ کە خۆی لەسەفەرکردنیدا بۆ ئیسپانیا لەسەر داواکاری تایبەتی مەلیك دروستی کرد. بۆ ماوەیەکیش بووە نیگارکێشی تایبەتی مەلیکی ئینگلترا مەلیك فیلیپی دووەم، تا دواتر پاپا پۆلسی سێهەم بانگهێشتی ڕۆمای کرد ساڵی ١٥٤٣ پێشوازیەکی گەورەو گەرمی لێکرا لە ڕۆما، ساڵی ١٥٤٦ تابلۆی پۆلسی لەگەڵ کوڕەزاکانیدا دروست کرد. ئەم ماوەیە کاریگەریی مایکل ئەنجیلۆ کەم تا زۆر کاری تێکرد، هەرچەندە مایکل ئەنجیلۆ بە نمونەی پیاو گوزارشتی لە سەردەمەکەی کرد بەڵام تیسیانۆ گیانی سەردەمەکەی خۆی بە نمونەی ئافرەت نمایش کرد، ئەو ویستی وابوو لە ناوەوەڕا گیان بکات بە بەری نمونەکانیدا، بەڵام ئەم لە دەرەوەڕا گیانی کرد بە بەر نمونەکانیدا لەنێو ئەو کەشەی دەوروپشتی داوە، لەڕێی نمونەهایەکەوە کە نمایشی جوانیەکی دوورە دەست و تەنها ناکەن بەڵکو بوونەوەرهایەك کە هەناسە دەدەن و دەژین لە دەوروبەرەکەیاندا.

بەرهەمەکانی تیسیانۆ لە چوارچێوەی ئەو بابەتانەی پێشوودا نەوەستا بەڵکو بابەتی ئەفسانە بەردەوام جێی گرنگی بووە، نیگاری چیرۆکی (باکوس و ئادریانۆ)ی کێشا ساڵی ١٥١٩ لەسەر پشتینەیەکی سروشتی خاوەن ڕەنگی ڕەونەقدارو گەرم کە گوزارشت بوو لە شێوازی سەردەمی ڕێنیسانسی زێڕین لە ڤینیسیادا. لە هەرە تابلۆ مەزنەکانی کە وێنەی ئەم خواستەی بنوێنێ تابلۆی "ڤینۆسی ئۆربینۆ"یە، تیا خوداوەند لەسەر جێگەکەی پاڵ کەوتووە لە ژورەکەیدا سەگێکی بچوکیش لای قاچیەوە نووستووە. لەم تابلۆیەدا زیاترین کاریگەریی ئەندێشەی جیۆرجیۆنی مامۆستای دەبینین لەسەری، تەنها جیاوازی نێوان ئەم دوو تابلۆیە لە پشتینەی سروشتی لای جیۆرجیۆنی و پشتینەی تەلارسازی لای تیسیانۆدایە.

بابەتی ئاینیش وەك مریەم و مەسیح و پیرۆزمەندەکان جیّ گرنگیپێدانی دوادوایی ژیانی بوو، لە دیارترینی ئەم کارانەی تابلۆی "تاجی دڕك خستنە سەری مەسیح"ە، کە لە دوا داهێنانەکانی شێوازی خۆی تیا بەرجەستە کردووە، پشت بەست بووە بە ڕەنگ و ڕۆشنایی لەجیّبەجیّکردندا لەسەر پشتینەیەکی تاریك کە گرنگی پلە دووی پیّ بەخشیوە لەچاو ئەو ڕووناکیەی لە فیگەرەکانی داوە، ئەمەش بە بەراورد بەو هەموو گرنگی پێدانەی ئەو بۆ پشتینەی تابلۆ دەیکرد، شتێك بوو نویّ لە درێژایی ڕێچکەی کارکردنی ئەودا.

تیسیان تا تەمەنی نەوەدو نۆ ساڵی ژیاو دواجار بەو تاعونە مرد کە لە لاوێتیدا لە دەستی ڕایکرد.

لە دواجاردا گەر مایکل ئەنجیلۆ بەدوا پەیکەرەکانی ڕچەیەکی بۆ هونەری دوای خۆی شکاندبیّ، ئەوا تیسیان ئەو باوکەیە کە ڤلاسکیوز و ڕۆبنز و ڤان دایك و رامبرانت و پوسان و ڤاتۆی لیّکەوتۆتەوە، هەر ئەو بووە یەکیّ لە سەرچاوەکانی بەهرەوەرگرتنی ئینتباعیەیە فەرەنسییەکان لەو ڕێسایانەیدا کە ئاماژەن بە گۆڕانکاریکردنی هەموو بینراوێك بۆ ڕەنگهایەك کە لە ڕۆشناییدا مەلە بکات.

## تنتۆریتۆ (Tintoretto) ١٥١٨-١٥٩٤

ناوی بنەڕەتی (جاکوبۆروبستی)یە بە تنتۆریتۆ ناوبانگی دەرکردووە، باوکی بۆیاخچی بووە لە ڤینیسیادا، بۆیە ئەم هونەرمەندە هەموو منالی خۆی لەنێو ڕەنگدا بەسەربردووەو بەهرەی نیگارکێشانی تیادروست بووە. باوکی ناردیە لای تیسیانۆ، بەلاّم لەبەر کەللەڕەقی و بەرزی ئاستی کارکردنی تیسیانۆ لای خۆی ڕاینەگرت. بەلاّم ئەم لاوە هۆگری کارەکانی مایکل ئەنجیلۆ بوو لیّی تۆژینەوەو ڕاهێنانی هەمیشەیی لەسەر دەرکردن بە ئارامییەکی تایبەت و وردەیەکی نەپساوەوە شەونخونی دەکێشا و بەردەوام لە چاودێری کردنی سێبەرو ڕووناکیدا لەسەر شتەکانی دەوروپشتی. یەکەم تابلۆی نیگاری خۆی و براکەی بوو. ئەم تەمەنەی بەکارکردن و توێژینەوە لە زانستەکانی توێکاری و بەربینەدا بەسەربرد.

لە ساڵی ١٥٤٥دا تنتۆریتۆ تابلۆی "پەرجوی سان مارك"ی کۆتا پێهێنا، کە ڕێزلێنان و ستایش و ناوبانگێکی باشی بۆ بەدەست هێنا. هەر لەم کاتەیدا بوو ئەو کارانەی بەرهەم هێنا کە دەرباری بابەتە ئاینییەکانی نێو ئینجیل بوون و ئێستا جیّ شیاوی خۆیان لە مۆزەی (ئەلبرادۆ)دا وەرگرتووە. بەلاّم بەپێزترین ماوەی ژیانی تنتۆریتۆ کە پڕ لە بەخشین و کارکردنی پێگەیشتووە، نێوان ساڵانی ١٥٦٤ بۆ ١٥٨٨ لە ڕازاندنەوەی دیوارەکانی قوتابخانەی (سان رۆکۆ)یە لە ڤینیسیا، جوانترین کارەکانی لێرەدا بەرهەم هێنا و لە پێش هەموویانەوە تابلۆ

درامی ئامێزەکەی "لە خاچدانی مەسیح" بە پێکهاتە لاسارو جووڵە تەقیوەکانیەوە و ئەو دینامیکیەتە دەرونییەی ڕەنگ و ڕۆشنایی لە ڕوودانیا پێکەوە بەشداری دەکەن.

تنتۆریتۆ هونەرمەندێ بوو لەناو میللەتەوە، گوزارشتی هونەری خۆی لە گیانی مایکل ئەنجیلۆ وەردەگرت تێکەڵ بەو ڕێسایانەی لە تیسیاندا پێی سەرسام بووبوو، لەم لێکدانە ئەستەمە شێوازی کارکردنی ڕسکا، لە ڕێی ناوەڕۆکی ئاینی و کامڵی دەست ڕەنگینی و بێهاوتایی پیشەییەوە، پێگەی خۆی لەناو ڤوتابخانەی ڤینیسیدا جێگیر و پتەو بکات، بە دوور لە تەوژمی "مانێریزم" کە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەی سەراپاگیر کردبوو، ئەو توانی سیما و تایبەتمەندیە جیاکانی خۆی لە هونەری هاوسەردەمانی لە بلیمەتەکانی ڕێنیسانسەوە وەرگرێت و سودمەند ببێت. (هەرچەندە سەرچاوە هەیە ئەم هونەرمەندە وەك نیگارکێشێکی مانێریزمەکان دەست نیشان دەکات).

لە ساڵی ١٥٧٨ تنتۆریتۆ ڕازاندنەوەی دیوارەکانی کۆشکی دیوکی ڤینیسیای پێ دەسپێرڕێت و دەست دەکات بە کارتیاکردنی، کۆمەڵێ کاری هونەری ئەنجام دەدات کە ئاوێنەی ئەو داهێنانانەین کە خستویەتە سەر تەرزی ڕێنیسانس، لەو تابلۆیانە تابلۆی "مێردکردنی ژنە پیرۆزمەند کاترین"ە کە هەندێ کەسایەتی تیا فڕیون بە ئاسماندا.

تابلۆی "هەڵاتن بەرەو میسر" هەر دەگەڕێتەوە بۆ کارکردنی ئەم ساڵانەی، کە جوانترین دیمەنی سروشتی لە هونەری نیگارکێشاندا لەخۆگرتووە، ئەم بابەتە بۆ خۆی لەو بابەتانە بووە کە هونەرمەند زۆر بە دڵی بووە، هەر دوای ئەم تابلۆیە لەم بابەتەوە "مریەمی میسری" و "مریەمی مەجدەلی" بەرجەستەکردووە.

تنتۆریتۆ بە خاوەن ئەندێشەیەکی فراوان ناوی دەرکردبوو لە پێکهاتەی گشتی کارەکانیدا، هەروەها جوڵەی توندوتیژی بەکارهێناوە بۆ کەسایەتیەکانی وەك گوزارشت کردنێك لە هەڵچون لە بابەتەکەدا. هەرچەندە ئەم نیگارکێشە بابەتی ئاینی زۆر بووە بەڵام وەك هەر هونەرمەندێکی هاوسەردەمی خۆی کارەکانی لە بابەتی ئەفسانەیی بێبەش نەبووە. تابلۆکانی "باکوس و فینیس" و "سوزان لە گەرماودا" گەواهی ئەم ڕاستیەن.

لە هەموو ئەم کارانەیدا کەسایەتی تنتۆریتۆ وەك کەسایەتیەکی هونەری سەربەخۆو بێلایەن دەرئەکەوێت خاوەن سیماو شێوازی کارکردنی خۆی کە لەسەر یەکگرتنێکی ڕووناکی و تاریکی، پانتایی و جووڵە وەستاوە، سەرباری ئوستادیەکی کەم هاوتا لە ڕەنگ ڕێژی و بەخشینی کەشێك لە ئەفسوون بەسەر ژیاندا.

گەر نـاوی تنتۆریتـۆ بـە بازنەیـەکی ڕوونـاکی دەور نـەگیرابێت وەك نـاوی رافـائیل یـاخود تیسیانۆ ئەوا جیهانە ڕازاوەکەی بینگەیـەکی هـەڵقوڵیوو خـاوەن کاریگەریـەکی قوڵی لـە نێوان کلتوری ئەم سەردەمە بەخشی بە هونەر.

## پاولۆ ڤیرۆنیزی (Paoulo Verones) ١٥٢٨-١٥٨٨

دەچێتە خانەی ئەو هونەرمەندانەوە کە جێدەستیان بە هونـەری سـەدەی شانزەوە دیارە، لـە ڤیرونـا پـەروەردە بـووە دواتـر هاتۆتـە ڤینیسیاو زۆربـەی ژیـانی لـەوێ بەسـەر بـردووە و هونەرەکەی تیا باڵای کردووە.

لـە سـاڵی ١٥٥٢ دوای ئـەوەی بـادوا جێدەهێڵێ و دێتـە ڤینیسیا دەبێتـە قوتـابی بەردەسـتی تیسیانۆو تنتۆریتـۆ. ڤیرۆنیزە کـە بـە نیگارکێشی خۆشیەکانی ژیان نـاوی دەرکـردووە، لـەو تابلۆیانەشـدا کـە دەربـاری بابەتـە ئاینییەکانـە ئـەو لـە دەرخسـتنی ئـەو ڕووە پـڕ خۆشـی و ڕابوردنە نەکەوتووە، هەتا جارێکیان هەڕەشەی بۆ دێت لـە لایـەن دادگای سەرپەرشتیاری‌یەوە لە ئاسـت ئـەو گاڵتـە پێکردنـەی لـە نمایشـی هەڵوێستە ئاینی‌یـەکاندا نواندویـەتی. دەگێڕنـەوە دەربـاری تـابلۆی "شـێو لـەلای لیفـی" پیـاوانی ئـاینی پێیـان وتـووە ئەمـە بەرجەسـتەی شێوکردنێکی مەسـیح نیـیە بـەڵکو بەرجەسـتەی یـەکێ لـە دانیشـتن و کـەش ڕابواردنـەکانی ڕۆژانەی خۆتانە لە ڤینیسیادا.

بە شێوازی کارکردنی رافائیل و تیسیانۆ زۆر سەرسام بووە، سـەرباری کـارکردنی لـە تـابلۆدا دەستی هەبووە لە ڕازاندنەوەی هۆڵ و دیوارو کۆشکەکاندا، زیاتر حـەزی بـە بەرجەسـتەکردنی بینای زەبەلاح هەبووە لـە پشـتینەی کارەکانیدا، کەسایەتی‌یەکانی هەمیشـە بـە جـل و بـەرگی نـاوازەو شـیکەوە بەدەرکـەوتون. لـە کـارە هـەرە دیـارو جوانـەکانی تـابلۆی (بینینـی پیرۆزەمـەند هیلانە بۆ خاچ) و تابلۆی (داگرتنی مەسیح) و تابلۆی (پاکیزە)یە. کارەکـانی هەمیشـە پڕمانـاو ئاشکرایی لە گوزارشتدا بووە بە دوور لە زۆر لەخۆکردن، خاوەن هێڵی ناسـك، پێکهاتـەی پتـەو، وەك لە تابلۆی (ڕێزنواندنی داریوش لەبەردەم ئەسکەندەر)دا، کە لە مۆزەی لەندەنە، هـەرچۆن هونەرەکـەی لـە سـۆزەوە نزیـك تـر بـوو وەك لـە ئـاوەزو وریاییمـەوە بـە پێچەوانـەی هونـەری تنتۆریتۆوە، ڤیرۆنێزە زیاتر دادەنرێـت بـە کۆتـایی بیروباوەڕەکـانی ڕێنیسـانس و سـەرەتاگرتنی ڕێبـازی پەیرەوگـەرایی[٢٤] (مـانێریزم)، کارامـەیی ئـەو لـە پـەی بـردن بـە بەرببینـەی پێوانـەیی (raccourci) بۆ زاڵبوونێکی کامڵ بەسەر نمایشی جوڵەدا، ئەم پێگە هەستیارەی پێبەخشی.

## پێگەی کۆمەڵایەتی هونەرمەند لە سەردەمی ڕێنیسانسی سەرەتاو زێڕینی ئیتالیدا

وەك ئاشکرایە هونەر وەك پیشەیەك تەماشاکراوە لەلایەن دەسەڵات و خەڵکیەوە هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا نیوەی دووەمی سەدەی پانزە. لەم بینگەیەشەوە هونەرمەند وەك پیشەگەرێك دادەنرا. زۆربەی جار بانگکردنیشیان بەناوی پیشەی باوکیانەوە بووە یاخود شوێنی لەدایك بوونیان یا مامۆستاکانیانەوە. فێربوونیان لە قوتابخانەدا نەبوو یاخود فێربوونێکی قوتابخانەیی نەبوو بەڵکو لە وەرشەدا وەك پیشەگەرێك و بە شێوەیەکی پراکتیکی ڕاستەوخۆ بە دوور لە هەموو فێرکردنێکی تیوری، لە دوای فێربوونی نووسین و خوێندنەوەو ژمێریاری هەر لە منالّیەوە دەخرانە بەردەستی مامۆستایەکی هونەر بۆ ماوەی هەشت یا دە ساڵ فێردەبوون. پەیکەرسازەکان لای نەققارو بەناکان کاریان دەکرد، بە دۆناتێللۆ وتراوە (پیشەگەرو بەنا بە بەرد). تەنانەت هێندێ کەس ئەوەندەی بە ناوی مامۆستایی ناوی دەرکردبوو ئەوەندە خودی خۆی هونەرمەند نەبوو، قوتابیانیش بەپێی ناوبانگ و کارو بەرهەم دەچونە لای مامۆستاکان، ئەوانیش ژمارەیەکی زۆرتریان لێوەردەگرتن چونکە ئەو قوتابیانە گەر باشترین سەرچاوەی داهاتی ئابورییان نەبوونایە ئەوا ئاسانترینیان بوون، ئەمەش زۆرترین لێکدانەوە هەڵدەگرێ بۆ پان و فراوان بوونی بەرنامەی فێرکردنی هونەری، نەك خواست و هەوڵی هونەرمەندەکان خۆیان.

کاری سەرەتایی کە فێری قوتابیان دەکرد یاخود ئەرکی قوتابی بوو، بریتی بوو لە ئامادەکردن و گرتنەوەی بۆیە، چاکردنەوەی فلّچە، کۆپیکردنی هێڵکاری و سکێچ بۆ سەر تابلۆ، پڕکردنەوەی جل و بەرگ و هەندێ شوێنی لەشەکان کە گرنگ نەبوون. بەڵام ساتێ لە قوتابییەوە دەبێتە یاریدەدەر ئەوا جۆنیەتی ئەرك و کارکردنی دەگۆڕرێت، مەرج نیە هەموو یاریدەدەرێك پێشتر قوتابی مامۆستاکەی بووبێت، یاخود هەموو قوتابیەك ببێتە یاریدەدەری مامۆستاکەی خۆی. یا ئەوەی گوایە مامۆستاکان دەست لە کارکردنیان دەکێشنەوە لەبەر بەرزی ئاستی قوتابیەکانیان وەك (چیمابۆی-جیۆتۆ، ڤیریکۆ- داڤنشی، فرانشا- رافائیل) وەك دەزانرێت لەسەرەتای ڕێنیسانسدا بەرهەمی هونەری گوزارشت نەبوو لە کەسایەتی تاکڕەوی هونەرمەند، تا هاتنی مایکل ئەنجیلۆ کە بۆ یەکەم جار جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە بە تەنها خۆی هەموو بەشی کارێك بە ئەنجام بگەیەنێت. ئەمەش بەگژاچونەوەیەکی ئەو بیرکردنەوانە بوو کە جیاوازی نێوان هونەرمەندو پیشەگەرێکیان نەدەکردو هەرگیز دانیان بە تایبەتمەندێتی

کاری هونەریدا نەدەناو بە کارێکی کۆمەڵی لێیان دەڕووانی، ئەم جۆرە بیرکردنەوەو تێڕووانینە بۆ هونەرو هونەرمەندان تا کۆتایی سەدەی پانزە بڕی کرد. بۆ نمونە بیست قوتابی لەگەڵ جیبرتیدا کاریان دەکرد لە دەرگای شۆردنگەکەدا کە بە مەزنترین ئەرك مەزەندە دەکرێت بە هونەرمەند درابێت. لە سایەی ئەو تێڕووانینەدا کە ئاماژەمان پێکرد هەندێ جار کەسێکی دەوڵەمەند وەرشەیەکی دەگرت و هونەرمەندی بەکرێ دەگرت بۆ کارەکانی، لەوانە داڤنشی لە شاری میلانۆ لە پرۆژەی وەهادا بە کرێ گیراوە.

بەرەنجامی نزیکی هونەر لە پیشەوەو کارکردنی هونەرمەند لەژێر لیستی دەستەی پیشەگەراکاندا، زۆر کاری تریش لە پاڵ کاری هونەریدا دەکرا وەك نەخش لەسەر قەڵغان، ئاڵا، پڕووپاگەندەی دوکانەکان، نەخشی سەر تەختە و هەڵکەندنی ڕەنگاوڕەنگی تەختە، نەخش و نیگار بۆ فەرش و دەست درووەکان، پارچەی نەخشاوی بۆ بۆنەو ئاهەنگەکان.

هونەرمەندێکی وەك پۆلایۆلۆ دوای ناوبانگ دەرکردنیشی لە پەیکەرسازی و نیگارکێشاندا، هەر خەریکی زەڕەنگەری بوو، ڤیریکۆی مامۆستای داڤنشی سەرباری هەموو کارێکی هەروا خەریکی قاپی خەزەفی بوو لەگەڵ نەخشاندن لەسەر تەختە، دۆناتێللۆ جلکێکی جەنگیو ئاوێنەیەکی بۆ سەرپەرشتیارەکەی دروست کرد، بۆ تشیللی نەخش و نیگاری بۆدرومان دروست دەکرد.

بەڵام بە هاتنی مایکل ئەنجیلۆ هونەرمەند لە دەستەی پیشەگەران جیابۆوە، ڤازاری چیتر پەسەندی نەکرد ڕێزگرتنی پیشە دەستییە پەتیەکان لەگەڵ ڕێزگرتنی هونەرمەند بۆ خودی خۆی ڕێ بکات.

لەساڵی ١٥٩٠دا دەستەی نیگارکێشە پیشەییەکان شکاتیان لە هونەرمەند جیوڤانی باتێستاپوجی کرد لەبەرئەوەی حەوت ساڵ لەژێر ڕاهێنانی پیشەییدا نەبووەو کەوتۆتە کارکردن، کە پێی دەوترا (بەرنامەی ڕاهێنانی دیاریکراو). دواجار لەسەر ئەم شکاتەوە فەرمان دەرکرا بە قەدەغەکردنی لە شاری جنوا، ئەم نمونەیە هەرچییەك بێت ئەوە دەسەلمێنێت کە لیستی دەستەی پیشەگەران شتێکی پێویست نەبووە بۆ هونەرمەند تا ئەتێلەی تایبەتی خۆی بکاتەوەو کار بۆ خۆی بکات.

ئەم بارە قورسەی دەستەی پیشەگەراکان سەپاندبووی وایکردبوو هونەرمەندانی ڕێنیسانس یەك ئابوریان هەبێت لەگەڵ پیشەگەرەکاندا کە ئەویش ئابوریەکی باش نەبوو. مازاتشو نەی دەتوانی کرێی ئەو منداڵە بدات کە لەلای کاری دەکرد، بە هەژاری و قەرزاری

مرد. ڤازاری دەیگێڕێتەوە کە فیلیولیبی لە توانایدا نەبوو جوتێ گۆرەوی بۆ خۆی بکڕێت. ئۆتشێللۆش وەختێ پیر بوو خاوەنی هیچ نەبوو و ژنەکەشی نەخۆش بوو.

تەنها ئەو هونەرمەندانە نەبێت کە لەناو کۆشکەکاندا کاریان دەکرد یاخود خاوەنێکیان (سید) هەبوو یا پیاوێکی گەورە دەیبردن بەرێوە، نمونەی ئەمە فرانجیلیکۆیە کە مانگانە (١٥ دۆک)ی وەردەگرت، کەسێك ٣٠٠ دۆکی هەبوایە ساڵانە زۆر بە خۆشی لە فلۆرەنسادا دەژیا. ئەم کەم دەرامەتیە هونەرمەندی باش و خراپ و بەناوبانگی بۆ نەبوو. دۆناتێللۆ لەو هونەرمەندانە بووە کە لە چاو خۆیدا نرخی باشی وەردەگرت بەڵام هێشتا نرخە خەیاڵییەکان نەزانراو بوون.

ئەو نرخ و کرێیەش کە پێیان دەدرا بە رێك و پێکی نەدەدرا بەڵکو بە دەسندە (قسط) بووە، یاخود لەبەر نەبوونی لە پێشەوە هەندێ پارەیان وەردەگرت، چەندان جار داڤنشی شکاتی لە لۆدڤیکۆ هەبووە کە کرێکەی نەداوەتێ. بەڵام لە پرۆژەو کاری گەورەدا بە شێوەیەکی تر بوو، هونەرمەند کرێی خۆی بە رۆژانە وەردەگرت.

بەپێی ئەو قەواڵانەی کراوە دەرئەکەوێت تا کۆتایی سەدەی پانزە هونەرمەند زۆر سەربەست نەبووە، بەڵام لەو ساڵە بەدواوە دەرئەکەوێت کە هونەرمەند سەربەستی زیاتری هەبووە، بۆ نمونە ساڵی ١٥٣١ مایکل ئەنجیلۆ قەواڵەیەکی کردووە کە ئازادە پەیکەر بکات یا نیگار بۆ سباستیانو دل پیومبو.

ئیتالیا لەهەر وڵاتێکی تری ئەوروپی باشتر بووە وەك پێگەی هونەرمەندەکانی، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ رێزلێنان و ستایشی ئەمیر و فەرمانڕەواکان بۆ بەهرەو توانای هونەرمەندان، زۆر زیاتر لەهەر وڵاتێکی تری ئەوروپی. کاریگەرترین شتێك کە هونەرمەندی ئازاد کرد لە لیستی دەستە پیشەییەکان کارکردنیان بوو لە تەختی پاشاو کۆشکی مەلیکەکانداو هاتوچۆو سەفەریان (بۆ ئەم مەبەستە) لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر. بەڵام ئەم بارە لە سەروی ئەوروپادا بە جۆرێك بوو کە نەدەبوو هونەرمەند لەیەك شاردا بجوڵایە. ئەم جۆرە مامەڵەکردنە هەرچی زیاتر رێ خۆشکەر بوو بۆ زیاد بوونی رێزی هونەرمەندو نزیك بوونەوەی لە پلەی هۆزان ڤان و زانایان، بە دیاریکراوی دەتوانین بڵێین لە چارەکی دوایینی سەدەی پانزەدا نرخی کارکردنی هونەرمەند بەرز بۆوە. مایکل ئەنجیلۆ ٣٠٠٠ دۆکی وەرگرت بۆ بنمیچی کلێسای سکستین. لە کۆتایی سەدەی پانزە باری ئابوری و ژیانی هونەرمەندانێکی تایبەت هەر زۆر باش بوو، پیرجینۆ چەندان خانوی هەبوو.. داڤنشی ساڵی ٢٠٠٠ دۆکی وەردەگرت لە میلانۆو لە فەرەنسا بۆیان کرد بە ٣٥٠٠٠ فرەنك ساڵانە.

لەگەڵ دەستپێکردنی سەدەی شانزە باری ژیانی هونەرمەندان چووە ئاستێکی باڵاوە بە تایبەت ئەوانەی خاوەن بەهرەو توانای ناوازە بوون وەك رافائیل و تیسیانۆ. هەندێ لە مێژوونووسان و توێژەرەوەکان هاوشان بوونەوەی شاعیران و زاناکان لەگەڵ هونەرمەنداندا دەگێڕنەوە بۆ یەکگرتنی هونەرمەندان لەگەڵ ئەدیبە خاوەن خواستی هیومانیستەکان. ڕەنگە ئەمە هۆکارێکی گرنگ بێت بەڵام گەورەبوونی شارەکان و زۆریی داواکاری لەسەر کاری هونەریو دەوڵەمەندبوونی ئەو ناوەندانەی گرنگی بە هونەر دەدەن بە هۆکاری سەرەکی دەژمێررێن ئەمە بێ لەوەی ئەدیبە هیومانیستەکان وەك پێگەیەکی ئاوەزی سەیری هونەرمەندانیان دەکرد بۆ بابەتە ئەفسانەیی و مێژووییەکانیان، هەرچۆن گرنگی هونەرو هونەرمەندان بۆ ئەدیبان وەك پڕووپاگەندەیەك بۆ هزرو بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕیان، خاڵی لێك نزیك بوونەوەو یەکسان بوونەوەی هونەرەکان بوو (مبدأ وحدة الفنون) کە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە جیاکرابۆوە. هەرچۆن ئەم سەردەمە لەسەر دەستی لیۆناردۆ داڤنشیدا بۆ یەکەمین جار لاسایی سروشتی پەسەندتر کرد وەك لە لاسایی گەورە هونەرمەندەکان. ئەمەش بووە مایەی زیادبوونی هەرچی لەسەرخۆی تیۆریەکان و کۆتایی هێنان بەو کۆمەڵە تیۆریە دیاریکراوە کە فێرکردنی ئەکادیمی دەینوێنێت. چیتر لە سەرەتاکانی سەدەی پانزەوە گەنجان هونەرەکانی ئەندازەو بەربینەو توێکارییان دەخوێند، ئەمە بێ لە لایەنی پراکتیکی کە بوکیان بەکاردەهێنا وەك نمونە یاخود مودێل، ئەمە بێ لەوەی هەندێ جار پەنایان بۆ سودوەرگرتن لە ژیانی ڕاستەوخۆ دەبرد. ئەمانە گشت نوقلانە بوون بۆ پەیدابوونی ئەکادیمیەکان.. بەڵێ ئەکادیمیەکان دروست بوون و هەموو پەیوەندیەکانی وەرشەو ئەتێلەو دەستە پیشەگەراکان سڕرایەوە بە درێژایی سەدەی شانزە. بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە وردە وردە کاریگەریی خۆی لەسەر ونبوونی پێکهاتنی شێوازی تایبەتی دەست پێکرد.

ئەلبێرتی بە چەمکێکی زانستیانە دەستی بە هونەر کرد، ئەو یەکەم کەسێك بوو وتی بیرکاری بنەمایەکی هاوبەشە لە نێوان زانست و هونەردا. ئەودەمەی داڤنشی هات تەنها کەسێك کە لە پێش خۆی جەختی لەسەر بکاتەوە و پشتی پێ ببەستێ تەنها ئەلبێرتی بوو، لە پاش ئەو وتەیەکی تری خستە سەر وتەکەی ئەلبێرتی کە دەڵێ: نیگارکێشان جۆرێکە لە زانستی سروشت ناسی وردەکار و دەتوانین بڵێین لە زانستیش باڵاتر دەبێت چونکە هونەر لە دواجاردا خودییەو بەڵام زانست ناکەسایەتییە (لاشخصی)، ئەو وتەیەی (سیموندس)ی هێنایەوە یاد کەوتویەتی (نیگار شیعرێکی بێدەنگە) و (شیعریش نیگارێکی بگۆ). داڤنشی وەك سەرنجی خۆی دەرباری ئەو وتەیە دەڵێ: گەر بێدەنگی و لاڵی نیگار کەموکورتی بێت ئەوا

کوێری شیعریش کەموکورتی‌یە. گەر هونەرمەندێ هەبوایە لە لیۆناردۆ زیاتر پابەندی ئەدیبی خواستە هیومانیستەکان بوایە نەی دەوێرا ڕای ئاوا بدات.

زیاترین گرنگی دانێ بە هونەر هەر لەلای کەسایەتی‌یە یەکەمیەکانی هیومانیستەکان دەبینرێت وەك لە ڕەشە خەڵکەکەو ئەو بینینە باوەی لەودەمەدا هەبووە. دانتی نەمری بەخشیوە بە یادی چیمابۆی و جیۆتۆ لە پاکژگە (المطهر)دا (١١، ٩٦/٩٤) و بەراوردی کردون بەهەردوو شاعیر جویدو جوینیتشلی و جویدو کاڤالکانتی. بترارکیش لە شیعرەکانیدا بە باڵای نیگارکێش سیمۆنی مارتینی‌دا هەڵیداوە. فیلبو فیلانی لە وەسف کردنی شاری فلۆڕەنسادا ئاماژەی بە چەندان هونەرمەند داوە وەك گەورە پیاوانی ئەو شارە، ئەمە بێ لە کورتە چیرۆکەکانی ڕێنیسانس بە تایبەت چیرۆکەکانی بۆکاشیۆو زاکتی کە ژمارەیەکی زۆری لە هونەرمەندە بیژۆکەکان لەخۆگرتووە.

دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین کە بە ڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی پانزەهەم سەرەتای دەرکەوتنی بەسەرهاتی ژیانی هونەرمەندان و نووسینەوەو گرنگی‌پێدانی ئەو لایەنە بوو، کە خۆی لە خۆیدا بەرهەمێکی بێ‌هاوتای ڕاستەقینەی ڕێنیسانس بوو، برونللسکی یەکەم هونەرمەند بوو لەم بوارەدا وای کرد یەکێ لە هاوسەردەمانی خۆی سەرگوزشتەی ژیانی بنووسێتەوە، ئەمەش ئیمتیازێك بوو تەنها مافی میرو پاڵەوان و پیرۆزمەندەکان بوو. هەرچۆن جیبرتی یەکەم بەسەرهاتی ژیانی خۆی (سيرة ذاتية) نووسی‌یەوە کە بە یەکەمین بەرهەمێك دادەنرێت لە نووسینەوەی خودی هونەرمەند. ڕێزگرتن و ستایش کردنی هونەرمەندە بە تواناکان گەیشتە ئاستێك شارەوانی فلۆڕەنسا سەکۆیەکی (نصب) یادەوەری بۆ برۆنللسکی لە هەمان کاتیدراڵی کارکردنەکەی خۆیدا دروست کرد. دەرکەوتنی دیاردەی لەم جۆرە گرنگی‌دانی وردە وردەی خەڵکی بە هونەرمەند پیشان دەدات بەدەر لە کارەکەی. بێ لەم دیاردەیە، دیاردەی ئیمزاکردنی کاری هونەری هاتەکایەوە. بە نزیکی ئیمزای هەموو هونەرمەندە گرنگەکان لە سەدەی پانزەهەمەوە پارێزگاری کراوەو ماوە. فیلارتی بە جیدی داوای ئەوەی کرد لەو سەردەمەدا کە هونەرمەندەکان گشت ئیمزای کارەکانیان بکەن. لەمەش بە بەهاتر زۆرێك لەو نیگارکێشانە وێنەی کەسایەتی خۆیان کێشاوە، هەرچەندە زۆر کامڵ و تەواو نەبوون. بەڵام نیگاری خۆیان و خێزانەکانیان کێشاوە، لە پاڵ گەورە پیاوانو مریەم و پیرۆزمەندەکاندا.

بەم شێوەیە جیرلاندایو وێنەی ژن و کەسەکانی خۆی دەکێشێت لەسەر دیوارەکانی کڵێسەی سانتاماریا لەبەردەم دامەزرێنەری کەنیسەکەو ژنەکەی. نەك هێندەو بەم شێوەیەو بەس بەڵکو شاری بیرۆجە داوایان لە بیرجینۆ کرد کە وێنەی خۆی لەپاڵ وێنە فریسکۆکاندا دابنێ لە

بازاڕی ئەلکامبیۆ. لە نموونەی تری ئەم جۆرە ڕێزلێنانانە بەخشینی پلەی ئەندامێتی ئەنجومەنی پیاوماقوڵانە بە جنتلیدا فابریانۆ لەلایەن کۆماری ڤینیسیاوە. یان بەخشینی پلەی (هەڵگری ئاڵا) بە فرانشسکۆ فرانشا. فلۆرەنساش نازناوی (ئەندامی ئەنجومەن)یان دا بە میکلوتسو. وەك هەنگاوێکی گۆڕانکاری گرنگیش بەرەنجامی چونە پێشەوەی هوشیاری هونەرمەند چیتر هونەرمەند پابەندی ڕاستەوخۆو دەقاودەقی نەما بە داواکاریەکانەوە کە لێی دەکرا، بگرە گۆڕانکاری و خستنەسەری خۆیانی تێدا بەکاردەهات. بۆ نموونە بێرجینۆ کە وەك ئەستێرەیەکی نازدار کاری دەکرد، کارەکانی تەواونەدەکرد وەك ئەو کارەی کە لە (کۆشکی کۆن) و ئەو کارەشی کە لە (کۆشکی دیوك) لە ڤینیسیا. کڵێسەی پاکیزەش هێند چاوەڕووانی ئەم هونەرمەندە بوون کارێکیان بۆ بکات، ناچار کارەکەیان سپارد بە سنیۆریللی.

ژیانی لیۆناردۆ نموونەی چونە پێشەوەی بەهای هونەرمەندە، بێگومان خاوەنی پێگەو ستایشی تایبەت بوو لە فلۆرەنسادا بەڵام کاری بەدڵی خۆی نەدەڕۆی، بۆیە (وەك ئاماژەمان پێدا) چووە میلانۆو بوو بە نیگارکێشی نازداری تەختی لۆدڤیکۆ، ئەندازیاری جەنگی لای تشیزاری بورجا، کۆتایی ژیانیشی وەك هاوڕێو دۆستێکی ئازیزی مەلیکی فەرەنسا هێنا. گۆڕنکاری سەرەکیش لە سەرەتای سەدەی شانزەدا ڕوویدا لە میانی سەربەخۆبوونی هونەرمەنددا و چیتر هونەرمەندان جێبەجێکەری پیشەی سەرگەورەکانیان نەبوون، بەڵکو خۆیان بوونە سەری گەورە. ڤازاری دەڵێت: رافایل ژیانێکی پڕ لە شکۆمەندی گەورەو مەزنی بردۆتە سەر وەك هونەرمەندێ، کۆشکێکی تایبەت بە خۆی هەبووە لە ڕۆماو لە بەرامبەر پیاوانی گەورەی دەوڵەتدا وەستاوە. تیسیانۆ لەو شکۆمەندتر ژیاوە وەك مەزنترین هونەرمەندی سەردەمی خۆی لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی باڵادا. ناوبانگی وەك مەزنترین هونەرمەندی سەردەمی خۆی، شێوازی بەسەربردنی ژیانی، پلەو نازناوەکانی، ئەمانە گشت وەك هۆکارێك گەیاندیانە بەرزترین نێوەندی کۆمەڵایەتی. ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم (کۆنت)ی لە کۆشکی پاپەویدا پێبەخشی و ئەندامی تەختی ئیمپراتۆری بووە، هەرچۆن کردویەتە سوارەی مهمازی ئاڵتونی (Golden Spur) و کۆمەڵێك ئیمتیازی پێداوە بێ لە نازناوی خانەدان یا پیاوماقوڵ (نبیل) کە ئەم نازناوە لەوێ هەر پشتاو پشت ماوەتەوە. زۆر لە میرەکان هەوڵی ئەوەیان داوە ڕەسمیان بکات بەڵام نەیکردون، داهاتی لە ئاستی میرەکاندا بووە، مەلیك هنری سێهەم بە تایبەتی خودی خۆی سەردانی کردووە لە پیریدا. وەختێکیش لە ساڵی ١٥٧٦ بە تاعون مرد لە کڵێسای ڤیراری Frari بەوپەڕی ڕێزەوە نێژراوە.

گەر باس لە مایکل ئـەنجیلۆ بکـەین لـەم لایەنـەوە، ئـەوا گەیشـتۆتە ئاسـۆیەك بێوێنـەو لـە بالآییەکدا بووە کە دەسبەرداری هەموو نازناو و ئیمتیاز و ڕێزلێنانێك بووە. هاوڕێیـەتی پاپـاو ئـەمیرەکانی کـردووەو بەرهەڵسـتی کـردون بـە بوێریـەوە، نازناوەکـانی کۆنـت و ڕاوێژکـاری دەوڵەتو سەرپەرشـتیار (مشـرف)ی پایـەوی ڕەت کردۆتـەوە، تەنـها نازنـاوێك کـە پـێی نـاوزەد کرابێت مایکل ئـەنجیلۆی ئیلاهـی بـووە. پـێی نـاخۆش بـوو بـە پەیکەرسـاز یـاخود نیگـارکێش ناوبرێت. وتویەتی من مایکل ئەنجیلۆ بـۆ نـاروتیم نەکـەم و نـەزیاد، بـە مێشـك نیگاردەکێشـم نەك بەدەست. ئەو یەکەم نمونەی هونەرمەندی نوێ بووە لە گۆشەگیریدا. جوڵەیـەکی جنیانـە جوڵاندویەتی یاخود وەك خۆی وتویەتی دەستێك لە دنیـای جنـەوە دەمجوڵێنێـت. هەسـتی بـە بەرپرسیاریەکی قوڵ و تایبەت کردووە بەرامبەر بە بەهرەکانی خۆی.

هەموو ئەم گۆڕانکاریو ڕێزلێنانە لە جیهانی دەرەوە بۆ هونەرمەندو نواندنـی هـەموو ئـەو هەڵوێستە بەرزو بوێرانەش لە جیهانی هونەرمەندەوە بە ئاراستەی دەرەوەی خۆی، ئازادبوونی کامڵی بۆ یەکەمین جار بۆ هونەرمەند بەدەست هێناو ئـەو بلیمەتیـە دەرکـەوت کـە سـەردەمی ڕێنیسانسی پێ دەناسـرێت. گۆڕانکـاری بنـەڕەتی ڕوویـدا لـە سـتایش کردنـی هونەرمـەند خـۆی نەك بەرهەمەکانی لەلایەن خەڵکی و دەسەلآتەوە، چون پێشتر سـتایش کردنـی کـاری هونـەریی لەسەر ڕەت کردنەوەی هونەرمەندەکە بوو دواتر ئەم ستایشە بە هێندایی کارە هونەریەکە بەر پەروەردگاری هونەرمەندەکە دەکەوت (واتـە ئـەو پیـاوە گەورەیـەی هونەرمـەندە کـە کـاری بـۆ ئـەکات). بـەڵام لـەوەودوا بـە پێچەوانـەوە کەوتـەوە، پەروەردگارەکـەش بـە ستایشـی هونەرمەندەکـەوە دەنـازی نـەك بەخۆیـەوە بنـازێ لـە گـەورەیی هونەرمەندەکەدا، ئـەویش بـە شانو باڵی هونەرمەندەکەدا هەڵیدەدا چـون چیـتر هونەرمـەند مایـەی پیاهـەڵدای ئـەو نـەبوو. شارلی پێنجەم نوشتایەوە تا فڵچەکەی تیسیان هەلگرێتەوە بۆی، بیروباوەڕی وابوو کە ئاسـاییـیە زۆر ئیمـپراتۆر لـە خزمـەتی هونەرمـەندێکی گـەورەی وەك تیسـیان دا بێـت. ئـاوا ئەفسـانەی هونەرمەند کامڵ بوو.

## هونەری ڕێنیسانسی زێڕین لە دەرەوەی ئیتالیا
## (ئەڵمانیا- هەرێمی فلاندەر- فەرەنسا)
## ئەڵمانیا

هونەری ئـەڵمانی تـا سـاڵی (١٥٠٠) هـەر لـەژێر کاریگـەریی هونـەری فیلمنکـیدا بـوو، کـەمتر پرێشکی ڕووناکی هونەری ئیتالی پێگەیشت کە لە هـەرێمی تۆسـکانیادا لـە پەرەسـەندندا بـوو، ئەم حاڵەتە نەك هـەر بـۆ هونـەری ڕێنیسـانس لـە ئـەڵمانیادا بـەڵکو بـۆ هـەموو ئـەو وڵاتانـەی سەروو چیاکانی ئەلپ کەوتبوون ڕاست بوو. بەڵام بە تایبەت ئەڵمانیای پرۆتستانتی کە لەسەر دەسـتی مـارتن لۆسـەردا سـاڵی ١٥١٧ چـووە سـەر ئـەم ڕێبـازە ئاینـیـە، دەتوانـین بڵێـین دەق بــە پێچەوانـەی بـاری ئـاینی و کۆمەڵایـەتی ئیتالیـای کاسـۆلیکـیەوە بـوو، لەبەرئـەوە هونــەر لــەم وڵاتـەدا نـەیتوانی هاوشـانی هونـەری ئیتـاڵی ڕابوەسـتێت و گەشـەبکات، هونـەری ئــەڵمانی گــەر نەیتوانیبێ بە ئاراستەی ئاین ڕێ بکات ئەوا بە دڵنیاییەوە بابەتـە کۆمەڵایەتیـیەکانی پێکاوە. چـون بیروبـاوەڕی پرۆتسـتانتی لۆسـەر خوازیـاری جیابوونــەوە بــوو لــە کڵێسـای کاسـۆلیکی و پاکردنەوەی کڵێسەکان لە تابلۆو پەیکەرەکان، ئەمـەش هۆکـارێکی کاریگـەر بـوو بـۆ دواکـەوتنی هونەری ڕێنیسانس لەم وڵاتەدا.

ئەڵمانیا وەك هێزێك کە گرنگیـیەکی خۆی هەبێت لە ئەوروپای مەسیحیەتدا لە سـەردەمی شارلمانەوە دێتە کایەوە، بەڵام لە دوای ئەم مەلیکە بەتوانایە وڵات پارچەپارچەی چەند دیوکێك بوو لەژێر فەرمانڕەوایی نەوەکانیدا، بەڵام لە سەردەمی فـەرمانڕەوا ساکسـۆنیەکاندا کـە دواتـر دێنـە سـەر تـەخت بـۆ جـارێکی تـر وڵات کرایــەوە یــەك پارچــە و چــەند خــێزانێك کەوتنــە فەرمانڕەوایی کردنی وەك خێزانی فرانکیـا و هۆهنسـتاوفن و هابسبرج کـە لـە کۆتـایی سـەدەی سـیانزەوە دەسـتی بـە فـەرمانڕەوایی کـرد. هـێزی ئـەم خێزانــە لــە ســەردەمی مــەلیك شــارلی پێنجەمدا ١٤٨٣-١٥٥٦ بەدەرکـەوت. ئـەدەب و هونـەریش گەشەسـەندنی لـە سـەردەمی ئیمـپراتۆر مکسمیلیان دا بەخۆوە دی، هەرچۆن بزاڤی ڕیفۆرمی ئـاینی لـە نێـوان سـاڵانی (١٥٢٠ بـۆ ١٥٥٥)دا دەرکەوت لەسەر دەستی فەیلەسوفی پروتستانی مارتن لۆسەردا (١٤٨٣-١٥٤٦) وەك پێشـتر ئاماژەمان پێدا ئەم بزاڤە دەستی کرد بە تابۆکردنی وێنـەی شـێوەکان لـە جێگـە ئاینیـیەکاندا، جوڵەی چاپ و پەخش کردن لە شارەکانی ئەڵمانیاو سویسراو نورمبرگ و بازل دا بڵاوبۆوە.

زۆرێکی ویست تا هونەرمەندانی ئەم وڵاتە بتوانن سود لە هونەری فلۆرەنسی وەرگرن لە کێشانی نیگاری تابلۆکانیاندا.

## تەلارسازی:

تەلارسازی ئەڵمانیای دابەشی کاریگەری دوو شێواز بووە کە ئەوانیش شێوازی هونەری غوتی و تەرزی رێنیسانسی نوێیە لە فلۆرەنسا. کاریگەری دوهەمیان زیاتر بەشی خواروی ئەم وڵاتەی گرتەوەو سیماکانی لە تەلارەکانی شاری (ئۆگسبورگ)دا لە ساڵی ١٥٠٩وە دەبینین، هەروەك چۆن کاریگەری ئەندازیار (بلادیو) بەدەردەکەوێت لە بینای ئەنجومەنی شاردا کەلە میانی ساڵانی ١٦١٥-١٦٢٠ دروست کراوە. هەرچەندە ئەم شارە بێبەش نەبوو لە پارێزگاری کردن بە تەرزی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، بەڵام توخماتە ئیتالیەکان پێدزکێیان کردۆتە ناوی وەك لە کۆشکی (بیتر)دا دەرئەکەوێت کە ساڵی ١٥٠٦ بوونیات نراوە.

شاری میونخ بێکاریگەریی رێنیسانسی ئیتالی نەبوو، لە کڵێسای پیرۆزمەند میکائیل دا (١٥٨٣-١٥٩٧) بە ئاشکرایی دیارە کە لەژێر کاریگەریی کڵێسای (یەسوع)دا بووە، هەرچۆن گەر بۆ تەرزی رێنیسانس بگەڕێین لە هەرێمی ساکسۆنیادا، کۆشکی (ویسمار Wissmar) لە دیارترین نمونەکانی خۆیمان پیشان دەدات.

## پەیکەرسازی

هونەری پەیکەرسازی لە ئەڵمانیادا سەرەتاکەی بەدوا کاریگەریەکانی شێوازی غوتی دەست پێدەکات ئەویش لە پەیکەری ریلیفی و نەخشی سەر رووی کڵێساو کۆشکەکاندا، هەرچۆن ئەم کاریگەرییە جێدەستی لەسەر پەیکەری گۆڕەکانیش بەجێهێشت.

هەرچی کاریگەری تەرزی رێنیسانسیشە دواتر لە کارەکانی پەیکەرسازان (فلوتنر Flotner) لە شاری نورمبرگ (کاریگەری ڤینیسیا). (ئەلێکسندەر کولین A. Colyn) لە هیدلبێرك (کاریگەری فلمنك). هەرچۆن ئۆگزبرگ و میونخ بوونە دو سەنتەری تەرزی رێنیسانسی ئیتالی.

## نیگارکێشان

ژمارەیەکی باش لە نیگارکێشان بەشداری رێنیسانسی هونەری نیگارکێشانی ئەڵمانیان کرد. لە دیارترینیان گرونڤاڵد و دیورەر کە ناوبانگی ئەوان پێشبڕکێی ناوبانگی هونەرمەندانی رێنیسانسی زێڕینی دەکرد، هەرچۆن لەم بزاڤەدا هونەرمەندانێکی تر بە پلە دوو دێن وەك کراناش.

لێهاتویی نیگارکێشە ئەڵمانیەکان لە نیگارە چاپ کراوەکاندا دەردەکەوت کە لەسەر قاڵبی هەڵکەنراوی تەختەو بەردو مس چاپیان دەکرد. ئەم هونەرە (واتە هونەری گرافیك) بە

تایبەت لە ئەڵمانیادا گەشەسەندو بوو، هونەرمەندەکان جوانترین تابلۆ چاپکراوەکانیان بەدی هێنا بە وردەکاریەکی بێکۆتاوە.

### ماتیاس گرونڤالد Mathias Grunivald (١٤٧٠-١٥٢٨)

ئەم هونەرمەندە لە شاری فورزبرج پەروەردە بووە و لە نێوان شارەکانی ئەڵمانیادا لە گەڕاندا بووەو بە هەژاری ژیاوە. چووەتە شارەکانی فرانکفۆرت و هال. لەم دوا شارەشیاندا کۆچی دوایی کردووە. هونەری غوتی سەرچاوەی سروش وەرگرتنی ئەو بووە چون لە خواستێکی سۆفیانەدا ژیاوە، عاشقێکی تواوە بووە لە خۆشەویستی مەسیحدا. لەش ئەو گرنگی پێدانە هونەریەی نەدەدی بە خۆوە کە لەلای هاوسەردەمە ئتیالیەکانی هەبوو. ئەو زیاتر جەستەی بۆ نمایش کردنێکی درامی مەبەست بوو. لەو توخمانەش کە جێی گرنگی پێدانی ئەو بوو ڕەنگ و ڕووناکی بوو کە پێکەوە لە بەکارهێنانێکی لێزانانەدا توانای ئەفراندنی کەشێکی ئەفسانەیی پێ دەبەخشی بە بابەتەکانی.

خواستی ئاینی گرونڤالد مانایەکی ڕۆحانی دەبەخشی بە هەر شتێ کە بەرجەستەی دەکرد لە بازنەیەکی مەرگەساتاویدا ئەمەش بۆ خۆی شێوازێك بوو دەق بە پێچەوانەی هونەری ئیتالیەوە.

لە دیارترین کارەکانی تابلۆیەکی گەورەیە کە بۆ قوربانگەی دێری شاری (ئیزنهایم)ی لە هەرێمی ئەلزاس دروست کردووە. لە ساڵانی (١٥١٠-١٥١٥) کە تیایدا چەند بابەتێکی ئاینی بەرجەستە کردووە، وەك لە خاچ دانی مەسیح کە بە شێوازێکی واقعیانە ئازاری مەسیحی بەرجەستە کردووە.

### ئەلبێرت دیورەر (Albrecht Durer) ١٤٧١-١٥٢٨

یەکێك لە مەزنترین هونەرمەندە جیهانیەکان بەنێو هونەرمەندانی ئەڵمانیاو سەدەی شانزەدا ئەلبێرت دیورەرە. هونەرمەندێکی نیگارکێش و خاوەن چەندین بیردۆز بووە (بە تایبەت لە زانستی بەربینەدا) و ئەندازیارو لەسەرو هەموشیانەوە مرۆڤێکی خاوەن ڕۆشنبیریەکی جیهانی بە ئاگا بووە، کە بە نیازو ویستی خۆیەوە بەشداری لە دەمەتەقێ و دیالۆگەکانی سەردەمی خۆیدا کردووە، توانی لێزانانە بیروباوەڕەکانیان یەکخا لەبەرهەمەکانیا بە تایبەت لەو بەرهەمانەیدا کە لەسەر تەختە هەڵیکەنیون واتە چاپە گرافیکیەکان و ژمارەیان دەگاتە زیاد لە هەزار بەرهەم. دیورەر لە شاری "نورمبرگ" لە دایك بووەو باوکی کابرایەکی زەڕەنگەر بووە، هەر هەستی بە توانای کوڕەکەی کرد ناردیە ستودیوی فۆلجمۆت کە لە هەڵکەندن و نیگارکێشاندا دەستێکی باڵای هەبووەو، سێ ساڵ دیورەر لای ئەم مامۆستایەی

ماوەتــەوە، بەماوەیــەك دوای ئــەوە چووەتــە (ئاوگســبورگ) بــۆ ســـودوەرگرتن لــە شــێوازی هەڵکەندنی هونەرمەند (نشونجاور). بە مەبەستی شارەزابوونی زیاتریش لە نیگارکێشاندا رووی کردە ڤینیسیا لە ساڵی ١٤٩٤داو لەوێ جیوڤانی بیللینی ناسی و بە شێوازی توێژینەوەو زانستی توێکاری لە لەشی مرۆڤدا لەو شارە سەرسام بوو. ساتێ گەڕایەوە ئەڵمانیا لە شاری نورمبرگ جێنشین بوو بۆ ماوەی نێوان ساڵانی (١٤٩٥- ١٥٠٦) ستودیویەکی تایبەتی بۆ خۆی داناو دەستی کرد بە لێتوێژینەوەو دانانی چەند کتێبێك لەسەر زۆر بابەتی وەك ئەندازەو بیرکاری و زانستی رێژە (نسب). بەشێکی زۆر لە لێکۆڵینەوەکانی بۆ زانستی بەربینە تەرخان کرد. هەوڵیدا ئەو وتەیەی ئەلبێرتی بسەلمێنێ کە دەڵێ "تابلۆ پەنجەرەیەکە بەشێك لە سروشتی لێوە دەبینرێ". بۆ ئەم مەبەستەش چەند ئامێرێکی دروست کردو تاقیکردنەوەکانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەتا ئەمڕۆش هەر کتێبێ لەسەر بەربینە بنووسرێ پەنا بۆ ئەو چەند رێگەیەی دیورەر دەبرێت تیایدا.

ستۆدیۆکەی ببوە بنکەی جموجۆڵی هونەرێك کە بایەخی بە مرۆڤایەتی دەدا، هەرچۆن سەرسام بو بە بیروباوەڕەکانی مارتن لۆسەر چون ئاین لەلای ئەم تەنها سروت و رێساکان نەبوو بەڵکو رۆحێکی ناوەکی و هەڵوەداییەك بوو بەرەو رەهایی. تەنانەت ئەم کەشە پڕکێشە گەرمە کە لۆسەری تیا ژیا لە تابلۆکانی ئەم هونەرمەندەدا رەنگی دایەوەو خۆشی یەکێك بوو لە لایەنگرانی ئەو بزاڤەو ناوبانگی تەواوی لەم بارەیەوە پەیداکرد وەك هونەرمەندێکی گەورە لە هەڵکەندن و چاپکردن و نیگارکێشاندا بە جۆرێ کە ئیمپراتۆر مەکسملیان کردی بە نیگارکێشی تایبەتی خۆی.

لەم قۆناغەیدا دیورەر سەرسام بوو بە شێوازی جیوڤانی بیللینی لە نیگارکێشان و بەرجەستەکردنی وێنەی کەسایەتیدا. کارەیەك لە دوا یەکەکانی ئەم ماوەیەی کە لە رەنگی ئەکواریلن وەك تابلۆی (تیرۆل) لە مۆزەی ئاشمولیان لە ئۆکسفۆرد. لەو تابلۆیەشدا کە بۆ چەند کەسایەتیەکی ئەنجامدا نمایشێکی زیندوی سنوربەزێن لە رووخسارو سیمای کەسایەتیەکاندا دەنوێنێت. ئەم تابلۆیە لە دوا گەشتەکەی کراوە بۆ وڵاتانی فلاندەر.

بێهاوتاترین بەرهەمەکانی بەو بەرهەمانە ناوزەد دەکرێت کە هەڵکەندنە لەسەر کانزا یا تەختە، تیایدا بەرجەستەی گشت رێڕەوی هونەریی خۆی کردووە تا باڵا بوون. کۆمەڵێ سەرچاوە وزەیان بەم کارانەی دەبەخشی وەك خواستی مرۆڤایەتی و قوڵاییە ئاینییەکانی و زیندویەتی لە ئەنجامدان و کلتوری غوتی، کە لە پێکهاتەو هێڵە بەرزو نزمە زاخاودراوەکانیدا بە دڵەڕاوکێو تێکچونێك کە بە ئاراستەی دەرچون ئاراستەمان دەکات بەدیار دەکەون.

دیورەر نمونەو هاوتای داڤنشی بوو لە ئەڵمانیادا ئەو کارانەشی کە بەجێی هێشتن لە بە بەهاترین کلتوری نەتەوایەتی دادەنرێت لەو وڵاتەدا لە سەدەی شانزە.

گەر سەرنجی کاروبەرهەمەکانی بدەین و بمانەوێت لێیان بدوێین ئەوا بە کارە چاپکراوە گرافیکییەکانی دەست پێ دەکەین و لە دیارترین تابلۆکانی ئەم کۆمەڵە کارە تابلۆی (چوارسوار)ە، هونەرمەند لەم تابلۆیەدا گیروگرفتە ڕامیاری و ئایدۆلۆجیەکانی ئەو سەردەمەی لە ڕووانگەی خۆیەوە نەخشاندووەو پەیامێکی هێماگەرایی ڕاگەیاندووە لە بەرجەستە کردنی چەند کەسانێکی ناسراوی مێژوییەوە. ئەم بەرهەمە چوارلایەنی دەردەکانی کۆمەڵە [دەرد (تاعون)، جەنگ، برسێتی، مەرگ] لە هەمان کاتیشدا هێمای دادپەروەری پیشان دەدات لە وێنەی ئیمپراتۆری لاودا کە بە ئەسپەکەیەوە تەرازویەکی گرتووە بە دەستەوەو سەر هەموو شتێك کەوتووەو خەڵکی چاوەڕووانی ڕزگاربوونی لێدەکەن.

مردنیش کە بە کابرایەکی پیری لاواز پیشان دراوە، شەنێکی بە دەستەوەیە فەرمانڕەوای ناوەتە ژێر ئەسپەکەی و کەوتۆتە ناودەمی ئەژدیهایەکەوە کە ئاماژەیەکە بۆ دۆزەخ. ئەم ڕووداوەو چەندان ڕووداوی تری بەرجەستەکردووە کە لە ئەندێشەی خەڵکییەوە وەرگیراون.

تابلۆی ئادەم و حەواش نمونەی کاریگەری شێوازی هونەری ئیتالیە لە دروست کردنی لەشی ڕووتدا کە کارێکی گرافیکییەو بەهرەمەندی و بلیمەتی دیورەریش زیاتر لە ئیشە هەڵکەنراوەکانیدا دەرئەکەوێ وەك لە تابلۆ زەیتی و ئاوی و هێڵکاریەکانی، لەم جۆرە کارانەدا توانیویەتی تا ئاستێکی بەرز بەسەر تەنگ و چەڵەمەی شێوەو ڕووبەرو ڕووناکیدا سەرکەوێت بە شێوازێك کە تا ئەوکاتە کەس پەی پێ نەبردبوو، ئەم توانایەش بە ڕوونی لە تابلۆی چاپکراوی (سوارو مردن و شەیتان) دا دەرئەکەوێت، کە وێنەیەکی ڕاستگۆی ئەو سەردەمە پڕ لە ترسەی ئەڵمانیایە وەکو هەموو تابلۆکانی تری دیورەر وردەکاریەکی هێجگار زۆر و سەرسوڕهێنەر ئەبینرێ لە یەکەم سەیرکردنەوە بۆ دووەم جاریش کەلێکی ئەدەیتەوە ئەم هەموو وردەکاری و ڕێك و پێکیە لەسەر تەختەش هەڵکەنراوە ئەوەندەی تر دەکەویتە سەرسامییەوە.

دیورەر وەك مایکل ئەنجیلۆ دوو تاکە هونەرمەندن کە وێنای کارەکانیان بە تەواوەتی کردووە پێش ئەنجامدان و بە کۆتایی گەیشتنی، دیورەر دەڵێت ئەو کارەی بە نیازم دەستی بدەمێ ئەوا سەد لەسەد بەبێ هیچ گۆڕانکاریەك بەدی دەهێنم ئەنجامەکە دەق وەك خەیاڵەکەمە کە پێشتر بۆ تابلۆکەم وێناکرد.

هێزو توانای ڕەنگ لەلای دیورەر شتێکە ناکرێت فەرامۆش بکرێت، ئەویش لەو تابلۆیانەدا بەدەردەکەوێت کە بە ڕەنگی زەیتی دروستی کردون وەك ئەو تابلۆیانەی بۆ وێنەی خودی خۆی تەرخانی کردون، تابلۆی (چوار وتوویژ کەرەکە)ش نمونەیەکی تری ئوستادی ئەم هونەرمەندەیەو پێشکەشی (ئەندامانی یاسادانانی نورمبرگ)ی کرد. ئەم چوار کەسە نمونەی مرۆڤایەتیەکی قوڵ و ژیریەکی نمونەیین کە تاقیکاری مرۆڤ بەدی دەکرێت لە ڕووخساریاندا.

لە زۆربەی زۆری تابلۆکانی دیورەردا هەست بەو شێوە ترسە دەکرێت کە مرۆڤ لەژێر ڕکێفی ڕژێمێکی دەرەبەگیدا هەیبووە کە ئەو وردەکاریە ترسناکە ئەبینی لە تابلۆی (شەهید بوونی دە هەزار)دا کە دیمەنێکی هەموو جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیەك پیشان دەدات، ئەم لایەنە بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

بەرهەمە گرافیکیەکانی دیورەر ئینتیباعێکی هێجگار مەزنی ئەو خەڵکەی سەدەی شانزەهەمین دروست دەکات، کە پڕ بووە لە هەڵچونی شۆڕشگێڕانە، لە پاشان لێکۆڵینەوە زانستیيە هونەریەکان ئەو هێمایانەی ڕوونکردەوەو ئەم بەرهەمانەی دیورەری بە یەکەمین شوێنەواری شۆڕشگێڕانە دیاری ناساند، نەك تەنها لە ئەڵمانیا بەڵکو لە هونەری سەرانسەری ئەوروپادا، بۆیە مارکس کە یەتە سەر باسی سەردەمی ڕاپەڕین و ناودارانی ئەوکاتە دیورەر دەگەیەنێتە پاڵ پلەی خاوەنی شاکاری مۆنالیزاو ئەڵێ: لیۆناردۆ داڤنشی، مارتن لۆسەر، ئەلبێرت دیورەر و میکیاڤیللی چوار فیلەتەنی سەردەمی ڕێنیسانسن].

هەندێ جار وردی و بەتوانایی و سەلیقەی ئەم هونەرمەندە تێکەڵ بە ئەفسانە دەبێت: بۆیە ئەڵێن کە بۆ جاری دووەم و دوای بەدیهێنانی ناوبانگێکی مەزن سەر لە ئیتالیا ئەداتەوە، هونەرمەندانی ئەوێ داوای پەڕەموچی لێئەکەن وەك دیاریەکی پیرۆز، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە پەڕەموچەکانی دیورەر خۆی نەبێت هیچ شتێك ناتوانێ بەو شێوەیە وێنەی زوڵفی مرۆڤ بکێشێت کە دیورەر لەم بوارەدا ناوبانگێکی بێپایانی هەبووە.

### لۆکاس کراناش (L. Cranash) ١٤٧٢-١٥٥٣

ئەم هونەرمەندەش لە پەیڕەوکەرانی هزری مارتن لۆسەر و یەکێك بووە لە هاوڕێ خۆشەویستە نزیکەکانی. لە هەرێمی ساکسۆنیا پەروەردە بووەو چاودێری کراوە لە لایەن تەختی پاشایەتییەوە و بە دامەزرێنەری قوتابخانەی ساکسۆنی دەژمێررێت. شێوازی کارکردنی سیمای ئەڵمانی تیا بەدی دەکرێ بە مۆرکێکی لادێی ئەدەبی و ئەفسانەیی. بابەتە ئەفسانەییەکان جێی گرنگی پێدانی بووەو لە بەرگێکی ئەڵمانی نەتەوایەتیدا بەرجەستەی دەکردن وەك تابلۆی پیرۆزمەند جیرۆم لە کتێبخانەکەیدا، لە پاڵ ئەم خواستی کارکردنەیدا

ناوبانگی بە نیگاری دەموچاوو ئافرەت بە ناوچەوانێکی بەرز و چاوی یابانیـیەوە دەرکردبوو. هەرچۆن نیگاری کەسایەتیـیەکانی لە فەرمانڕەواو گەورەپیاوانی دەوڵەت دروست کردووە. لە تابلۆ دیارەکانی (فەرمانڕەوایی پاریس)ە کە ساڵی ١٥٣٠ دروستی کردووەو کراناش بەوە ناسراوە کەتابلۆی ئافرەتی ڕووتی بۆ ماڵی فەرمانڕەوایان دروست دەکرد، وەك تابلۆی (پەریەکە) کە ساڵی ١٥١٨ دروستی کردووە، هەروەها تابلۆی فەرمانڕەوایی پاریس هەمان بابەت لەخۆ دەگرێت. کە تیایدا پاڵەوانەکانی پاریس لە جلوبەرگی سەربازیدا لەگەڵ خواوەندی جوانیەکانی گریك لە پشتینەیەکی سروشتیدا، مۆرکی ئەڵمانی نەتەوەیی تیا زاڵە. سەرەڕای بەهرەمەندی و بەتوانایی کراناش لە بەرجەستەکردنی جەستەی ڕووتی ئافرەتدا و تەنانەت دیورەر لە جەستەی حەوادا، بەڵام ئەڵمانیەکان نەگەیشتنە پلەی سەرکەوتویی هونەرمەندە فلاندەری و ئیتالیەکان.

## هانز هۆڵبینی کوڕ "Hans Holbein" ١٤٩٧-١٥٤٣

ئەودەمەی دیورەر کۆچی دوایی کرد هۆڵباین لە تەمەنی سیو یەك ساڵیدا بوو، وەك هونەرمەندێکی دیارو سەرکەوتوو لە لەندەن دەژیا. لە شاری ئۆگسبرگ (کە سەنتەرێکی بازرگانی جیهانی بوو لە خواروی ئەڵمانیا) لەسەر دەستی باوکی (هانس هۆڵبین)ی باوك فێری نیگارکێشان بوو توانی لە تواناى ئەویشی تێپەڕێنێ، هەربۆیە لەو خێزانە هونەریەی ئەودا هیچ کامێکیان بەهێندایی ئەم ناوناوبانگیان دەرنەکرد. خاوەن شێوازێکی وردەکارو پڕ سەلیقە بوو خەریکی هاتوچۆ بووە لە نێوان وڵاتانی سویسرا و فەرەنسادا.

تەمەنی دوانزە ساڵ بوو چووە بازل لە سویسرا ساڵی ١٥١٥، ناوبانگی لە ساڵی ١٥٢٠دا دەرکرد وەك شارەزایەکی دیزاینی قاڵبی تەختەیی و نیگارکێشی وێنەی کەسایەتی. لەم شارەدا ئارازمۆسی ناسی کە زانایەکی ڕۆتەردامی بوو لە لایەنگرانی بزاڤی هیومانیزم بوو. تابلۆیەکی کەسایەتی تایبەتی بۆ کرد ساڵی ١٥٢٣ بە ناونیشانی (ئارازمۆس لە ڕۆتەردامەوە) سەرباری سەرکەوتویەتی لە بازل بەڵام بەجێی هێشت و بەرەو فەرەنسا کەوتەڕێ ساڵی ١٥٢٤ بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە مەلیك فرانسوای یەکەم پەروەردگاری هونەر لەو سەردەمەدا. چیتر ئەو ئارەزووەی نەما بەرەو بازل بگەڕێتەوە لەبەر ڕوودانی بزاڤی پرۆتستانتی تیایدا. ساڵی ١٥٢٦ چووە ئینگلترا لەگەڵ نیکارکێشە تایبەتەکەی سێر (تۆماس مۆر)دا دانیشت و چەندان نیگاری بە دەباشیر بۆ ئەندامانی خێزانەکەی دروست کرد. ساڵی ١٥٢٨ ساتێ گەڕایەوە بازل بزاڤی پرۆتستانتی لە هەڕەتی دوژمنایەتی کردنی نیگارکێشاندا بوو. هەربۆیە لە ساڵی ١٥٣٢ بۆ جارێکی تر گەڕایەوە لەندەن، هەندێ تابلۆی کەسایەتی بۆ پیاوانی کۆشك دروست کرد

بەسەرکەوتوێتیەکی واوە کە ڕێی بۆ خۆش کرد پلەوپایەی نیگارکێشی تایبەتی هونری هەشتەمی پێببەخشن لە ساڵی ١٥٣٦. کۆمەڵێ تابلۆی کەسایەتی بۆ مەلیك هیونری و خێزانەکەی دروست کرد کە وردەکارییەکی ڕوون و ئاشکرای تیا بەکارهێناوە لە تۆمارکردنی نەخش و وردەکاری جل و بەرگی شاهانەدا و گوزارشت لە مەزنی و هێزو توانای ئەم مەلیکە بکات.

بە مەرگی ئەم هونەرمەندە کۆتایی هات بە ماوەی یەکەمی هونەری ڕێنیسانس لە بەشی سەروی ئەوروپادا، چون ماوەیەکی درێژی ویست تا نیگارکێشی مەزنی تری تیاهەڵکەوێت. قوتابخانەی ئەڵمانی نەتەوەیی ڕوو لە کزی بوو لە ساڵی ١٥٣٠ وە ئەوکاتەی شێوازە ئیالییەکان دەستیان گرت بەسەر هونەری نیگارکێشاندا لە نورمبرگ، کە کاری قوتابیەکانی دیورەر ئاوێنەی ئەو کاریگەریەن. هەرچۆن کاریگەری قوتابخانەی ڤینیسی لەسەر شاری ئۆگسبرگ ڕەنگی دایەوە لەو سەردانانەوە کە تیسیانۆو چەند هونەرمەندێکی تر کردیان بۆ ئەو شارە. هەرچۆن لە سەدەی شانزەو حەڤدەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە فەرمانڕەوا ئەڵمانیەکان بەکارهێنانی ئەو نیگارکێشانەیان لەلا باشتر بووە کە سەر بە تەرزی مانێریزمن.

## هەرێمی فلاندەر

### پێشەکییەکی مێژوویی:

ئەم وڵاتە بوژانەوەو جوڵەیەکی ئابوری گەورەی بەخۆوە دی لەگەڵ گەشەسەندنی پیشەسازیدا، شاری ئەنتۆرب لە گرنگترین بەندەرەکانی وڵاتانی فلاندەر بوو، ئەمە لە ساتەوەختێکدا کە لە گرنگی شاری بروج دادەبەزی، شاری ئەمستردام لە چونە پێشەوەو دەرکەوتندا بوو، سەراپا وڵات ئەودەمە لەژێر قەڵەمڕەوی خێزانی هایسبرج فەرمانڕەوایی مەلیکی نەمساوی شارلی پێنجەمدا بوو ساڵانی ١٥٠٦-١٥٥٥ کە مەلیکی ئیسپانیش بوو. لە میانی فەرمانڕەوایی فیلیبی دووەمدا (مەلیکی ئیسپانیا) یەکێتییەك لە وڵاتدا دروست بوو کە حەڤدە ویلایەتی لەخۆگرتبوو بە پایتەختی برۆکسل. ساتێکیش خێزانی پاشایەتی کاسۆلیکی ویستیان بزاڤی پرۆتستانتی کە لە ویلایەتەکانی سەرودا (لە هەرەتی بەهێزی و بڵاوبوونەوەدا بوو) سەرکوت بکەن، شۆرشێکی خوێناوی توندوتیژ لەم ویلایەتانەدا دەستی پێکرد دژ بە فەرمانڕەوایەتی بێگانە، ئەمەش بووە ئەنجامی جیابوونی حەوت ویلایەتەکەی سەروو لە ساڵی ١٥٨٤-١٥٨٥ و پێکهێنانی کۆمارێکی سەربەخۆ کە دواتر بە ناوی (هۆڵندا)وە ناسرا، بەڵام دە

ویلایەتەکەی خواروو لەسەر ڕێبازی کاسۆلیکی مایەوە سەر بە تاجی ئیسپانی کە دواتر بە ناوی (بەلجیکا) ناسرا.

سەرباری ئەوەی شۆڕشە ئاینیو ڕامیاریەکان ڕەنگە ببنە هۆکاری کارەسات بەسەر هونەردا بەڵام هەستانێکی هونەری بەخۆوە دی ئەم ناوچەیە، لە هەموو بارو مەرجێکیشدا نەوەستا بە تایبەت لە هۆڵندا لە ماوەی زۆر ترسناك و نەهامەتی نێوان ساڵانی (١٥٥٠-١٦٠٠). هەرچۆن هونەرمەندانێکی کارامەو مەزن دەرکەوتن لە هونەری نیگارکێشان و هونەرەکانی تردا، وەك "باتنیە، ڤان لیدین، مابیوزو خێزانی بروگل)... هتد. کە ئەم هونەرمەندانە ڕێخۆشکەر بوون بۆ زەبەلاحەکانی هونەری هوڵندی و فیلمنکی کە دواتر هاتنە گۆڕەپانی هونەرەوە.

## نیگارکێشان لە هۆڵندا:

نیگارکێشان لە ویلایەتەکانی سەرودا تێکەڵی دوو شێوازی جیاواز بوو، شێوازی ڕێنیسانسی زێڕین و، شێوازی ڕاگەیاندنانەی میللی کە لە جێی بابەتە ئاینییەکان بوو، ساڵانی ١٥٠٠ بۆ ١٦٠٠ بە ماوەیەکی زەمەنی یەکلاکەرەوە دادەنرێت بۆ بابەتە دنیاییەکان (دیمەنی سروشتی-سروشتی وەستاو- بابەتە میللییەکان) کە هەرچی دواتر لە سەردەمی بارۆکدا گەشەسەندنی زیاتری بەخۆوە دی. ئەم پرۆسێسی چونە پێشەوەیە بە زنجیرەیەکی لە دوایەك بە هۆی لێهاتوویی نیگارکێشانێکەوە ڕوویدا کە لەو ماوەیەدا دەرکەوتن. لە سەدەی پانزەدا دەبینین دیمەنهایەکی سروشتی و میللی واقعی وەك توخمێکی یاریدەدەر لە بابەتی سەرەکیدا لای نیگارکێشەکان دەردەکەوتن. بەڵام لە سەدەی شانزەدا دەبینین بوونەتە بابەتی سەرەکی. ئەمەش لە کارەکانی بروگڵ دا کە دیارترین نیگارکێشی وڵاتەکەیەتی ئاشکرا دەبینرێ.

### پیتەر برۆگلی باوك[٢٥] (P. Brugel The Elder) ١٥٢٥-١٥٦٩

هەرچۆن بە پیتەر برۆگلی باوك یاخود پیر یا کۆن بەناوبانگە، لە دێیەك نزیك بریدا لە دایك بووە و لە بروکسل مردووە، لە دارستانی دیوك خوێندویەتی و بە بەرهەمەکانی بوش سەرسام بووە. دواتر سەردانی ئیتالیای کردووە بۆ ڕۆما و ناپۆلی ساڵی ١٥٥٢، هیومانیستەکانی ناسیوە و زانا و نووسەران، گەڕاوەتەوە ئەنتۆرب و کۆمەڵی دیمەنی سروشتی تایبەت بە ناوچەی چیای ئەلپی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە. تا لە ساڵی ١٥٦٣ چووەتە برۆکسل. لەژێر کاریگەری ئەو دیمەنانەدا تابلۆی (گەڕانەوەی ڕاوچییەکان)ی دروست کردووە.

هەرچەندە ئەو دۆستایەتی‌یەکی زۆری هیومانیستەکانی دەکرد و بەهرەمەند بوو لە چاودێری بنەماڵەی هابسبورج، بەڵام دەبینین مەیلی بەلای تۆمارکردنی ژیانی لادێیەوەیە تابلۆی (ژن هێنانی لادێیی) نمونەی ئەو کارانەیەتی ساڵی ١٥٦٥.

بروگل لەو کارانەیدا کە دەرباری بابەتە فەلسەفی‌یەکان کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بوشەوە، وەك ئەو تابلۆیەی لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنی‌دا بەرجەستەی کردووە بە ناوی (کوێر ڕێ پیشانی کوێر دەدات) یاخود کوێر پێشڕەوی کوێر دەکات کە ساڵی ١٥٦٨ نەخشاندویەتی بیرۆکەکەی لە کتێبی پیرۆزەوە وەرگرتووە.

پێویستە کارەکانی ئەم هونەرمەندە لە کاری هونەرمەندانی تر جیابکەینەوە کە هەمان ناویان هەڵگرتووە وەك برۆگلی دۆزەخی کە ١٥٦٤ بۆ ١٦٣٨ ژیاوە لەبەر ئارەزوی بۆ دیمەنی ترسناك بەرجەستەکردن وەهای ناولێنراوە.

هەرچۆن برۆگلی مەخمەڵی هەیە لە بەر جوانی و دەوڵەمەندی لە ڕەنگدا وەها ناوزەد کراوە.

برۆگل لە دوای هونەرمەندانێکی بە توانا هاتووە و لە دڵی میللەتەکەیدا جێی خۆی کردۆتەوە، بە چاوێکی کراوە و ژیری‌یەکی بە ئاگاوە سی‌و حەوت تابلۆکەی ئەنجام داوە لەگەڵ کۆمەڵی وێنەی تر دەرباری: ژیانی خۆشی و هەوڵدان، وێنەی سروشت، هێمای ئەو کێشە ئاینی‌یانەی سەراپای وڵاتەکەی گرتبۆوە لە سەردەمی ژیانی ئەودا. هونەری برۆگڵ لەم سێ خولگەیەدا دەخولێتەوە، کە دوانی یەکەمیان بە ئاڕاستەی لە دەرەوە بۆ ناوەوەیەو سێ‌هەمیشیان بە ئاڕاستەی ناوەوە بۆ دەرەوەیە. جگە لە داهێنانی برۆگڵ لە شێوازی بەرجسەتەکردندا کە ئەتوانین بڵێین تایبەتمەندێتی خۆی هەبووە تیایدا ئەوا خاڵی سێ‌هەم بەشێکی باش پێك دەهێنێت لە گرنگی پێگەی ئەو لەلای مێژوونووسان.

برۆگڵ لە ڕێی ئەو بینگە کارکردنەی هەیبووە توانی هونەر لە گومەزی کلێساکان و تاق و دیواری کۆشکەکانەوە داگرێتە ناو پێدەشتی منالی و سادەیی، ئەو لەگەڵ ژیانە سادەکاندا پەیوەست بوو وەك ژیانی جوتیارەکان لە خۆشی و ناخۆشیاندا بەشداربوو نەك هەر وەك هونەرمەندێك بەڵکو وەك شوانێکی ژیانی دەرونی ئەوان، ئەو ئەمانەی هەموو کرد پێش ئەوەی میلیەی فەڕەنسی و ڤان کوخی هۆڵندی پەیدابن. برۆگڵ بەو دوو ڕێچکەیەی ئاماژەمان پێدا کاری کردو هەستایە سەرپێ کە تا ئێستا ئەو دوولایەنە کار لە ڕێبازە هونەری‌یە مۆدێرنەکانمان دەکەن، وەك ئەوەی ئەزموونی برۆگڵ لە ئەزمونەکانی ئەم سەردەمەوە

وەرگیرابێت. هەربۆیە کارەکانی هەرچەندە کەمیش بوون بەلاَم وەك ویستگەیەکی نەمری نێو هونەر دەمێننەوە.

## فەڕەنسا:

## پێشەکییەکی مێژوویی:

ماوەیەکی درێژ فەڕەنسا هێمنی و ئارامی بەخۆوە نەدی لە نێوان سەدەی چواردەو پانزەدا، ئەوەش بە هۆی جەنگی سەد ساڵەوە، کە لە کاتی فەرمانڕەوایی مەلیك شارلی حەوتەم (١٤٢٢-١٤٦١)دا کۆتایی هات. ئەوددەمەی شارلی هەشتەمیش هات، سەردەمی خۆی بەهێرش کردنە سەرو داگیرکردنی ئیتالیاوە بردەسەر. هەرچۆن چەندان جەنگ لە نێوان فەڕەنسا و ئیتالیا ڕوویدا لە نێوان ١٤٩٩-١٥١٣ لە میانی فەرمانڕەوایی لویسی دوانزەدا کە ساڵی ١٥١٥ مرد.

وڵات ماوەیەکی پڕ ئارامی بردەسەر لە سەردەمی مەلیك فرانسوای یەکەمدا (١٥١٥-١٥٤٧) پەروەردگاری هونەرو ئەدەب، لە سەردەمی جێگرەکەشیدا هنری دووەم کە ساڵی ١٥٥٩ کۆچی دوایی کردووە. بەلاَم وڵات کەوتە ژێر لەتوپەت بوونی جەنگی ئاینییەوە (١٥٦٠-١٥٩٨) لە ماوەی فەرمانڕەوایی شارلی نۆیەم و هنری سێهەم کە تا ساڵی ١٥٨٩ وڵاتی گرتەدەست. بەلاَم بە هاتنی هنری چوارەم کە تا ساڵی ١٦١٠ وڵاتی بەڕێوە برد سەرلەنوێ وڵاتی کردەوە بە یەك پارچەو ئاوەدانی و ئارامی بۆ گێڕایەوە.

سەرباری ئەم ڕووداوە ڕامیاریە پڕ لە کێشانە، بەلاَم هونەرو ئەدەب گەشەیان سەند لە سەردەمی فرانسوای یەکەمدا کە کۆلیژی فەڕەنسای لە ساڵی ١٥٣٠ و کتێبخانەی مەلیکی لە فۆنتینبلو دامەزراند. هەرچۆن ئەکادیمیایەك بۆ شیعر و مۆسیقا لە کۆشکی لۆڤەر لە سەردەمی هنری سێهەم (١٥٧٠)دا کرایەوە. گرنگی دانیش بە ئاسەوار لە نیوەی سەدەی شانزەهەمەوە سەری هەڵدا، هەندێ سەرچاوەو دانراو دەربارەی نەخش و تەلارسازی بەدیارکەوتن.

## تەلارسازی و پەیکەرسازی

هەتا سەرەتای سەدەی شانزە تاکە تەرزی کارکردن لە فەڕەنسا لە بواری تەلارسازیدا شێوازی غوتی بوو، ئەم تەرزە نەتەوایەتییە تا ساڵی ١٥٣٠ مایەوە. بەلاَم بەرەنجامی هێرش و پەلاماری فەڕەنسییەکان بۆ سەر ئیتالیا شارەزای تەرزی تەلارسازی ئیتالی بوون لە ڕێنیسانسدا. وردە وردە کاریگەریی تەرزی ئیتالی لەسەر تەلارسازی فەڕەنسی خۆی پیشان دا بە هۆکاری ئەو

هونەرمەند و ئەندازیارە ئیتالیانەوە کە بانگهێشت دەکران بۆ فەرەنسا لەلایەن مەلیك و فەرمانڕەواکانەوە. ئەم کاریگەریە لە سەردەمی فرانسوای یەکەمەوە کەوتە پێدزکێ کردن.

لە میانی ئەم ماوەیەدا سەرنجمان بەلای هەرچی زیادبوونی چالاکی هونەری تەلارسازی فەرەنسیدا دەرووات، لە بینای کۆشکی مەلیك و ئەمیرەکانەوە کە لە ڕۆخی شارەکانی فەرەنسادا بوونیات دەنران. ئەم کۆشکانە هەندێکیان تەرزی بنیات نانیان تێکەڵاوێك بوو لە چەند توخمێکی تەلارسازی غوتی و چەند توخمێکی تەلارسازی ئیتالی سەردەمی ڕێنیسانس. شێوازی نەخشاندنی ڕووی کۆشکەکان لەسەر شێوازی ئیتالی دەستی بە دەرکەوتن کرد لەم ماوەیەدا. نمونەی ئەم ڕوو ڕازاندنەوەیە لە کۆشکی ئیللواردا کە لە ساڵی ١٤٩٥ بنیات نراوە دەردەکەوێت، واتە لەسەرو وەختی فەرمانڕەوایی شارلی هەشتەمدا. خۆ ئەگەر سەیری کۆشکی "بلوا Blois" بکەین ئەوا باڵادەستیەکی هەرچی ڕەهاتری توخمی ئیتالی دەبینین، بە تایبەت لەو باڵەیدا کە فرانسوای یەکەم خستیە سەر لە نێوان ساڵانی (١٥١٥-١٥٢٥) ساتەوەختی فەرماندەیی وەرگرتنی.

ئەم پرۆژەیە لەلایەن ئەندازیاری فەرەنسی "سورد"ەوە ئەنجام درا بە یارمەتی هونەرمەندێکی ئیتالی. هەرچۆن گۆڕان و لاچونی کاریگەریی غوتی و سادەکردنەوەی نەخشاندن لە کۆشکی "ئازی Azay"دا ساڵی ١٥١٨ بۆ ١٥٢٧ لە ئەفراندنی هەمان ئەندازیارە.

کۆشکی "شامبور Shambord"یش کە بۆ فرانسوای یەکەم بنیات نرا لە ساڵانی ١٥٢٦-١٥٣٦ کاریگەریی تەلارسازی سەرەتای ڕێنیسانسی ئیتالی تیا بەدەر دەکەوێت لەسەر تەلارسازە فەرەنسییەکان، چون نەخشی هەڵکەنراو لەسەر دیوارەکانی وەك توخمێکی سەرەکی تەلارسازیەکە بەکارهاتووە. فرانسوای یەکەم لە ساڵی ١٥٤٦دا بڕیاری دامەزراندنی کۆشکێکی دا کە جێی کۆشکی لۆڤەری کۆن بگرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەندازیاری فەرەنسی "پێرلیسکۆت PierreLescot"ی بانگهێشت کرد کە دیزاین و جێبەجێکردنەکەی بگرێتەخۆ، بەڵام مەلیك فرانسوا کۆچی دوایی کرد ساتێ دەست کرا بە پرۆژەکە. ناچار لیسکۆت توانی بەشێکی پرۆژەکە لە سەردەمی هنری دووەمدا تەواوبکات، کارەکە کاریگەریی شێوازی کلاسیکی ڕینیسانسی زێڕینی ئیتالی بە ئاشکرا پێوە دیارە، لە ڕووکاری ڕۆژئاوای کۆشکەکەدا تێبینی بەکارهێنانی کۆڵەکەی گریکی دەکەین بۆ ڕازاندنەوەی ئەو ڕووکارە، کە بە دیوارەکەوە پەیوەستە و یەك لەسەر یەك دانراون لە دوو ڕیزی ئاسۆیدا لە قاتی یەکەمیدا، هەرچۆن کاریگەریی ئیتالی لە داڵانە کەوانەییەکاندا بە سانایی خۆی دەنوێنێت.

بەڵام قاتی سەرەوەی بیناکە ئەو ڕازاندنەوەو نەخش و نیگارانەی بۆی کراوە هیچ پەیوەستییەکی بە تەرزی ئیتالییەوە نییە، ئەم شێوازە هونەریە جێدەستی دیارترین

پەیکەرسازی فەرەنسی (چان جوچون Jean Goujon)ە. شا هنری دووەم هەمیشە بەکارخستنی هونەرمەندە فەرەنسییەکانی پێباشتر بووە لە نەخشێنەرە ئیتالیەکان، چون فەرەنسییەکان لە شێوازی ئیتالیان توێژیبۆوەو شارەزای ببوون. ئەم هونەرمەندە پەیکەرسازەش لە دیارترین کەسایەتییە هونەرییەکانی ئەودەمەی فەرەنسا ناوزەد دەکرێت بە تایبەت لە بواری پەیکەرسازیدا.

## چان جوچون (Jean Goujon) ١٥١٠-١٥٦٦

ئەم هونەرمەندە لە ناوازەترین ئەو هونەرمەندانەیە کە فەرەنسا پێشکەشی هونەری کردووە لەم سەردەمەدا، ئەو ڕێبازی ڕێنیسانسی پەیرەوکرد ڕووەو زیندوکردنەوەی کۆن، لە گەڕان و توێژینەوەکانیدا توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ لە ئەفراندنی پەیکەرسازیەکی فەرەنسی سروش لە کلتوری گریکی وەرگیراو. مێژوو هێند زانیاریمان دەرباری وردەکاری ژیانی پێنابەخشێ وەك ئەو زانیاریە کەمانەی لەسەر هونەرەکەیەتی کە وەك تاکە تیشکێکی پرشنگدار نە پێشەکی هەبێت بۆ دەستپێکردن، نە توخمهایەکی بەردەوام بوون لە دوا خۆی.

چان جوچون لە ساڵی ١٥٤٤ دەستی بە بوژانەوەی بزاڤی پەیکەرسازی فەرەنسی کرد بە هاوکاری بییرلسکو، لە دوای پێودانگ کردنی هەندێ لەو کارانەی کە تیا بابەتە ئاینییەکانی وەك هەنجەتێ بۆ بەدیارخستنی توخمە درامیەکان بەکارهێنابوو، کرا بە پەیکەرسازی تایبەتی مەلیك. دواتر هەندێ هێمای کردە پەیکەر وەك داد و سەرکەوتن و چوار وەرزەکەو بوکەکانی دەریا لە (کوڵکوڵەی داوێن پاکان)دا، ئەمانە گشت نمایشی چارەسەرێکی پەیکەرسازی دەکەن بۆ ناوەڕۆکی ئەدەبی شتەکان یاخود بەکارهێنانیان لە پێناو دەرخستنی توخمها ئیستاتیکیەکان کە ویستویەتی تایبەتمەندێتییەکانی مۆرکی فەرەنسی تیا بەجێ بهێڵێ. ئەم کارەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٥٤٨-١٥٤٩.

لە ساڵی ١٥٤٩دا دەستی دایە کارێکی زل و کەتە لە لە لۆڤەردا، دواتر دەستیکرد بە ئامادەکردنی کۆمەڵە کارەکەی بۆ روی لاسکو کە نمایشی جەنگ و ئاشتی و سەربڵندی و ناوبانگ دەکات، ئەو نمونانەی ویستی بەرگێکی پەیکەرسازی بۆ بئەفرێنێ و بەرجەستەکردنی بەدی بێنێ لە جیهانی فۆرم کاریدا.

لە ساڵی ١٥٥٠دا دەستی بە کارکردن کرد لە بینای شارەوانی پاریسدا، کارەکە بریتی بوو لە کۆمەڵێ هێما، بە داخەوە کە ئاگر بەربوونەوەی ساڵی ١٨٧١ لەناوی برد.

ئەم پەیکەرسازە شەیدای چونە نێو جیهانی هێماکان بوو، ڕۆچونێك لە گەوهەری هێماکاندا تا خۆی لە وردەکاریەکان قوتار بکات وەك پەیکەری دروێنەی ئەیلول، هەرچۆن ئەو

ڕازی ژیان لە دنیای کۆنەکاندا دەردێنێ و لە هونەرەکانی پەیکەری دیواربەندا ئامادەی دەکاتەوە و کێشەکانی ڕووناکی و پێچەوانە بوونەوەی لەسەر ڕووەکانی پەیکەرو هێڵەکانی چارەسەر دەکات، ئاسەوارهایەك جێدێڵێ کە بە ڕاستی نمایشی هونەری نەتەوەیی فەڕەنسی دەکەن.

لە دوادواییەکانی سەدەی شانزەدا پەیکەرساز "جەرمین پیلۆن G. Pilon" (١٥٣٥-١٥٩٠) ناوبانگی بە پەیکەری ئاینی دەرکرد، ئەم پەیکەرسازە لەژێر چاودێری کاترین دی میدتشی دا بوو، هەر ئەمیش هەستا بە ئامادەکاریی پرۆژەی مەزاری هنری دووەم بە یارمەتی برماتتشیو لە نێوان ساڵانی ١٥٦٣-١٥٧٠ هەرچۆن هەستا بە دروست کردنی دوو پەیکەری چەمەرانی (جنائزیی) لەسەر مەزاری شاو شاژن.

## نیگارکێشان:

هەرچەندە هونەرمەندانێکی زۆر سەردانی فەڕەنسایان کردووە لە سەرەتاکانی سەدەی شانزەهەمدا. بەڵام کاریگەریی هونەری ئیتالی لەسەر نیگارکێشانی فەڕەنسی دەرناکەوێت لە دوا ساڵی ١٥٣٠وە نەبێت. ئەودەمەی هەردوو مەلیك فرانسوای یەکەم و هنری دووەم هەستان بە چاودێریکردنی قوتابخانەی فۆنتینبلو کە هونەرمەند ڕۆسۆ و نیگارکێشی بولونی برماتتشنیو بەڕێوەیان دەبرد. لە کۆمەڵێ هونەرمەندی ئیتالی و فلاندەری و فەڕەنسی پێك هاتبوو کە بە یەکێ لە سەنتەرەکانی تەرزی (مانێریزم)ی نێودەوڵەتی هەژمار دەکرا.

## قوتابخانەی فۆنتینبلو

لە فەڕەنسادا ئەو هاوشێوەییە نەگونجا کە وڵاتانی تری ئەوروپی لە سەدەی شانزەدا بە خۆیانەوە دیان لە هەڵکەوتنی کەڵە هونەرمەندانی وەك بلیمەتەکانی فلۆڕەنساو ئیتالیا، دیورەرو هۆڵباین لە ئەڵمانیا، برۆگڵ لە فلاندەر. فەڕەنسا لە سەردەمی بلیمەتەکاندا هونەرمەندێکی وەهای نەبەخشی کە شان لە لوتکەی ئەو زەبەلاحانە بدەن. بەڵام فەڕەنسا جگە لە چوجون لە پەیکەرسازیدا خاوەنی قوتابخانەیەك بوو بۆ نیگارکێشان لەم سەردەمەدا. کە ئەم قوتابخانەیە سەنتەری ئایدولۆجیاو هونەرو کلتور بوو، سەرباری ئەو هونەرمەندانەی فرانسوای یەکەم لە ئیتالیاوە بانگهێشتی کردن بۆ فەڕەنسا وەك ئەندیا دل سارتۆو ڕۆسۆو لیۆناردۆ داڤنشی، کۆمەڵێ هونەرمەند پێگەیشتن کە هەندێ شاکاری هونەریان داهێنا.

فرانسوای یەکەم بە مۆرکی چێژی فەڕەنسیانەی خۆی ئەم قوتابخانەیەی ڕووەو گەڕان بە دوای هونەرێکی نوێدا ئاراستەکرد کە تیایدا ناسکی و بالایی و ڕۆشنبوونەوەیەکی هێمنانەی بەختەوەر بەرجەستە دەبێت. زیاترینی ئاراستەی هونەری ئەم دەمە ڕوو لە "پۆرترێت یاخود

وێنەی کەسایەتی" بوو، داهێنەری ئەم بوارەش هونەرمەند جان کلویە (J. Clouet) (١٤٨٥-١٥٤١) بوو. تابلۆکانی (کلود دی لۆران) و (فرانسوای یەکەم لەسەر ئەسپەکەی) لە دیارترین کارەکانی ئەون. کلویە سودی تایبەتی و تایبەتمەندییە هونەرییەکانی لە نیگاری مینیاتۆری سەدەی پانزە وەردەگرت، ئەمە جگە لە سودوەرگرتنی لە بزاڤی مانێریزمی ئیتالی کە ئەودەمە شەپۆلەکانی فەرەنسای گرتبۆوە.

لە دوای جان کلویە کوڕەکەی فرانسوا کلویە جێی گرتەوە کە لە سەردەمی هنری دووەم و فرانسوای دووەم و شارلی نۆیەمدا ژیاوەو لە پاریس ساڵی ١٥٧٢ کۆچی دوایی کردووە. سێ تابلۆ بەهی فرانسوا دەزانرێت ئەوانیش: تابلۆی "بیر ئۆتەی ئەجزاچی" و تابلۆی "شارلی نۆیەم" و تابلۆی "خانمێك لە گەرماودا" کە لە کۆمەڵەی ناشیونال گالێرین لە واشنتۆن. هونەری فرانسوا کلویە پێکهاتەیەکی مەزنی قوتابخانەی ئیتالی و وردەکاری و بە سەلیقەیی قوتابخانەی فلاندەری لەگەڵ ڕێبازی مانێریزم کە بە یەکێ لە ڕێبازەکانی ئەم سەردەمە دادەنرێت.

دژوارییەك ئاڵاوەتە زۆر لایەنی هونەرمەندانی ئەم سەردەمەوە و جێ نیشانەی ژیانیانی سڕیوەتەوە، هەندێ جار ئەم شاراوەییە ئەگاتە ناوی هونەرمەندەکەش، بۆ نمونە هەندێ تابلۆ دەگێڕنەوە بۆ هونەرمەندێکی نەناسراو کەپێی دەڵێن "هونەرمەندی فلور" تابۆکانیش بریتین لە: "لەدایك بوونی کیوبید" مۆزەی مترۆبولیتان نیورك، تابلۆی "سەرکەوتنی فلور" لە زیوریخ، لە کارەکانی ئەم هونەرمەندەدا ڕەنگەکانی کۆریجۆ ئاوێتەی هەندێ کاریگەریی ئیتالیەو بە مۆرکێکی ڕۆحی فەرەنسی ناسك مۆرکراوە، لە بنەماکانی پێکهاتەی ئیتالی چووەتە دەر بە ئاراستەی جۆرێك لە قوتاربوون لە دیزاین و جێبەجێکردندا کە تایبەتمەندی قوتابخانەی فۆنتبلۆی تیا نمایشکراوە.

بە پێچەوانەی هونەرمەندی فلورەوە مێژوو ناوی (ئەنتوان کارون)ی بۆ پاراستوین، ئاماژە بە ساڵی لەدایك بوونی دەدات لە ١٥٢١دا و مردنی لە ساڵی ١٥٩٩دا، لە کۆشکی فرانسوای یەکەمدا کاری کردووەو بەشداربووە لە ڕازاندنەوەی فونتبلۆدا کارون شێوازێکی هێمایی لەخۆ دەگرێ، لە کارەکانیدا کۆمەڵێك لە کەسایەتی و تەلاروباڵاخانە پێك دەگەن، هەندێ یەکەی نەخش ڕازاندنەوەش کە لە یەك دانیاندا کەشێك لە نامۆیی دروست دەبێ و یادی هەندێ ئاسەواری هونەری مۆدێرنمان دەخاتەوە لە ئاراستەیدا بۆ لێکدانێکی سریالی نێوان کۆمەڵهایەك لە توخمی جیاواز و لێك نەچوو.

هەرچەندە فەڕەنسا- لە بوونی بلیمەتانێکی نیگارکێشان بێبەش بوو لەم سەدەیەدا -بەڵام هێند نابات کە پێشڕەوایەتی هونەر دەگرێتە دەست بۆ چەند سەدەیەك.

## سەرچاوەکانی سودی لێ وەرگیراوە بۆ سەدەی شانزەهەم:

١-محيط الفنـون: عصر العبـاقرة (القـرن السادس عشـر). الاسـتاذ: بدرالديـن أبـو غـازي، دار المعارف بمصر، تأريخ: بلا.

٢-الفن و المجتمع عبر التأريخ، ارنولد هاوزر: الجزء الاول/ ترجمة فؤاد زكريا/ مراجعة احمد خاكي/ المؤسسة العربية للدراسات و النشر. بيروت. الطبعة الثانية. ١٩٨١.

٣-فنون الغرب في العصور الوسطى و النهضة و البـاروك/ نعمت اسماعيل عـلام/ دار المعـارف بمصر/ ١٩٧٦.

٤-الفن و الانسان/ الدكتور عزالدين اسماعيل/ دار القلم/ بيروت- لبنان/ الطبعة الاولى/ ١٩٧٤.

٥-موسوعة تأريخ الفن و العمارة، الفن في اوروبا من عصر النهضة حتى اليوم/ المجلد الثـاني/ الدكتور عفيف البهنسي/ دار الرائد العربي و اللبناني/ الطبعة الاولى/ ١٩٨٢.

٦-مسائل في الفن التشكيلي (مـن الفـن البدائـي الى الفـن المعـاصر)/ دكتـور كمـال محـي الديـن حسين/ منشورات اتحاد الكتاب العرب/ دمشق، مطبعة اتحاد الكتاب العرب/ ١٩٩٧.

٧-ليوناردو دي ڤنشى الرسام الخالد/ دار العلم للملايين/ سلسلة الناجحون/ الطبعة العاشـرة/ بيروت/ ١٩٨٠.

٨-ليوناردو داڤنشى/ دراسة في السلوك الجنسي الشـاذ/ سـيجموند فريـود/ ترجمـة عبدالمنعـم الحفني، المركز العربي للثقافة و العلوم/ الطبعة الثالثة/ بيروت- لبنان/ ١٩٨٢.

٩-رێنیسـانس/ د. کمـال مەزهـەر ئەحمـەد/ فـؤاد میسـری کردویـە بـە کـوردی/ چاپخانــەی الحوادث- بەغدا/ ١٩٨٤.

10- Exhibion of Old German Masters Reproductions.

## پەراوێزەکانی سەدەی شانزەهەم:

١-ڤـازاری خـۆی وەك تەلارسـاز و نیگارکێشـێ کـاری کــردووە لــە ڕۆمــاو مێژوونــووس بــووە، کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی:

"The Lives of Italian Architects, Painters, Sculptros" 1550.

٢- جگـە لـە رافـاییل کـە بـۆ ئـەم پیـاوە کـاری کـردووە هونەرمـەندان: سـۆدۆما (Sodoma) و باڵدەساری پیرۆزی (Baldassare Peruzzi) و سباسـتیانۆ دلا پیۆمبـۆ (Sebastianodel Piombo) و جولیۆرۆمانۆ (Giulio Romano) و فرانشسـکۆ پینـی (F. Penni) و جیوڤـانی دائودینـی (G. da Udini). ئەمەبێ لە هونەرمەندانێکی گەورەی تر کاریان بۆ کردووە.

٣-ئـەم بیرۆکەیـەی ئـەلبێرتی پـێی گەیشـت لـەلای ڤـترۆفیۆس، بنەڕەتەکـەی لـە واقعـدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ.

٤-(کۆرتیجیـانۆ) ئـەم وشـەیە بـە مانـای پیـاوی کۆشـك دێت، ئـەم کتێبـە لـە بـەناوبانگترین دانراوەکانی کاستیلۆنیە (١٤٨٧-١٥٢٩). ئەم بەرهەمە خاوەن شـێوازێکی نووسـینی ناسکە، تیـایدا نووسـەر بنـەمای هەڵسوکەوتی شیاو بـۆ پیـاوانی کۆشـك دادەنێـت لـەو سـەردەمەی ئەوکاتـەدا. لێرەدا کورتەیەك دەرباری بیروڕاکانی نێو ئەو کتێبە دەدوێین:

"ئەو مەرجانەی کاستیلۆنی بە پێویستی دەزانێت لە مرۆڤی کامڵدا هـەبێت لـەم جیهانـەدا هەمەجۆری بەهرەیە، واتە پێگەیشتنێکی هاویەك بۆ توانا جەستەیی و ڕۆحیـیەکان، کارامـەیی لە بەکارهێنانی چەك و لە هونەری گفتوگۆو دیالۆگی کۆمەڵایـەتیدا پێکـەوە، بوونـی شـارەزایی لـە هونــەرەکانی شـیعر و مۆسـیقاداو گرنگـیدان بـە نیگارکێشـان و زانسـتەکان. ئـەوەی لـە بیروباوەڕی کاستیلۆنیدا ڕوون و ئاشکرایەو هۆکاری یەکلاکەرەوەیـە ڤینێکـی ئەسـتوکراتیانەیە لە هەموو جۆرە پسپۆڕیەك و چالاکیەکی تایبەتمەندی. گەوهەری شکۆو خۆپەروەردەکردن لای کاستیلۆنی لەوەدایە کە مـرۆڤ پارێزگاری لـە جێگـری و ڕاگرتـن و ڕێکخسـتنی دەرونـی خـۆی بکات لە هەموو بارێکدا، خۆ لە هەموو ڕووکەشی پیشاندانێك و زێدەڕۆییـەك بـە دوور بگـرێ، بـە دیمـەنێکی ئـازاد بـوو لـە هـەموو پاڵەپەسـتۆیەك دەرکـەوێت و بـە حاڵـەتێکی ناسروشـتی بەدەرنەکەوێت، لەنێو خەڵکیدا یاخود لـەنێو کۆمـەڵدا بێباکیـەکی دوور لـەزۆر لـە خۆکـردن و دەستکرد بگرێتە بەرو پەیڕەو بکات و ڕێزێکی ڕاستگۆیانە بنوێنێت.

لە دواجاردا بیروڕایەکی تری کاستیلۆنی باس دەکەین کە بە ڕاستی کاریگەریی هەتا ئـەمڕۆ بەجێهێشتووەو بـۆ ئـەو ڕۆژەش بـە ڕاسـتی گۆڕانکاریـەکی قوڵـی هـەژاند. ئـەویش ویسـتی کاسـتیلۆنی بـوو لـە بەرامبـەر پیـاوی خانـەداندا کـە خـۆی بـە دوور بگـرێ و لابـدا لـە هـەر ڕووکەشـێکی زەق و بریقـەدار لـە ڕێـڕەو جـلو بـەرگیدا، وای ڕاسـپاردووە کـە پیـاوان وەك ئیسـپانیەکان جلـی ڕەش بپۆشـن یـاخود هـەر بـەرگێکی تـۆخ و تـاریك. ئـەم ڕاسـپاردەیەی کاسـتیلۆنی خـۆی لـە خۆیـدا کاریگـەریی ڕاستەو خـۆی لەسـەر ڕەنـگ کـرد، ڕەنـگ لـە هـەموو شـتێکدا. کـە دواتـر کاریگەریشی لەسـەر هونـەر ڕەنگـی دایـەوەو، هونـەری لـەو ڕەنگە کـراوەو ڕاستەوخۆ و زەقانە دوور خستەوە کە لە سەدەی پانزەدا بـاوبوو. ئـەوەش یەکـەم سـەرکەوتنی هەڵوەدایی بوو بە یەك ڕەنگی، بە تایبەت ڕەش و سپی کە باڵی بەسەر زەوقی مۆدێرندا کێشا.

٥-مەبەست لە هونەری کۆن لـێرەدا ڕێبـازە شـێوەکاریەکانی میللـەتانی جێرمـانی و هونـەری وڵاتی زەویە نزمەکانە.

[٦]- Newton E, European Painting and Sculptare, Pilican Books, 1964.

[٧]- سەرئەنجامی گرنگیدانی بەم بوارە نزیکەی سەد تیۆری لەم بارەیەوە دارِشت، لە دواجاردا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئامێرێك توانای فڕینی هەبێت دەبێ لەناو خۆیدا ماشینێکی سەربەخۆ بیجوڵێنێ. دوای مردنیشی لەناو دەستنووسەکانیدا چەند وێنەیەکی پەڕەشوت و فڕۆکەی ستوونی (هیلیۆکۆپتەر) دۆزراوەتەوە، تا نزیك تەمەنی پەنجاو دوو ساڵ خەریکی ئەم بوارە بووە بە شێوەیەکی ناوبەناو.

٨-"لۆکا-سنیوریللی" ئوستادی داڤنشی بووە و لە کەم لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێدراوە، ئەم هونەرمەندە زۆر ئالودەی هونەری توێکاری بووەو بایەخی تایبەتی پێداوە تا ئاستێکی شەیدایی لە پاڵ توێژینەوەیدا بۆ دەرونی مرۆڤایەتی. وەك لێی دەگێڕنەوە ئەم هونەرمەندە وەختێ کوڕەکەی دەمرێت، دەچێتە سەر لاشەکەی بە ڕووتی و خەریکی سەیرکردن و توێژینەوەی بەشە جیاجیاکانی دەبێت زۆر بە تامەزرۆییەوە بە ڕاددەیەك مەرگەساتەکەی لەبیرچۆتەوە. هەمیشە وتویەتی: کاتێ نیگارگێشان و بەرجەستەکردن دەگاتە مەبەستی خۆی کە گوزارشت کردن لە بارە جیاجیاکانی لەش هەڵچونە دەرونیەکان بخاتەڕوو. هەربۆیە هونەر لەلای هەردوکیان بە پلەی یەکەم نیشاندەری ڕازەکانی هەست و سۆزی دەرونی مرۆڤایەتیە.

[٩]- لە قۆناغی کۆتایی ئەم تابلۆ دیواربەندەدا داڤنشی هەموو کەسایەتیەکانی دروست کرد بەڵام لە کەسایەتی مەسیح و یەهوزادا وەستاو ڕووخساریانی دروست نەکرد و کەوتە گەڕان بەناو شاردا، ساتێ پێیان وت بۆ لەم ئاستەدا وەستاوی، لە وەڵامدا وتی: توانیم کەسایەتیەکانی تر و ڕووخساریان وێنا بکەم و دروست بکەم بەڵام ڕووخساری گەورەییەکی وەك مەسیح و نەگریسیەکی وەك یەهوزا مەگەر هەر یەزدان خۆی بتوانێ دروستیان بکات، بۆیە گەڕا هەتا دوو کەسی دەست کەوت کە ڕووخساریان لە بەرامبەر ئەم دوو مەبەستەدا بێت و لەسەر ئەوان دوو دەموچاوەکەی بەرجەستە کرد.

[١٠]- هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەدەن کە چەند مانگێکی پێچووە دروست کردنەکەی، بەڵام ڕێی تێدەچێت دانانی ئەم سێ ساڵە، سەراپای کارکردن تیا بگرێتەوە لە بەرامبەر مۆدێلەکەداو لە دەرەوەی ماڵی مۆدێلەکەدا کە تیا کارەکە کراوە. ئەمە بێ لەوەی هەندێ لە سەرچاوەکان هاویەك نین لەسەر کاتی دروست کردنی ئەم تابلۆیە، هەیانە دەیخاتە پێش تابلۆی (شەڕی ئینجیارا) هەشیانە دەیخاتە ساتی ئامادەکردنی سکێچاتی ئەم تابلۆیە، واتە دوای ئەم تابلۆیە.

[١١]-هەندێ سەرچاوە دەڵێت لە بنمیچەکەیدا دروست کراوەو هەندێکی تریان ئاماژە بە دروست کردنی لە دیوارەکانیدا دەدەن.

[١٢]-هەندێ لە سەرچاوەکان مێژووی ئەم تابلۆیە دەگێڕنەوە ساڵی ١٥٠٦ یاخود نزیک ساڵی ١٥٠٠ کە ئەودەمە هونەرمەند لە فلۆرەنسا بووە. هەندێکی تر دەڵێن ئەم تابلۆیە لە فەرەنسا دروست کراوەو هەر بۆیە لە مۆزەی لۆڤەریشە. گەر وابێت هونەرمەند لە دوای ساڵی ١٥١٦وە دەچێتە فرنسا.

[١٣]-لیبیدۆ Libido ئەو وزە دەرونیەیە کە بەرپرسیارە لە چالاکی کە ووزەی ڕەمەکی سێکسی دەنوێنێت، فرۆید وا دەبینێت کە ڕەمەکە سێکسیەکان پاڵپێوەنەریان لیبیدۆیە. هەرچەندە ساڵی ١٩٢٤ گۆڕانکاری لەم بۆچونەیدا کرد.

١٤-ئەفسانەیەکی گریکیە، کوڕێك بە ناوی نارسیسۆس هێند جوان و شۆخ و شەنگە بە خۆی زۆر سەرسام دەبێت بەرادەیەك لە قەراغ ئاوێك دادەنیشێت و بەردەوام لە جوانی خۆی ڕادەمێنێت، یەزدان لە جوانیدا دەیکاتە گوڵێکی نێرگز. (ناوی نێرگز لە ناوی (نارسیسۆس)ەوە وەرگیراوە. سیفەتی (نێرگزی) بەو کەسانە دەوترێت کەزۆر بە خۆیان سەرسامن و خۆیان خۆشدەوێت.

[١٥]-لادانی سێکسی (لە ئامانجی سێکسیدا) لەگەڵ جیا ڕەگەزیشدا بەدەردەکەوێت وەك بەکارهێنانی لێدان و گازو.. هتد لە میانی پرۆسێسی سێکسیدا. ئەم خواستەش کەسەکە بەرەو کەسێکی ماسۆشی یاخود سادی دەبات.

١٦-فرۆید ئەم کار تەواو نەکردن و سستیە لە سەرەتای کارکردنی داڤنشیدا دەگێڕێتەوە بۆ (کف) کە بە مانا سایکۆلۆجیەکەی وابەستەبوون و ڕێگرتنە لە چالاکی یاخود ئەرك بە هۆی هێزێکی دەرەکی یا ناوەکی یاخود هەردوکیان، (الکف العصابي) دامرکاندنەوەی بەشیی یاخود کاملە بۆ پاڵنەری ڕەمەکی بە هۆی هێزەکانی نەستەوە، ئەمەش زۆرجار چالاکی ئاوەزی دەبەستێتەوە لەلای تاك، جا ئەو چالاکیانە هزری یاخود ویژدانی یا ویستی بن، هەرچۆن دەبێتە هۆکاری هەناسەکورتی ئەرکە جوڵەییەکان و پەکخستنی ئەرکە ناوەکیەکانی، کە لەم میانەوە پاڵنەرە ڕەمەکیەکان و وردەکاریەکانی گوزارشت لە خۆیان دەکەن.

١٧-باروخ سپینۆزا Spinoza (١٦٣٢-١٦٧٧) فەیلەسوفێکی هوڵندیەو جولەکەیە و کاریگەریەکی زۆری لەسەر بەشێکی باش لە زانایان و فەیلەسوفانی جولەکە داناوە، لای ئەوان ئەم نەبێ ئیمانەو نە ئیماندار، ئەو باوەڕی بە بوونی خودا نیە هەرچۆن باوەڕی بە نەبوونیشی نیە، بەڵکو وەها وێنای خودا دەکات کە خودی بوونە. خودا لە ئافەریدەکراوەکانی جیا نیە،

ئەمەش ڕێبازی یەكێتی بوونە (وحدە الوجود). ئەمەش هەر ئەو ڕێبازەیە كە ئەنیشتاین هەلگری بوو، بەڵكو زۆربەی فەیلەسوف و پیاوە مەزنەكانی جولەكە وابەستەی بوون.

١٨-لە وەرگێڕانە عەرەبی‌یەكەیدا بە (نسر) وەرگێڕراوە (سیسارك یا سیسارکە كەچەڵە گەورەترین باڵندە) دەگرێتەوە بەڵام وشە بنەڕەتی‌یە ئیتالیەكەی (nibbis) بە مانای (نسر)ی عەرەبی نایەت بەڵكو بە مانای (حدأة)ی عەرەبی دێت، ئەم وشەیەش بە واتای (كۆڵلارە یا سورە داڵ یاخود مشك گرە)ی كوردی دێت هۆكاری سەرەكی ئەم لێگۆڕانە (كە ڕەنگە هەمان هۆ بێت كاریگەریی لە وەرگێڕانە عەرەبیەكەش كردبێت) وەرگێڕانیەتی بۆ زمانی ئەڵمانی بە (نسر).

لەلایەن ماری هیرزفیلد، هەرچۆن میریكوفسكی لە كتێبە ڕۆمانە مێژوییەكەیدا هەروای نووسیوە.

Merejk wski: the Romance of Leonardo da Vinci

كە دەربارەی لیۆناردۆیەو بە ڕووسی نووسراوە، وەختێكیش خراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی لەلایەن (جلبردت جرنای)یەوە وشەكە هەروا وەرگێڕدراوەو بەكارهاتووە.

١٩-لەو نووسەرە دیارو ناسراوانە (سترابۆو بلوتارك (٤٦-١٢٥) كە مێژونووسێكی گریكی‌یە، ئامنیانۆس و مارسیلوس). بەڵام نووسەرانی تر ناوەكانیان نەناسراوەو بنەچەو سەردەمیان جێی گومانە وەكو نووسراوەكانی هۆرابوللو نایلوس ی هێرۆگلیفی و كتێبی حیكمەتی كەهنوتی ڕۆژهەڵاتیی كۆن. ناوی خواوەندێكی لەخۆگرتووە Hermes Trismegistus بەناوی هیرمس. كە ناوێكی گریكی‌یە بۆ خواوەندی حیكمەتی میسری (توت). نووسراوە هیرمسیەكان دەخرێتە پاڵ ئەو و كاهنەكانی، كە كاریگەریەكی گەورەی لە ئامانجی ئەفلاتونیزمی نوێ و پەرەسەندنی دوادوایی مەسیحیەت دا كرد.

٢٠-گرێی خەساندن: چەند پەرچەكردارێكە كە منالْ پێوەی ئەتلێتەوە بەرامبەر هەڕەشەی خەساندن. فرۆید دەڵێ منالْ ئەم هەستەی بەرەنجامی هەڕەشەی دەرەكی بۆ دێت، بەڵام دواتر منالْ وێنای ئەم هەڕەشەیە هەر دەكات گەر لە واقعیشدا نەبێت، پاشتر دەڵێت: تەنها بینینی كچ بەبێ ئەندامی نێرینە وا دەكات بترسێت لە لەدەست دانی ئەندامی خۆی. لەمەوە منالْ واز لە ئارەزووە ئۆدیبیە ئەرێتی‌یەكانی دێنێت و لە دەرونیا گرێی ئۆدیبی نەرێتی پەرە پێ دەدات.

٢١-پەیكەرە قەوارە (اصلی)كە لەو گۆڕەپانەوە گوێزرایەوە بۆ مۆزەخانەی دەوڵەت لە ساڵی ١٨٧٣داو كۆپیەك خرایە جێگەی.

٢٢-مایکل ئەنجیلۆ ئەم تابلۆیەی لەسەر داوای (ئابجلو دوبی) دروست کرد. ساتەوەختی ئاهەنگ گێڕانی لەگەڵ خاتوو (مادلینا ستروزی).

٢٣-لە هەندێ سەرچاوەدا بە (خەونی سوارێك) ناوی هاتووەو ئاماژە بەوە دەدەن کە رافائیل لە ساتەوەختی قوتابی بوونیدا لای (بیروجینۆ) دروستی کردبێت.

٢٤-ڤیرۆنێزەش هەمان حاڵەت وەك تنتۆریتۆ سەرچاوەکان ناکۆکن لە پۆلاندنیدا لە نێوان قوتابخانەی نیگارکێشانی ڤینیسی سەر بە ڕێنیسانس و شێوازی پەیڕەوگەرایی (مانێریزم). بەڵام ئەم لێکدانەوەیە بە هەرچی زیاتر لۆژیکی دێتە پێش چاو.

٢٥-بەناوی شارۆچکەکەیەوە ناونراوە کە (برۆگل)ی ناوبووە. دوو کوڕی هەبووە پیتر و جان بە یەکەمیان وتراوە برۆگلی بچووك و بە دووەم گەورە هەردووکیان نیگارکێش بوون دوای باوکیان.

# هونەری ڕۆمانسك (١٠٠٠-١٥٠٠ز)



دیمەنێکی کڵێسای سان سرنان– شاری تۆلۆز، فەڕەنسا St. Sernin



دیمەنێکی کڵێسای سان ئەمبرجیۆ، شاری میلانۆ، ئیتالیا Sr. Ambrogio



دیمەنێکی کاتیدرالی پیزاو بورجە لارەکەی، پیزا، ئیتاليا Pisa Cathedral



کاتیدرالی سیفالۆ Cefalu



پەیکەرێك لەسەر دیواری کڵێسای سویلاك، ئەشعە یا پەیامبەر Swilac

# هونەری غوتی ١٤٠٠-١٥٠٠



دیمەنێکی کۆشکی سەرۆکایەتی، ئیتالیا Palazzo Vechio



کاتیدراڵی ریمز، فەڕەنسا Reims



کاتیدراڵی فلۆڕەنسا، ئیتالیا Florence Cathedral



جیوفانی چیمابۆی G. Cimabue

## هونەری سەرەتای ڕێنیسانس (کوانترۆشینتۆ)
## سەدەی پانزەهەم ١٤٠٠-١٥٠٠



ئەندریا ئۆرکانیا Andreadi Orcana




دۆمنیکۆ ڤینیسیانۆ Domenico Veneziano




جینتلی دی فابریانۆ Gentile de fabriano



دیمەنێکی کڵێسای پازی Pazzi chapel



Pinturicchio پنتۆریجیۆ



Robert رۆبرت کامپن



جان ڤان ئایك JanVan Eyck



ڕۆجەر ڤان دیروایدن R. Van Derwayden

